زنجیرەکتێبی والینامە

(2)

# عەرەبینامەی والی

**زیاتر لەهەزارو 110 بەیتەشیعر بۆ فێربونی عەرەبی بە ئاسانترین شێواز**

**لەگەڵ 2660 پەراوێزی رونکردنەوەو رستە بە عەرەبی و کوردی**

**سەدان تەفسیری خەو، فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ)، قسەی زلی ناوداران، کورتەزانیاریی سەیروسەمەرەو سەرنجڕاکێشی جۆراوجۆر، بەهەردوو زمانەکە لەپاڵ یەکدا، قوڕی فێربونەکەی ئەوەندەی تر خەستکردووەتەوە!**

**چاپی PDFی 115هەم**

**والی عەلی**

**بۆ کڕینی تازەترین چاپی PDFی ئەم کتێبە، نامەبنێرە بۆ ڤایبەرو وەتسئەپی نوسەر: 07701393984**

ئەم چاپی 115هەمە فرییەو لەبەر خودای گەورەو

لەپێناو سودمەندبونی تۆی بەڕێز بڵاوکراوەتەوە، بۆیە

**تکایە لەدوعای خێر بێبەشم مەکەن**

**والی عەلی**

# پێشەکی

مادام چاوی شەریفت خستووەتە سەر ئەم کتێبەو دەیخوێنیتەوە، کەواتە رەنگە عاشقێکی زمانی عەرەبی یان لانیکەم فێرخوازێکی ئەو زمانە بەناوبانگە بیت. عەرەبی لەم سەردەمەی ئەمڕۆماندا تەقریبەن وەك ئاوو کارەباو عەنتەرنێتی لێهاتووەو زۆر پێویستە بەتایبەت بۆ کەسانی رۆشنبیرو خوێندەوار بەگشتی. بەڵام سەرباری ئەو زەرورەتە هێشتا ژمارەیەکی زۆر کەس هەن کە ئەم زمانە نازانن، ئەمەش بە بۆچونی بەندەی موخڵیست، کەموکورتییەکی زەبەلاحە لەو کەسەدا لەڕووی زانیارییەوەو پێویستە هەرچی زووە ئەو کەموکورتییە پڕبکرێتەوە، ئەگەرنا لەکاروانی پێشکەوتن دوادەکەوێت و ناشبێت بە کارزان!. نوسینی ئەم کتێبە، ناسکەهەوڵێکی بەندەیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکورتییەی خەڵك.

وشەسازی یان وشەکاری، بە دڵ و بڕبڕەی پشت، کورە تەنانەت بە جگەرو گون و گورچیلەی جەستەی فێربونی هەر زمانێك لەناویشیاندا عەرەبی دادەنرێت، لەبەرئەوە، بەندە لەم کتێبەدا، زیاتر چاوم خستووەتە سەر ئەو بەشەی جەستەی زمانی عەرەبی واتە زیاتر تەرکیزم لەسەر ئەو بەشە کردووەتەوە.

مەعلومە لای جەنابت کە شیعر بەبەراورد بە هەر جۆرێکی تری بەشەکانی ئەدەب، ئاسانترو خێراتر لەبەردەکرێت و دەچەقێتە مێشکەوە، هەر بۆیە لەم کتێبە فێرکارییەدا پەنام بردە بەر ئەو جۆرە.

ئەم کتێبە پێکهاتووە لەزیاتر لە **1110** بەیتەشیعری سەربەخۆ، واتە هەر بەیتەو سەربەخۆیەو جیایە لەبەیتەکەی پێش و پاش خۆی. هەر بەیتەشیعرێك وشەیەك تا شەش وشەی عەرەبی و ماناکانیان بەکوردی لەخۆدەگرێت. بە واتایەکی تر، خوێنەری جددی کتێبەکە، لەڕێگەی تەنها یەك بەیتەشیعری ئەم کتێبەوە، بە ئاسانترین شێوەو کورتترین رێگا، مانای وشەیەك تا شەش وشە، فێردەبێت. بەگشتی وشەکانی ناو هەر بەیتەشیعرێك یان هەر نیوەبەیتێك، پەیوەندییەکی مانایی یان پێکهاتەیی یان دەنگی، پێکەوەیان دەبەستێتەوە بەشێوەیەك کە بەئاسانی لەیادگا واتە زاکیرەدا دەچەسپێت. لەڕووی کێش و سەرواشەوە، هەوڵمداوە ئەوەندەی بتوانم کێشیان یەکسان بێت و سەرواشیان چونیەك بێت. لەپێناو پاراستنی کێشی شیعرەکانیش هەندێك جار ناچاربوم هەندێك وشە لەبری هەندێکی تر بەکاربهێنم بەبێ ئەوەی ماناکەی ون ببێت، ئەمەش لەهۆنراوەدا حاڵەتێکی ئاساییەو پێی دەوترێت زەروراتی شیعر. بۆ نمونە رەنگە ببینیت کە هەندێجار لەبری "هەروەها" نوسیبێتم "هەروەك" یان "هەروا".

وێرای بەیتەشیعرەکان، **2660** ناسکەپەراوێز، قوڕی فێربونەکەی ئەوەندەی تر خەستکردووەتەوە. لەپەراوێزدا رستە بۆ سەرجەم وشەکان هێنراوەتەوە بە هەردوو زمانەکە، سەرباری ئەوەش چەندین رونکردنەوەی

تری زمانەوانیی پێویست خراونەتە خزمەت فەخامەتی جەنابت، لەوانە کۆی زۆربەی ناوەکان و گەردانکردن (تصریف)ی کارەکان و هتد...

رستەو نمونەکانیش سەدان تەفسیری خەوو کورتەزانیاریی سەرنجڕاکێشی جۆراوجۆرو قسەی زلی ناوداران و هتد... بە هەردوو زمانەکە لەپاڵ یەکدا، لەخۆدەگرێت بۆ ئەوەی پیاو، هەروەها ژنیش! وێڕای فێربونی زمانەکە لەو رووانەشەوە هەمانەی مەعریفەوانی پڕبکات و هەتا هێزی تیایە گەورەپاڵێك بنێت بەخۆیەوە، (تەبعەن بۆ پێشەوە!).

جارجارەش رەنگە بینیت لەبەیتەشیعرێکدا نوسیبێتم "تاك نا کۆ"، لەو حاڵەتەدا مەخسەوی شەریفم ئەوەیە کە ئەو وشەیە تاك نیە، بەڵکو کۆیە.

جاری واش هەیە وشەیەك لەبەیتەشیعرێکدا دەبینێت مانایەك نوسراوە، دواتر دەبینیت لەبەیتەشیعرێکی تردا فڵق هەمان وشە قوتبۆتەوە کەچی مانایەکی تری لەگەڵدایە. لەو حاڵەتەدا نەچی بچی وابزانی ئەوە هەڵەیە!. ئەوە هەڵە نیە، بەڵکو ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو وشەیە چەند مانایەکی جیاوازی هەیە بەڵام لەتەنها بەیتێکدا هەموو ماناکانی جێگای نابێتەوەو نەنوسراوە.

بۆ دڵنیابونی زیاتر لەمانای هەر وشەیەکیش، پشتم بە زیاتر لەیەك کەڵەسەرچاوە بەستووەو لەکۆتایی کتێبەکەشدا ناوی گرنگترین ئەو سەرچاوانەم نوسیوە کە پشتم پێبەستون. بەڵام سەرباری ئەوەش هیچ کەسێك و هیچ کارێکیش بێ هەڵەو کەموکورتی نیە، بۆیە خوا بەو رۆژێ نەکاو گوێی شەیتان کەڕ بێ و چاویشی کوێر بێ و هەر چوار پەلیشی بشکێ، ئەگەر هەڵەیەکی نائەنقەستت بینی، نەچی بچی بیکەی بە هۆسە، چونکە ئەوە هەر لەئێستاوە داوای لێبوردن دەکەم. هەمیشەش دەرگای گەراجیی رەخنەلێگرتنم کراوەیە بۆ هەموو رەخنەگرێکی بەڕێزو دروستکەرو پێشموایە رەخنە نەك هەر لێدان نیە لەڕەخنەلێگیراو بەڵکو پێشکەشکردنی یارمەتیدانێکی ناوازەیە پێی.

ماوەتەوە بێژم، هیوادارم ئەم کتێبە جێگای رەزامەندیی خودا، پاشان زۆربەی خوێنەران بێت. ئەڵێم زۆربە نەك هەموو، چونکە بێگومان رەزامەندیی هەموان، ئاواتێکە هەرگیز نایەتە دی.

والی عەلی

2025/03/04

ڤایبەرو وەتسئەپ

07701393984

# کورتکراوه بەکارهاتووەکان

| کورتکراوه | ماناکەی | ماناکەی بەکوردی |
| --- | --- | --- |
| ج | جمع | کۆ |
| ما | مثنى | جوت، دوان |
| مؤ | مؤنث | مێ |
| مك | مذكر | نێر |

- **الآنَ**

**بەمانای ئێستا دێت. ئاوەڵفەرمانە بۆ کاتی ئێستا. مەبنییە لەسەر فەتح و دەبێت هەمیشە ئەلف و لامەکەی پێوە بێت.**

**الآنَ قَدِ اكْتَمَلَ أربع الضيوف**

**ئێستا ژمارەی میوانەکان تەواو بوو.**

- **جەمعی تەکسیر (جمع التكسير)**

**جەمعی تەکسیر دەکرێت بە شێوازی نێر یان مێ بەکاربهێنێت و هیچیان هەڵە نین.**

**بۆ نمونە (قال العرب) و (قالت العرب) هەردوکیان راستن. (عرب) جەمعی تەکسیری (عربيّ).**

- **ناهيك**

**(ناهيك) بەمانای (بەستە) دێت. ناوێکە هەمیشە بەدوایدا یەکێك لەم دوو حەرفی جەرە دێت: (بـ) و (من).**

**ناهيك بألفية ابن مالك في النحو.**

**هەزارەی ئیبن مالیکت بەسە لەڕێزماندا.**

1. (رِئة) واته سی، (كَبَد) جگەرە[1]

(نافِذة)و (شُبّاك) هەردوو پەنجەرە[2]

2. (بُرْتُقال) چیە، وەك خۆی پرتەقاڵ[3]

(رَجُل) واته پیاو، جەمعەكەی (رِجال)[4]

3. (بَطيء) واته خاو، (سَريع) خێرایە[5]

(عِلم) زانستە، (عَلَم) ئاڵایە[6]

---

[1] إلتهاب الرئة مشكلة صحية كبيرة.

هەوكردنی سی، كێشەیەكی تەندروستیی گەورەیە.

زرعُ الكبد عملية صعبة.

چاندنی جگەر پرۆسەیەكی سەختە.

[2] رجاءً إغلَق النافذة.

تكایە پەنجەرەكە دابخە.

شبّاك غرفتكم كبير جداً.

پەنجەرەی ژورەكەتان زۆر گەورەیە.

[3] البرتقال فاكهة غنية بالفيتامينات.

پرتەقاڵ میوەیەكی دەوڵەمەندە بە ڤیتامین.

[4] هي تزوجت برجل غير معروف.

شویكرد بە پیاوێكی نەناسراو.

أطفال اليوم رجال المستقبل.

منداڵانی ئەمڕۆ پیاوانی داهاتون.

الرجل يصرف كل راتبه على زوجته ولا تقول في حقه كلمة طيبة في حين يأتي أخوها ومعه ربع كيلوغرام من الحلويات، فتقول الزوجة: ﷲ يبقي لي أخي الذي لا يسمح بأن أكون محتاجة لأي أحد!

پیاو هەموو موچەكەی لەژنەكەیدا سەرفدەكات كە چی ژنەكەی هیچ قسەیەكی باشی لەسەر ناكات، بەڵام كاتێك براكەی بە روبعەكیلۆیەك شیرینییەوە دێت بۆماڵیان دەڵێت: خوا براكەم بۆ بهێڵێت كە نایەڵێت موحتاجی دەستی كەس بم!

[5] الكسلان حيوان بطيء.

تەمەڵ گیاندارێكی خاوە.

الازدياد السريع في الإصابة بوباء كورونا يهدد البشرية.

زیادبونی خێرا لەتوشبون بە پەتای كۆرۆنا هەڕەشە لەمرۆڤایەتی دەكات.

[6] السياقة عِلم و فن.

4. (تَحْت) لەژێرو (على) لەسەرە[7]

(فنَّان) هونەرمەند، (فَنّ)یش هونەرە[8]

5. (شِفاء) چیە؟ چاکبونەوە[9]

(ضَعِيف) لاوازە، (سَمين) قەڵەوە[10]

6. (مُدير) چیە؟ بەڕێوەبەر[11]

(رَسُول) پەیامبەر، (نَبيّ) پێغەمبەر[12]

---

شۆفێری زانست و هونەرە.

عَلَمُ أغلبِ الدول يحتوي على اللون الأحمر.

ئاڵای زۆربەی وڵاتان رەنگی سوری تێدایە.

[7]الجنة تحت أقدام الامهات.

بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە.

الطائر يغّرد على الشجرة.

باڵندەکە لەسەر درەختەکە دەجریوێنێت.

[8]ناظم الغزالي فنان عظيم.

نازم غەزالی هونەرمەندێکی مەزنە.

السياقة فن و ذوق و أخلاق.

لێخوڕین هونەرو چێژو رەوشتە.

[9]الشفاء من المرض بيد الله ولكنّ زيارة الطبيب ضرورية أيضاً.

چاکبونەوە لەنەخۆشی بە دەستی خوایە، بەڵام سەردانی پزیشکیش پێویستە.

[10]المدير ضعيف جداً.

بەڕێوەبەرەکە زۆر لاوازە.

انت سمين، لم لا تقلل من الطعام.

تۆ قەڵەویت، بۆ خواردن کەمناکەیتەوە.

[11]المسؤول الأول في المدرسة، مديرها.

بەرپرسی یەکەمی قوتابخانە، بەڕێوەبەرەکەیەتی.

[12] محمد رسول الله.

محەمەد پەیامبەری خوایە.

الرسول أكبر من النبي.

پەیامبەر لەپێغەمبەر گەورەترە.

7. (طائِر) باڵنده، (بِطْريق) پەنگوینە[13]

(نَحْلة) واتە هەنگ، (عَسَل) هەنگوینە[14]

8. (مُعوَّق) چیە؟ واتە کەمئەندام[15]

(رِسالة) نامە، هەروەها پەیام[16]

9. (طيَّارة) چیە؟ واتە فڕۆکە[17]

(رِواية) ڕۆمان، (قِصَّة) چیرۆکە[18]

---

13طارَ الطائرُ.

باڵندکە فڕی.

البطريق طائر ذكي.

پەنگوین باڵندەیەکی زیرەکە.

14أَن النبي، ﷺ، نهَى عن قَتْل النَّحْلة والنَّمْلة.

پێغەمبەر، درودی خوای لەسەر بێت، کوشتنی هەنگ و مێرولەی قەدەغەکردووە.

العسل طعام مفيد للصحة.

هەنگوین خواردنێکی بەسودە بۆ تەندروستی.

15کەمئەندام= خاوەن پێداویستی تایبەت.

إنه رجل معوّق، يجب علينا مساعدتُه.

پیاوێکی خاوەن پێداویستی تایبەتە. پێویستە لەسەرمان یارمەتی بدەین.

16هل قرأت رسالتي؟

نامەکەمت خوێندەوە؟

كل مسلم يجب أن ينفّذ ما جاء في رسالة الرسول.

پێویستە هەموو موسڵمانێك ئەوە جێبەجێ بکات کە لەپەیامەکەی پێغەمبەردا هاتووە.

17 قواتنا أسقطت طيَّارة العدو.

هێزەکانمان فڕۆکەکەی دوژمنیان خستەخوارەوە.

18 كتبَ نجيب محفوظ عدة رويات رائعة.

نەجیب مەحفوز چەند ڕۆمانێکی نایابی نوسیوە.

من هو مؤلف رواية "البؤساء"؟ فيكتور هوغو

نوسەری ڕۆمانی بێنەوایان کێیە؟

قصة حياتي تُدمع العيون.

چیرۆکی ژیانم فرمێسك لەچاو دەهێنێت.

10. (مَدْرسَة) چیە؟ قوتابخانەیە[19]

(مَكْتَبَة)ش مانای کتێبخانەیە[20]

11. (ضَمير) جێناوە، هەروەها ویژدان[21]

(عاصِمة) پایتەخت، (وَطَن) نیشتمان[22]

12. (بَقيَ) مایەوە، (بَقاء) مانەوە[23]

(تَمييز) بەمانای تێهەڵچونەوە[24]

13. (أُسْرة)و (عائِلَة) هەردوو خێزانە[25]

---

[19]ترکُ المدرسة خطأ كبير.

وازهێنان لەقوتابخانە هەڵەیەکی گەورەیە.

[20]مكتبتك تحتوي على كتب قيّمة.

کتێبخانەکەت کتێبگەلی بەنرخی تێدایە.

[21]جێناو= راناو.

في الجملة (أنت رجل شجاع)، كلمة (أنت) ضمير.

لەڕستەی (تۆ پیاوێکی ئازایت)، وشەی (تۆ) جێناوە.

المجرمون ليس لديهم ضمير.

تاوانباران ویژدانیان نیە.

[22]عاصمة العراق بغداد.

پایتەختی عیراق بەغدایە.

ندافع عن وطننا.

بەرگری لەنیشتمانەکەمان دەکەین.

23سَافَرَ الأَبْنَاءُ وَبَقِيَ الأَبُ في المنزل وحيداً.

کوڕەکان گەشتیانکردو باوکەکە بە تەنها لەماڵەوە مایەوە.

بقاءنا اليوم في المنزل خير من خروجنا في الوضع الحالي.

لەم دۆخەی ئێستادا مانەوەمان لەماڵ باشترە لەدەرچونمان.

[24]محكمة التمييز ألغى القرار.

دادگای تێهەڵچونەوە، بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە.

[25]تتكون أسرتي من أربعة أشخاص.

خێزانەکەم لەچوار کەس پێکدێت.

هو ينتمي الى عائلة مثقفة.

(عِيدُ الأضحى)یە جەژنی قوربانە[26]

**14.** (مُساعَدة) چیە؟ یارمەتیدانە[27]

(زِيارة) سەردانە، (ضَيف) میوانە[28]

**15.** (خَبَر) هەواڵە، کۆکەی (أَخبار)ە[29]

(غَنيّ) دەوڵەمەند[30]، (فَقير) هەژارە[31]

**16.** (تَرحيب) چیە؟ بەخێرهێنان[32]

---

ئەو سەربە خێزانێکی رۆشنبیرە.

[26] عِيد الأضحى مناسبة مباركة لمساعدة الفقراء.

جەژنی قوربان بۆنەیەی پیرۆزە بۆ یارمەتیدانی هەژاران.

[27]مساعدة الفقراء عمل ديني و إنساني.

یارمەتیدانی هەژاران کارێکی ئاینی و مرۆییە.

[28]الشفاء من المرض بيد الله ولكنّ زيارة الطبيب ضرورية أيضاً.

چاکبونەوە لەنەخۆشی بە دەستی خوایە، بەڵام سەردانی پزیشکیش پێویستە.

الضيف هدية من الله.

میوان دیارییەکە لەلایەن خوداوە.

في عام 2022، تزوج رجل هندي من نفسه في حفل زفاف كبير. كان الرجل، الذي يدعى "أناند شاكيلا"، قد قرر الزواج من نفسه بعد أن فشل في العثور على شريكة حياة. حضر حفل الزفاف أكثر من 200 ضيف، وارتدى الرجل فستان زفاف أبيض وطرحة.

لەساڵی 2022 پیاوێکی هندی هاوسەرگیری لەگەڵ خۆی کردو بۆ ئەو مەبەستە زەماوەندیکی گەورەی سازکرد. هاوسەرگیریی ئەم برادەرە کە ناوی ئەناند شاکیلا بوو لەگەڵ خۆیدا پاش ئەوە هات کە پێشتر شکستی هێنابوو لەدۆزینەوەی هاوژینێکدا. لەمیانەی زەماوەندەکەدا کە زیاتر لە 200 میوان ئامادەیبون، پیاوەکە عەزییەکی سپی لەبەرکردبوو و تارایەکیشی پۆشیبوو.

[29](خبر) تاکە، جەمعەکەی (أخبار)ە.

أثناء قراءته للخبر المحزن، بكى المذيع.

لەکاتی خوێندنەوەی هەواڵە خەفەهێنەکەدا، بێژەرەکە گریا.

[30] لست غنيا إلا إذا كنت تملك شيئا لا يمكن شرائه بالمال ..غارث بروكس.

تا نەبیتە خاوەنی شتێك كە بە پارە نەكڕدرێت، دەوڵەمەند نیت.

[31] الرجل الفقير بدأ يتسول.

پیاوە هەژارەکە دەستیکرد بە سواڵکردن.

[32] لم يكن الرئيس موجوداً أثناء ترحيب الوفد.

لەکاتی بەخێرهێنانی وەفدەکە، سەرۆك ئامادەنەبوو.

(لعِبَ) ياريكرد[33]، (لاعِب) ياريزان[34]

**.17** (انْقِلاب) چيه؟ واته كودەتا[35]

(مَخْزَن)، (مُستَودَع) هەردوكيان كۆگا[36]

**.18** (هِجْرة) واته كۆچ، (لاجئ) پەنابەر[37]

(رَئيسُ التَّحرير) ماناى سەرنوسەر[38]

**.19** (مَسْئُول) بەرپرسه، (حارِس) پاسەوان[39]

(رَبيع) بەهاره، (شِتّاء)يش زستان[40]

---

[33] لعب الأطفال في الحديقة.

منالّەكان لەباخچەكه يارييانكرد.

[34] هو لاعب من الدرجة الأولي.

ئەو ياريزانێكى پلە يەكە.

[35]انقلابٌ عَسْكَرِيٌّ أزال بنظام السودان.

كودەتايەكى سەربازى رژێمى سودانى لابرد.

[36]مخزن الادوية خال تماماً.

كۆگاى دەرمانەكان تەواو چۆڵە.

أعتقد أن مستودعنا مليء بالأشياء الضرورية.

پێموايه كۆگاكەمان پره لەشتى پێويسته.

[37] هجرة سكان آسيا الى أوروبا مستمرة.

كۆچى دانيشتوانى ئاسيا بۆ ئەوروپا بەردەوامه.

هو لاجىء سياسى فى المانيا.

ئەو پەنابەرێكى سياسييه لەئەڵمانيا.

[38] بخصوص مقالتك لابد أن أتحدث مع رئيس التحرير.

سەبارەت به وتارەكەت، پێويسته قسه لەگەڵ سەرنوسەردا بكەم.

[39]هو مَسْئُولٌ رفيع في الحكومة.

ئەو بەرپرسێكى باڵاى ميرييه.

إعط الرسالة لحارسي.

نامەكه بده به پاسەوانەكەم.

[40]الربيع موسم جميل.

بەهار وەرزێكى جوانه.

20. (جَبَان) ترسنۆك، (شُجاع) ئازايه[41]

(أَمير) شازاده، (مَلِك) پاشايه[42]

21. (عاطِفيّ) سۆزدارى، (عاطِفة) سۆزه[43]

( أَنيق) شيكپۆشه، (وَسيم)يش قۆزه[44]

22. (بُشرَى) مژدەيه، واته مزگێنى[45]

(عادَة سِرّية) خووەنهێنى[46]

---

الشتاء بارد.

زستان سارده.

[41]هو رجل جبان.

ئەو پياوێكى ترسنۆكه.

الرجل الشجاع لا يمدح نفسه.

پياوى ئازا وەسفى خۆى ناكات.

[42]إنه أمير متواضع.

ئەو شازادەيەكى خاكييه.

ملك السعودية كاهل و لايستطيع إدارة البلاد.

پادشاى سعوديه زۆر پيرەو ناتوانێت وڵات بەڕێوەببات.

[43]بينهما علاقة عاطفية.

پەيوەندييەكى سۆزدارى لەنێوانياندا هەيه.

ليست لها أية عاطفة لطفلها.

هيچ سۆزێكى بۆ منداڵەكەى نيه.

44 شابٌ أنيق طلب يدها للزواج.

گەنجێكى شيكپۆش داواى هاوسەرگيرى لێكرد.

هو رجل وسيم ولكنه غير ذكي.

ئەو پياوێكى قۆزە بەڵام زيرەك نيه.

[45]أتيت ببشرى سارة لك.

مژدەيەكى خۆشم بۆ هێناويت.

[46]خووەنهێنى= دەسپەڕ.

العادة السرية لها أضرار كثيرة.

خووەنهێنى زيانى زۆرى هەيه.

23. (جُنديّ) سەربازە، (ضابِط)یش ئەفسەر[47]

(مَرَض) نەخۆشی[48]، (عِلاج) چارەسەر[49]

24. (مَعرِفة) چیە؟ واتە زانیاری[50]

(واعٍ) هۆشیارە، (وَعْي) هۆشیاری[51]

25. (خَریف) پایزە، (صَیف) واتە هاوین[52]

(اِنتِفاضة)یە مانای ڕاپەڕین[53]

26. (سِجن) زیندانە، (أَسیر)یش دیلە[54]

---

[47]الجندي الشجاع لا يخاف من الموت.

سەربازی ئازا لەمردن ناترسێت.

أُتهم الضابط بمحاولة إغتيال الرئيس.

ئەفسەرەکە بە هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی سەرۆك تۆمەتبارکرا.

[48] مرض السلّ قاتل.

نەخۆشیی سیل کوشندەیە.

الغباء هو المرض الوحيد الذي لا يُتعب المريض بل يُتعب المحيطين به.

گێلی تەنها نەخۆشییە کە نەخوشەکە ماندوناکات، بەڵکو دەوروبەرەکەی ماندودەکات.

[49] الغباء ليس له أيّ علاج.

گێلی هیچ چارەسەرێکی نیە.

[50] هو طالب مليء بالمعرفة.

ئەو خوێندکارێکی پڕ لەزانیارییە.

[51]إنه رجل واعٍ.

ئەو پیاوێکی هۆشیارە.

ليس لدي وعي حول ذلك المرض.

هۆشیاریم سەبارەت بەو نەخۆشییە نیە.

[52]لا أحب موسم الخريف.

حەزم لەوەرزی پایز نیە.

كان الصيف الماضي حاراً جداً.

هاوینی ڕابردوو زۆر گەرم بوو.

[53]اِنتِفاضة كردستان لم تغيّر خارطة العراق.

ڕاپەڕینی کوردستان نەخشەی عیراقی نەگۆڕی.

(فَتَحَ) كردەوە، (مِفتاح) كلیلە[55]

**.27** (إلغاء) چیە؟ هەڵوەشاندنەوە[56]

(تفَشّي) مانای بڵاوبونەوە[57]

**.28** (رَقْم) ژمارە، (مَرّة) مانای جار[58]

(رِیاضَة) وەرزشە، (ریاضيّ) وەرزشكار[59]

---

[54]إستطاع المجرم أن يهرب من السجن.

تاوانبارەكە توانی لە زیندان رابكات.

عذّب الأَسير بشكل وحشي.

دیلەكە بەشێوەیەكی دڕندانە ئەشكەنجەدرا.

[55] الضيف فتح الباب بنفسه و دخل البيت.

میوانەكە خۆی دەرگاكەی كردەوەو چووە ناو ماڵەكەوە.

المعاناة مفتاح الإبداع.

نەهامەتی كلیلی داهێنانە.

من رأى في المنام أَن بِيَدِهِ مِفْتَاح الْجنَّة فَإِنَّهُ يتوفى على التَّوْحِيد.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی كلیلی بەهەشتی پێیە، ئەوە لەسەر ئاینی یەكتاپەرستی دەمرێت. واتە بەهەشتەكەی مسۆگەرە.

[56]إلغاء قرار حظر التجوال يهدد سلامة المواطنين.

هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری قەدەغەكردنی هاتوچۆ هەڕەشە لەسەلامەتی هاوڵاتیان دەكات.

[57]هل تخاف من تفَشّي الوباء في مدينتك؟

ئایا لەبڵاوبونەوەی پەتاكە لەشارەكەت، دەترسیت؟

58 هل تعرف رقم سيارتك؟

ژمارەی ئۆتۆمبێلەكەت دەزانیت؟

كن في حياتك مثل الرقم واحد في جدول الضرب. مهما قابل أرقام كبيرة أو صغيرة لايعطي أحداً أكثر من حجمه.

لەژیانتدا وەك ژمارە یەك وابە لەخشتەی لێكداندا، بەر هەر ژمارەیەكی بچوك یان گەورە بكەوێت، بەهای زیاتر لەخۆی نادات بە هیچ یەكێكیان.

زرت كركوك مَرّة واحدة فقط.

تەنها یەكجار سەردانی كەركوكم كردووە.

59 كرة القدم رياضة شهيرة في العالم.

تۆپی پێ وەرزشێكی بەناوبانگە لەجیهاندا.

رونالدو رياضيّ عظيم ولكنه متكبّر.

ڕۆناڵدۆ وەرزشكارێكی مەزنە، بەڵام بەڕاستی لوتبەرزە.

**.29** (سِنّ) لەگەڵ (عُمْر) هەردوكيان تەمەن[60]

(شَهِدَ) بينى، (مَشهَد)يش ديمەن[61]

**.30** (مُسَدَّس) چيە؟ واتە دەمانچە[62]

(مَنْطِق) لۆژيكە[63]، (مَنطِقة) ناوچە[64]

**.31** (مُشرِّع) چيە؟ ياسادانەرە[65]

(جَذْر) واتە رەگ[66]، (جَزَر) گێزەرە[67]

---

60 لەم مانايەدا ئەم دوو وشەيە مواردیفن.

سِنّ البلوغ مرحلة حساسة في حياة الانسان.

تەمەنى باڵقبون، قۆناغێكى هەستيارە لەژيانى مرۆڤدا.

تاب المذنب في آخر عمره.

گوناهكارەكە لەكۆتايى تەمەنيدا پەشيمان بووەوە.

كم كان عمر الملكة فيكتوريا حين توفيت؟

شاژنە ڤيكتۆريا كاتێك عومرى درێژى بۆ تۆ جێهێشت، تەمەنى چەند ساڵ بوو؟ 81

61الولد شَهِدَ حادثة مقتل أبيه.

كورەكە روداوى كوشتنى باوكى بينى.

مشهد الفلم الأخير يدمع العين.

ديمەنى كۆتايى فيلمەكە فرمێسك دەخاتە چاو.

62 قتله بمسدس كاتم.

بە دەمانچەيەكى بێدەنگ كوشتى.

63 لەڕاستيدا وشەى لۆژيك كوردى نيە بەڵكو كوردێنراوەو لەوشەى logicى ئينگليزييەوە وەرگيراوە كە لاى برادەرانى ئينگليز بە (لۆجيك) دەخوێنرێتەوە.

علم المنطق مهم للغاية.

زانستى لۆژيك زۆر گرنگە.

64 ج: مَناطِقُ

دمّرت الحرب منطقة الشرق الأوسط.

جەنگەكە ناوچەى رۆژهەڵاتى ناوەڕاستى لەناوبرد.

65 على المُشرِّعين وضع قانون خاص بالوضع الحالي.

پێويستە لەسەر ياسادانەران ياسايەكى تايبەت بە رەوشى ئێستا دابنێن.

66(جِذْر)يشى پێدەووترێت. ج: جُذور.

.32 (مُهندِس) چيه؟ واته ئەندازيار[68]

(داعِيَة) بانگخواز، هەروەها هۆكار[69]

.33 (زِيجة) وەك (زَواج) هاوسەرگيرييه[70]

(شَيْخ) پير، (شَيْخُوخَة) ماناى پيرييه[71]

---

اقتلع جَذْر الشجرة.

رەگى درەختەكەى هەڵكێشا.

[67]الجزر يسهّل الهضم.

گێزەر هەرسكردن ئاساندەكات.

[68] خطيبها مهندس ماهر.

دەزگيرانەكەى ئەندازيارێكى لێهاتووە.

[69]الجمع : دُعاة و دواعٍ.

عمرو خالد داعية إسلامي شهير.

عەمرو خالد بانگخوازێكى ئيسلاميى بەناوبانگە.

داعية غضب أبي غير واضحة.

هۆكارى تورەيى باوكم رون نيه.

[70]واته ئەم دوو وشەيە موراديفن و هەردوكيان بەماناى هاوسەرگيرى دێن.

أعتقد بأن زيجتها الأولى فشلت بسبب التمثيل.

پێمواية هاوسەرگيريى يەكەمى بەهۆى نواندنەوە شكستى هێنا.

الزواج مع الأقارب يضعف النسل.

هاوسەرگيرى لەگەڵ خزم، زاووزێ لاوازدەكات.

سألو حكيما : ما هو الزواج ؟ فقال: هي الحرب الوحيدة التي تنام فيها بجانب العدو.

لە حەكيمێك دەپرسن: هاوسەرگيرى چيه؟

لەوەلامدا دەڵێت: هاوسەرگيرى تەنها جەنگە كە تێيدا لەپاڵ دوژمنەكەتدا دەخەويت.

كل ما اتذكر اني وقعت على عقد زواجي من دون تهديد وانا بكامل قواي العقليه اتذكر قوله تعالى "وما ظلمناهم ولكن كانو انفسهم يظلمون" ...

هەركاتێك ئەوەم بيردەكەوێتەوە كە بەبێ هيچ هەڕەشەيەك و لەوپەڕى هێزى عەقڵمدا گرێبەستى هاوسەرگيرييەكەم ئيمزاكردووە، ئەو ئايەتە پيرۆزەى قورئانم بيردەكەوێتەوە كە دەفەرمێت: "ئێمە ستەممان لێنەكردون، بەڵكو ئەوە خۆيان بون ستەميان لەخۆيان دەكرد"!!!

71رأيت شيخاً يلعب مع طفل.

پيرێكم بينى يارى لەگەڵ منداڵێكدا دەكرد.

.34 (مُثُول) وەك (حُضُور) ئامادەبونە[72]

(مَذْهَب)و (رَأْي) هەردوو بۆچونە[73]

.35 (عَهْد) سەردەمە، هەمیش بەڵێنە[74]

(مَرْأة) واتە ژن[75]، (مِرآة) ئاوێنە[76]

---

الشيخوخة داء بلا دواء.

پیری دەردێکی بێدەرمانە.

72ئەم دوو وشەیە لەم مانایەدا موورادیفن.

طلب منه المثول أمام المحكمة.

داوای لێکرا لەبەردەم دادگادا ئامادەبێت.

حضوره في الحفلة أفرح الجميع.

ئامادەبونی لەئاهەنگەکە، هەموانی دڵخۆشکرد.

73جمع مَذْهَب: مذاهِب. ج رَأْي: آراء

هو متمسك جداً بمذهبه الخاص و لا يحيد عنه بأي شكل من الأشكال.

ئەو زۆر پابەندە بە بۆچونە تایبەتەکەی خۆیەوە بە هیچ شێوەیەك لێی لانادات.

لا رأي لمن لا إرادة له.

ئەوەی ویستی نەبێت، بۆچونی نیە.

74 جمع: عُهود.

كانت السرقة في عَهْد الخليفة عمر قليلة.

دزی لەسەردەمی خەلیفە عومەردا کەم بوو.

كُنْ عند عَهْدِك.

لەسەر بەڵێنی خۆت بە. واتە پەشیمان مەبەرەوە.

[75] ج: نِساء ونسوة.

بەمانای ژن دێت وەك ئافرەت بەگشتی نەك تەنها ژن بەمانای خانمێکی شوکردوو. من پێموایە وشەی ئافرەت زۆر کوردی نیەو وشەی ژن جوانترە بۆیە لەبەیتەکەدا ئافرەتم بەکارنەهێنا.

أعطى الإسلامُ المرأةَ جميعَ حقوقها.

ئیسلام هەموو مافێکی داوە بە ژن.

يمكن للمرأة أن تفهم كل شي يتعلق بالدين إلا مسألة واحدة : "إن الشرع حلل 4". حين تسمعها تصبح واحدة من يهود بني قينقاع!

ژن دەتوانێت لەهەموو شتێکی ئاین تێبگات جگە لەیەك پرس کە دەڵێت شەرع چوار ژنی حەڵاڵکردووە. کاتێك ئەمە دەبیستێت دەبێتە جولەیەکی بەنو قەینوقاع!!!

المرأة تعيش لفترة أطول من الرجل. متوسط العمر المتوقع للمرأة في العالم هو 72 عامًا، مقارنة بـ 68 عامًا للرجل.

**.36** (اِلْتِهاب) چیه؟ واته هەوکردن[77]

(تَغَوُّط) مانای پیساییکردن[78]

**.37** (مَطَار) چیه؟ فڕۆکەخانە[79]

(اِستخدام) مانای بەکارهێنانە[80]

**.38** (رَدّ فِعْل) چیه؟ کاردانەوەیە[81]

(إخماد) وەك (إطفاء) کوژاندنەوەیە[82]

**.39** (حائِل) و (حاجِز) هەردوو بەربەستە[83]

---

ژن لەپیاو زۆرتر دەژی. تێکڕای ناوەندیی تەمەنی چاوەڕوانکراوی ژن لەجیهاندا ٧٢ ساڵە، بەڵام هی پیاو ٦٨ ساڵە.

76جمع: مَراءٍ ومرايا.

المسلم مِرآة لأخيه.

موسڵمان ئاوێنەیە بۆ براکەی.

77 جمع التهابات.

الْتِهاب اللوزتين مرض شائع لدى الأطفال.

هەوکردنی ئاڵووەکان نەخۆشییەکی باوە لەناو منداڵان..

[78] تأخير التغوط له أضرار عدة.

دواخستنی پیساییکردن چەند زیانێکی هەیە.

79جمع مطارات

أغلق المطار لمدة يومين كاملين.

فڕۆکەخانەکە بۆ ماوەی دوو ڕۆژی تەواو داخرا.

80استخدام القوّة في العلاقات الدوليّة شيء خطير.

بەکارهێنانی هێز لەپەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا شتێکی مەترسیدارە.

[81]هل تتوقع رد فعل عنيف من قبل قوات المعارضة؟

پێشبینی کاردانەوەیەکی توندتەکەیت لەلایەن هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە.

82إخماد النار استغرق ساعتين.

کوژاندنەوەی ئاگرەکە دوو سەعاتی خایاند.

إستطاع الرجل الشجاع إِطْفاء النَّارِ قَبْلَ انْتِشارِها.

پیاوە ئازاکە توانی ئاگرەکە بکوژێنێتەوە، پێش ئەوەی بڵاوببێتەوە.

[83]جمع حائل: حوائِلُ.

جمع حاجز: حاجزون وحَجَزة وحَوَاجِزُ (لغير العاقل).

(وقَفَ) وەستا[84]، (مَوْقِف) هەڵوێستە[85]

**40.** (ضَرَبَ) لێیدا[86]، (ضَرْب) و (طِرَاز) جۆر[87]

(طَبیب) پزیشکە[88]، (خَبیر)یش پسپۆڕ[89]

**41.** (خِضَمّ) بەمانای دەریای فراوان[90]

---

كثرت الحوائلُ في وجوه الشَّباب.

بەربەستەکانی بەردەم گەنجان زۆر بون.

الحواجز بين حكومة الاقليم و نظيرتها العراقية كبيرة.

بەربەستەکانی نێوان حکومەتی هەرێم و هاوتا عیراقییەکەی گەورەن.

[84] وقَفَ، يَقِف، قِفْ، وُقوفًا.

وقفت السيارة في منتصف الطريق بسبب عطل مفاجيء.

بەهۆی لەکارکەوتنێکی کتوپڕەوە، ئۆتۆمبێلەکە لەناوەڕاستی ڕێگاکەدا وەستا.

[85] جمع: مواقِفُ

ما هو موقفك تجاه قرار الحكومة الأخير.

هەڵوێستت چیە بەرامبەر بە بڕیاری کۆتایی میری.

[86] ضرب الوالد إبنه.

باوکەکە لەمنداڵەکەی دا.

[87] جمع ضرب: أضراب (لغير المصدر) وضروب (لغير المصدر) وأضرُب (لغير المصدر).

الرِّواية ضرب من ضروب الأدب.

ڕۆمان جۆرێکە لەجۆرەکانی وێژە.

جمع طراز: أطرِزة وطُرُز.

الجيشُ مُسلّح بأحدث طُرُز الأسلحة.

سوپاکە بە تازەترین جۆرەکانی چەك پڕچەککراوە.

[88] جمع: أطبّاء وأطِبّة.

لم يستطع أطبّاء المدينة علاجه مرض الرئيس العضال.

پزیشکانی شارەکە نەیانتوانی چارەسەر نەخۆشییە کوشندەکەی سەرۆك بکەن.

[89] ج: خُبَراءُ

زوجها خبير فى مجال الهندسة.

مێردەکەی پسپۆڕی بواری ئەندازیارییە.

[90] هل تستطيع قيادة السفينة وسط هذا الخِضَمّ؟

ئایا دەتوانیت لەناو ئەم دەریا فراوانەدا کەشتی لێبخوڕیت؟

(طَبيعة) سروشت[91]، (طَبْعًا) بێگومان[92]

**.42** (دائِرة) فەرمانگە، بەڵا، هەم بازنە[93]

(مُكافَحة)یە "لەناوبردن"ە[94]

**.43** (غايَة) ئامانجە، هەروەها ئەوپەڕ[95]

(نَحّات) پەیکەرتاش[96]، (تِمثال)یش پەیکەر[97]

---

[91] جمع طبائع

الرجوع الى الطبيعة يحل أغلب المشاكل الصحية.

گەڕانەوە بۆ سروشت زۆربەی کێشە تەندروستییەکان چارەسەردەکات.

[92] طَبْعًا سندافع عن وطننا.

بێگومان بەرگری لەنیشتمانەکەمان دەکەین.

[93]جمع دوائرُ. سیان لەگرنگترین ماناکانی فەرمانگەو بەڵاو بازنەن.

دائرتنا مليئة بالموظفين الأكفاء.

فەرمانگەکەمان پڕە لەکارمەندگەلی لێهاتوو.

بسبب ظلمه المستمر يَخْشَى أَنْ تُصِيبَه دَائِرَةٌ طبيعية.

بەهۆی ستەمە بەردەوامەکەیەوە، دەترسێت کە بەڵایەکی سروشتی توش ببێت.

لا أرى مركز الدائرة.

چەقی بازنەکە نابینم.

[94]لەناوبردن= نەهێشتن.

مكافحة الفساد عملية شاقّة.

لەناوبردنی گەندەڵی کارێکی سەختە.

[95]جمع غايات وغاي. بەمانای ئامانج و ئەوپەڕیش دێت. ئەوپەڕ بەمانای کۆتایی و زۆرترین ئاست.

ما غايتك من التحدث مع تلك الفتاة؟

ئامانجت چیە لەقسەکردن لەگەڵ ئەو کچەدا.

هو الان في غاية الأناقة.

ئەو ئێستا لەوپەڕی شیکپۆشیدایە.

[96]زوجها نَحّات ماهر.

مێردەکەی پەیکەرتاشێکی کارامەیە.

[97]جمع تماثيلُ

صنعت الحكومة تمثالاً رائعاً للشاعر المرحوم.

میری پەیکەرێکی نایابی بۆ شاعیری خوالێخۆشبوو دروستکرد.

**.44** (بِداية) چيه؟ ماناى سەرەتا[98]

(لِغايَةِ الآن) واتە تائێستا[99]

**.45** (عَدَس) واتە نيسك[100]، (عَدَسَة) هاوێنە[101]

(قَنّاص) راوكەرو نيشانشكێنە[102]

**.46** (مَجْلِسْ) ئەنجومەن[103]، (جَليسْ)ە هاودەم[104]

(سَفِينة) كەشتى[105]، (زَوْرَق)ە بەلەم[106]

---

[98] المعلومات حولة بداية العالم قليلة.

زانياريى سەبارەت بە سەرەتاى جيهان، كەمە.

[99]لم تصلني رسالتك لغاية الآن.

تائێستا نامەكەتم پێنەگەيشتووە.

[100]العدس مفيد للصحة.

نيسك بەسودە بۆ تەندروستى.

[101]استعمالُ السيّدات للعدسات اللاّصقة شيء شائع.

بەكارهێنانى هاوێنەى لكاو لەلايەن خانمانەوە، شتێكى باوە.

[102]جمع قَنَّاصون وقنَّاصة. بەماناى راوكەرو نيشانشكێنيش دێت.

راوكەر= راوچى.

نيشانشكێن= نيشانپێك: ئەو تفەنگبەدەستە لێهاتوو و دەستڕاستانەى خەڵك بەتايبەت سياسى و كەسايەتييە ديارەكانى تر تيرۆردەكەن.

كان والدي قنّاصاً ماهراً.

باوكم راوچييەكى كارامە بوو.

القَنّاص المجهول بث الخوف و الذعر في المدينة.

نيشانشكێنە نەناسراوەكە ترس و تۆقينى لەشارەكەدا بڵاوكردەوە.

[103]جمع مَجالس

يناقش مجلس الوزراء اليوم مسألة رواتب الموظفين.

ئەمڕۆ ئەنجومەنى وەزيران گفتوگۆ لەسەر پرسى موچەى فەرمانبەران دەكات.

[104]جُلساءُ وجُلاَّس.

هاودەم: هاوڕێى نزيك، هاوڕێيەك كە دانيشتنت لەگەڵيدا هەبێت.

الكتاب خير جَليس.

كتێب باشترين هاودەمە.

[105] جمع سَفائِنُ وسُفُن وسَفين.

**.47** (بَرِيء) بێتاوان[107]، (مُجرِمْ) تاوانبار[108]

(مُعتَدي) واته دەستدرێژیکار[109]

**.48** (خُبْز) واته نان[110]، (رَغيف) کولێره[111]

(خُفَّاش) و (وَطْواط) شەمشەمەکوێره[112]

---

غرقت السفينة التجاريّة فى البحر.

کەشتییە بازرگانییەکە لەدەریاکەدا نقومبوو.

ماكل مايتمناه المرء يدركه

تجري الرياح بما لاتشتهي السفن

مرۆڤ بە هەموو ئەو شتانە ناگات کە ئاواتیان بۆ دەخوازێت

با بەشێوەیەك دەڕوات کە کەشتییەکان حەزی پێناکەن

106 جمع زَوارِق.

كاد زورقنا أن يغرق فى النهر.

خەریکبوو بەلەمەکەمان لەناو روبارەکەدا نقوم ببێت.

107 الجمع : بَريئون و أبرياء و بُرَآء و بُرَاء و بِرَاء ، المؤنث : بَريئة ، و الجمع للمؤنث : بَريئات.

المتهم بريء حتى تثبت إدانته.

تۆمەتبار بێتاوانە تا ئەوکاتەی ئیدانەکردنی دەسەلمێنرێت.

108 كان زوجها رجلاً مجرماً، لذا قررت الانفصال.

مێردەکەی پیاوێکی تاوانبار بوو، بۆیە بڕیاری جیابونەوەی دا.

109 دەستدرێژیکار: کەسێك یان لایەنێك دەستدرێژی بکاتە سەر شتێك یان کەسێك.

إعتقلت الشرطة المعتديَ في مكان الحادث.

پۆلیس دەستدرێژیکارەکەی لەشوێنی روداوەکە دەستگیرکرد.

110 جمع الجمع أخباز،مفرد خُبْزة.

يصنع الخبز من الطحين.

نان لەئارد دروستدەکرێت.

111 جمع أَرغِفَة ورُغُف ورُغْفان.

أكل الطفل الصغير رغيفاً واحداً بمفرده.

منداڵەکە بچوکەکە، تەنها خۆی کولێرەیەکی خوارد.

112 ج خفاش= خَفافِيشُ.

ج وطواط: وطَاوِطُ ووطاويطُ.

الخُفَّاش طائر ليلي.

**.49** (إعالة) چیە؟ بەخێوکردنە[113]

(تَیْس) سابرێنە[114]، (ماعِز) بزنە[115]

**.50** (عَصَبْ) دەمارە، جەمعەکەی (أعصاب)[116]

(عُرْفُ الدِّیك) مانای پۆپنەی کەڵەباب[117]

**.51** (بُرْکان) گڕکانە، کۆکەی (بَراکین)[118]

(مُتشائِم) رەشبین[119]، (مُتفائِل) گەشبین[120]

---

شەمشەمەکوێرە باڵندەیەکی شەوانەیە.

قتل الوطواط جريمة.

کوشتنی شەمشەمەکوێرە تاوانە.

[113] إعالة الأسرة في زمننا الحاضر، شيء صعب.

بەخێوکردنی خێزان لەم سەردەمەی ئێستاماندا شتێکی قورسە.

[114] جمع أتياس وأَتْيُس وتِيَسَة وتُيُوس.

سابرێن= بزنی نێر.

أخافَ التيسُ الطفلَ.

سابرێنەکە منداڵەکەی ترساند.

[115] جمع مِعاز ومَعْز ومَعَز ومواعز.

الماعز حيوان ذكي.

بزن زیندەوەرێکی زیرەکە.

[116] إن لم يذهب الألم الدائم الذي في رأسي، يجب علي أن أزور أخصائيَّ جراحة الأعصاب.

ئەگەر ئەو ئازارە بەردەوامەی لەسەرمدایە لانەچێت، ئەوا پێویستە لەسەرم سەردانی پسپۆڕێکی نەشتەرگەری دەمارەکان بکەم.

[117] پۆپنەی کەڵەباب= پۆپنەی کەڵەشێر.

لون عرف الديك أحمر.

رەنگی پۆپنەی کەڵەشێر سورە.

[118] هل تعلم لماذا تحدث البراكين؟

ئایا دەزانیت بۆچی گڕکان روودەدات؟

[119] زوجها رجل مُتشائِم.

مێردەکەی پیاوێکی رەشبین.

[120] هل أنت مُتفائِل حول مستقبل العلاقات بين إقليم كردستان و الحكومة المركزية؟

ئایا سەبارەت بە داهاتوی پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەندی، گەشبینیت؟

**.52** (مُختَرِع) چیە؟ واتە داهێنەر[121]

(مُخیف) ترسناك[122]، (مُرعِب) تۆقێنەر[123]

**.53** (ابْتِکار)، (إبْداع) هەردوو داهێنان[124]

(مُشکِلة) کێشە[125]، (أَزْمة)یە قەیران[126]

**.54** (حُکُومَة) میری[127]، (وَزیرْ) شالیارە[128]

---

[121]لیس أدیسون المخترع الحقیقي للمصباح الکهربائي.

داهێنەری راستەقینەی گڵۆپ، ئەدیسۆن نیە.

[122]ذلك الحیوان مُخیف، لا تقترب منه.

ئەو گیاندارە ترسناکە. لێی نزیك مەبەرەوە.

[123]الحیّة کائنة مُرعِبة.

مار بونەوەرێکی تۆقێنەرە.

[124] له قدرة عالیة في إبتکار کلمات جدیدة.

توانایەکی بەرزی هەیە لەداهێنانی وشەی نوێدا.

الإبْداع نعمة لا یعطیها الله الکل.

داهێنان نیعمەتێکە خودا نایبەخشێت بە هەموان.

[125] ج: مشکلات و مشاکِل.

ما هي مشکلتك؟

کێشەکەت چیە؟

إثنان من المستحیل إقناعهم بأن المشکلة من عندهم: المرأة و شرکة الإتصالات.

دوان هەن مەحاڵە قەناعەتیان پێبکەیت کە کێشەکە لەلای ئەوانەوەیە: ژن و کۆمپانیای تەلەفۆن!

إبتعد عن السلبیین في حیاتك. لدیهم مشکلة لکل حل.

لەکەسە نەرێنییەکان دوربکەوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە بۆ هەموو چارەسەرێك کێشەیەکیان پێیە.

[126]ج: أَزَمات و أَزْمات.

حکومة الإقلیم تمرّ بأزمة إقتصادیة حادّة.

حکومەتی هەرێم بە قەیرانێکی ئابوریی توندا تێپەڕدەبێت.

[127]الحکومة مسؤولة عن أمن المواطنین.

میری بەرپرسیارە لەئاسایشی هاوڵاتیان.

[128]ج: وُزراء

هەرچەندە وشەی وەزیر عەرەبییەو کوردییەکەی شالیارە، بەڵام بە دەگمەن کوردییەکە بەکاردەهێنێرێت.

(مِطرَقة) چەكوش[129]، (مِسْمار) بزمارە[130]

**.55** (وَعْد) بەڵێنە، واتە پەیمانە[131]

(طَیَّار) بەمانای فڕۆكەوانە[132]

**.56** (مَعدِن) كانزایە[133]، (مَنْجَم) مانای كان[134]

(شَخْص) واتە كەس[135]، (سُكّان) دانیشتوان[136]

---

وزير الدفاع يتفقد الجيش بإستمرار.

شالیاری بەرگری بە بەردەوامی سوپا بەسەردەكاتەوە.

[129]ج: مَطَارِق

هل تستطيع حمل تلك المطرقة الثقيلة؟

ئایا دەتوانیت ئەو چەكوشە قورسە هەڵبگریت؟

[130]ج: مَسامِیر.

قطع مسمار حادّ رجلي.

بزمارێكی تیژ قاچمی بڕی.

[131]جمع وعود.

التزم بوعدك.

پابەندی بەڵێنەكەت بە.

[132]جرح الطَیَّار فی الحادث ولكنه لم يمت.

فڕۆكەوانەكە لەڕوداوەكەدا بریندار بوو بەڵام نەمرد.

[133]مع معادِن

الذهب مَعْدِنٌ ثمينٌ.

زێڕ كانزایەكی گرانە.

[134]جمع مناجِم.

العمل فی المنجم خطير جداً.

كاركردن لەكان زۆر مەترسیدارە.

[135]جمع أشخاص وأشخُص وشُخوص.

الزّواج يوحّد بين شخصين.

هاوسەرگیری دوو كەس یەكدەخات.

[136] جەمعی تەكسیرە. تاكەكەی (ساكِن)ە.

هل تعلم كم هو عدد سكّان إقليم كردستان بدقّة؟

ئایا دەزانیت ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی كوردستان بەوردی چەندە؟

**.57** (ذُبابْ) واته مێش[137]، (بَعوضْ) مێشوله[138]

(فَراش) پەپوله[139]، (نَمْلَة) مێروله[140]

**.58** (بَذْرَة) واته تۆو، کۆدوجای (بُذورْ)[141]

(جَنوب) باشوره[142]، (شَمال)یش باکور[143]

---

يُتوقع أن يصل عدد سكان العالم إلى 8.5 مليار في عام 2030، وأن يزيد بعد ذلك إلى 9.7 مليار نسمة مع حلول عام 2050 ثم يصل بعد ذلك إلى 10.4 مليار نسمة بحلول عام 2100.

پێشبینیدەکرێت ژمارەی دانیشتوانی جیهان لەساڵی 2030 بگاتە هەشت مليارو 500 ملیۆن کەس و لە 2050 بگاتە نۆ مليارو 700 ملیۆن و لە 2100 بگاتە 10 مليارو 400 ملیۆن.

كم كان عدد سكان الصين في عام 1950؟

ژمارەی دانیشتوانی چین لەساڵی 1950 چەند بووە؟ 552 ملیۆن

[137]جمع الجمع أذِبَّة وذِبَّان،مفرد ذُبابة.

اجتمع الذبابُ على الطعام.

مێش لەسەر خواردنەکە کۆبووەوە.

[138]مفرد بَعوضة.

البعوض حيوان مزعج.

مێشوله زیندەوەرێکی بێزارکەرە.

[139]مفرد: فَراشة.

جمع: فَراشات وفَرَاش.

يحب الأطفالُ اللعبَ مع الفراش.

منداڵ حەز بە یاریکردن لەگەڵ پەپوله، دەکات.

[140]جمع نَمَلات ونَمْلات ونِمال ونَمْل.

نملة كبيرة عضّت يدي اليمنى.

مێرولەیەکی گەورە کازی لەدەستی راستم گرت.

نملة تزوّجت فيلاً، وبعد ما مات، قضت كل عمرها تدفن فيه. هذه هي قمة الوفاء!!!

مێرولەیەك شودەکات بە فیلێك، پاش مردنی فیلەکە، مێرولەکە هەموو تەمەنی لەناشتنی مێردەکەیدا بەسەردەبات. ئا ئەمەیە لوتکەی وەفاداری!!!

[141]مەخسەوی شەریفم لەکۆدوجا، جەمعی جەمعە، واتە کۆی زۆر.

وضع الفلاح البَذْرة في الأرض.

جوتیارەکە تۆوەکەی لەزەوی دانا.

[142] جمع أَجنُب وجنائب.

59. (أشعَلَ) هەڵکرد[144]، (شُعْلَة) مەشخەڵە[145]

(خَطِيئة) تاوان[146]، (خَطَأ)یش هەڵە[147]

60. (زَوْجَة)، (قرينة)، (حَرَمْ) واتە ژن[148]

---

أعيش في جنوب مدينة السليمانية.

لەباشوری شاری سلێمانی دەژیم.

في جنوب أفريقيا يُعتبر تسلق الأشجار دون إذن رسمي جريمة معرضة للعقوبة.

لەو ئەفریقای باشورەی لای خۆمان، هەڵگەڕان بە درەختدا بەبێ مۆڵەتی رەسمی، بە تاوان دادەنرێت و سزای لەسەرە.

[143]شمال المدينة أجمل من جنوبها.

باکوری شارەکە لەباشوری جوانترە.

[144]أشعلَ يُشعل ، إشعالاً ، فهو مُشعِل ، والمفعول مُشعَل.

الطفل أشعلَ مصابيح الغرفة.

منداڵەکە گلۆپەکانی ژورەکەی هەڵکرد.

[145]جمع شُعُلات وشُعْلات وشُعَل.

أخذ الشعلة وطاف بها أرجاء الملعب.

مەشخەڵەکەی هەڵگرت و بەدەوربەری یاریگاکەدا گێرای.

[146]جمع خَطِيئات وخَطايا.

اعترف بخطيئته.

دانی بە تاوانەکەیدا نا.

[147]جمع أخطاء.

فصل عن العمل بسبب خطأ لغوي.

بەهۆی هەڵەیەکی زمانەوانییەوە، لەکار دەرکرا.

[148]هەرسێکیان بەمانای ژن دێن. ژن بەمانای هاوسەر نەك ژن بەگشتی.

جمع حرم: أحْرام.

زَوْجَة صَالِحَة خير من ثروة هائلة.

ژنێکی باش لەسامانێکی زۆر باشترە.

قال لزوجته : أريد أن أتزوج زوجة ثانية ، ليرى ردة فعلها .. فمر اليوم الأول ولم يرَ شيئا ، ثم اليوم الثاني ولم يرَ شيئا ، وفي اليوم الثالث بدأ يرى قليلاً بعينه اليمنى..

بە ژنەکەی گوت: "دەمەوێت ژنی دووەم بهێنم" بۆ ئەوەی کاردانەوەی ببینێت، رۆژی یەکەم تێپەڕی هیچی نەبینی، دووەم هیچی نەبینی، رۆژی سێیەم چاوی راستی وردە وردە شتی ئەبینی!!!!

دُعي إلى الحفل هو وقرينتُه.

(أنتَ)و (أنتِ) تۆ[149]، (أنا) مانای من[150]

**.61** (قُمامة) چیە؟ واتە پاشەڕۆ[151]

(صُورة) وێنەیە[152]، (لَوْحة)یە تابلۆ[153]

**.62** (اِندِمال) چیە؟ واتە سارێژبون[154]

(ثَوْرَة) شۆڕشە[155]، (عِصْیان) یاخیبون[156]

---

بانگهێشتکرا بۆ ئاهەنگەکە، خۆی و ژنەکەی.

دخل الرجل و حرمه ردهة العمليات معاً.

پیاوەکەو ژنەکەی پێکەوە چونە قاوشی نەشتەرگەرییەوە.

149 هەردوکیان بەمانای تۆ دێن، بەڵام یەکەمیان بۆ نێرەو دووەمیان بۆ مێیە.

تذكر دائماً، أنت لا تعرف عن الآخرين غير الذي سمحوا لك بمعرفته.

هەمیشە ئەوەت لەبیربێت کە تۆ تەنها ئەو شتانەی خەڵك دەزانیت کە خۆیان ڕێیانپێداویت بیزانیت.

أنتِ فتاة جميلة.

تۆ کچێکی جوانیت.

أنتَ ولد ذكي.

تۆ کوڕێکی زیرەکیت.

150أنا لا أحب النميمة.

من حەزم لەقسەهێنان و بردن نیە.

151جمع قُمامات وقُمام.

سلة القُمامة قديمة جداً.

سەبەتەی پاشەڕۆکە زۆر کۆنە.

152جمع صُورات وصُوَر وصِوَر.

تبدو نحنيفاً فى الصورة.

لەوێنەکەدا لاواز دەردەکەویت.

153من رسم هذه اللوحة الجذابة؟

کێ ئەم تابلۆ سەرنجڕاکێشەی کێشاوە؟

154اندمال جرح الأقرباء يستغرق سنيناً طويلة.

سارێژبونی برینی خزم چەندین ساڵ دەخایەنێت.

155جمع ثَوْرات وثَوَرات.

كان جدي أحد ثوّار ثورة الشيخ محمود الحفيد.

باپیرم یەکێك بوو لەشۆڕشگێرانی شۆڕشەکەی شێخ مەحمودی حەفید.

**.63** (مَجْنُون) واته شێت، کۆکەی (مَجانين)[157]

(مِنظار) دوربینه[158]، (ناظور) هەناوبین[159]

**.64** (انتِصار) چيه؟ واته سەرکەوتن[160]

(ظُهُور) و (بُروز) هەردوو دەرکەوتن[161]

**.65** (قُبالة) چيه؟ واته بەرامبەر[162]

(إنْ) لەگەڵ (إذا) هەردوکیان ئەگەر[163]

---

[156]هل تعتقد بأن عصيان موظفي الشركة يعالج الأزمة الإقتصادية؟

لەو بڕوایەدایت یاخیبونی کارمەندانی کۆمپانیا قەیرانە ئابورییەکە چارەسەردەکات.

[157]مجنون بلا أذى خير من عاقل شرير.

شێتێکی بێزیان لەژیرێکی خراپەکار، باشترە.

[158]ج: مَناظير

هل رأيت شيئاً غريباً من المنظار؟

ئایا لەدوربینەکەوە شتێکی نامۆت بینی؟

[159]هەناوبین: ئامێرێکە بۆ پشکنینی هەناوی مرۆڤ و زیندەوەرانی تر بەکاردەهێنرێت.

كشف الناظور بأن هناك ورم حميد في معدته.

هەناوبینەکە دەریخست کە لویەکی پاك لەگەدەیدایە.

[160]جمع انتصارات.

فرحت كثيراً بانتصارات الجيش على العدو.

زۆر دڵخۆش بوم بە سەرکەوتنەکانی سوپا بەسەر دوژمندا.

[161]ظُهُور علامات المرض على الجسد، يوجب زيارة الطبيب.

دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی لەسەر جەستە، سەردانی پزیشك دەکاتە شتێکی پێویست.

كان بروز الشاعر مفاجئاً.

دەرکەوتنی شاعیرەکە کتوپڕ بوو. واتە چاوەڕوانکراو نەبوو.

[162]بيته قُبالة بيتي.

ماڵەکەی بەرامبەر ماڵەکەمە.

[163]هەردوکیان ئامرازی مەرجن و بەمانای (ئەگەر) دێن.

إن تدرسْ تنجحْ.

ئەگەر بخوێنیت، دەردەچیت.

إذا لم تستح فإصنع ما شئت.

**.66** (ناشِط) و(نَشيط) وەك (نَشِط) چالاك[164]

(جَمعْ) واتای كۆ[165]، (مُفرَدْ) مانای تاك[166]

**.67** (خَيْر) باشترە، هەم باشترینە[167]

(قَوْسُ قُزَح)ە پەلكەزێڕینە[168]

**.68** (لَحْظَة) واتە سات[169]، (وَقتْ)و (زَمَنْ) كات[170]

---

ئەگەر شەرمت نەكرد، چیت دەوێت، بیكە.

[164] هەرسێكیان بەمانای چالاك دێن.

إنه ناشط في عمله.

بەڕاستی ئەو چالاكە لەكارەكەیدا.

الإنسان النشيط ينجز أعماله بسرعة.

مرۆڤی چالاك كارەكانی بەخێرایی جێبەجێ دەكات.

أنا نشط في الكتابة ولكنني من الناحية الجسدية ضعيف.

من لەنوسیندا چالاكم بەڵام لەڕوی جەستەییەوە لاوازم.

[165] هل تعرف ما هو جمع كلمة "رجل"؟

دەزانیت كۆی وشەی "رجل" چیە؟

[166] ليس لكلمة (نساء) مفرد من لفظها.

وشەی (نساء) لەپێكهاتەی پیتەكانی خۆی، تاكی نیە.

[167] بەمانای باشترو باشترینیش دێت.

زوج صالح فقير خير من طالح ثريّ.

هاوسەرێكی باشی هەژار لەخراپێكی دەوڵەمەند باشترە.

يقول ابن حزم : أن تُوصف بالفسق وأنت فاضل خيرٌ من أن تُوصف بالفضل وأنت فاسق.

بە گوناهكار باسبكرێیت لەكاتێكدا خۆت باش بیت، باشترە لەوەی بە چاكەكار باسبكرێیت كەچی خۆت گوناهكار بیت.

"خيركم من تعلّم القرآن وعلّمه".

باشترین كەستان ئەوەیە كە فێری قورئان بووەو كەسانی تر فێردەكات.

[168] هل تعلم متى تحدث ظاهرة قوس قزح؟

ئایا دەزانیت چ كاتێك دیاردەی پەلكەزێرینە رودەدات؟

[169] جمع لَحَظات ولَحْظات

إنتظرني لحظات.

چەند ساتێك چاوەڕێم كە

[170] وقت الشدة يعرف الصديق الوفي.

(غَربْ) خۆرئاوا[171]، (شَرقْ) خۆرهەڵات[172]

**.69** (زَوايا) گۆشە، بەڵام تاك نا كۆ[173]

(أنتُم)، (أنتُنَّ) هەردوكيان ئەنگۆ[174]

**.70** (قَمَر) واتە مانگ[175]، (شَمس) ماناى خۆر[176]

(قَليل)، (يَسير) كەم[177]، (طائِل)، (كَثير) زۆر[178]

---

كاتى تەنگانە هاوڕێى بەئەمەك دەناسرێتەوە.

المشروع يستغرق زمناً طويلاً.

پرۆژەكە كاتێكى زۆر دەخايەنێت.

[171] هبَّت الرِّيحُ من الغرب.

بايەكە لەخۆرئاواوە هەڵيكرد.

من أشد التناقضات : مجتمع يريد أن يعيش كـالغرب ويموت كـالصحابة!

يەكێك لەگەورەترين دژيەكييەكان ئەوەيە كۆمەڵگەيەك بيەوێت وەك خۆرئاوا بژى و وەك هاوەڵانى پێغەمبەر، بمرێت!

[172] تشرق الشمس من الشرق.

خۆر لەخۆرهەڵاتەوە هەڵدێت.

[173] تاكەكەى (زاوِية)يە. هەروەها بە (زاويات)يش كۆدەكرێتەوە.

رأيت حيّة كبيرة في زاوية ال غرفة.

مارێكم لەگۆشەى ژورەكەدا بينى.

[174] هەردوكيان بەماناى ئەنگۆ دێن، بەڵام يەكەميان بۆ نێرەو دووەميان بۆ مێيە. ئەنگۆ= ئێوە.

أنتُم رجال أذكياء.

ئێوە پياوگەلێكى زيرەكن.

أنتُنَّ أجمل سيدات المدينة.

ئێوە جوانترين خانمانى شارەكەن.

[175] جمع أقمار

ليس القمر نجماً.

مانگ ئەستێرە نيە.

[176] جمع شُموس

الشمس أكبر من الزّهرة.

خۆر لەهەسارەى زوهرە گەورەترە.

[177] مقدار قليل من السمّ كاف لقتل إنسان بالغ.

**.71** (جلَبَ) هێنا[179]، (جَلْبْ) هێنانه[180]

(ذنْب)و (جَريرة)و (إِثْم) تاوانه[181]

**.72** (شَطَط)، (جَوْر)، (ظُلْم) هەرسێکیان ستەم[182]

---

بڕێکی کەم لەژەهر بەسە بۆ کوشتنی مرۆڤێکی پێگەیشتوو.

لا تخجل من الإعطاء اليسير فإن الحرمان أخجل منه.

لەبەخشینی کەم شەرم مەکە، چونکە بەڕاستی نەبەخشین شەرمەزارترە.

178 هەردوکیان بەمانای زۆر دێن.

وَرث من والده ثروة طائلة.

سامانێکی زۆری لەباوکییەوە بۆ مایەوە.

قرأت كتباً كثيرة.

زۆر کتێبم خوێندووەتەوە.

لا أثبت لك بأنني لن أتكرر، كثيرٌ من الناس يثبتون لك ذلك من بعدي!

بۆت ناسەلمێنم کە دوبارە نابمەوە. دوای من خەڵکێکی زۆر بۆت دەسەلمێنن!

179 جلب يَجلُب ويَجلِب.

جلب التاجر أحدث أنواع الجهاز الى المدينة.

بازرگانەکە تازەترین جۆرەکانی ئامێرەکەی هێنا بۆ شارەکە.

180 واته چاوگی (جلَبَ)یە.

جلب البضائع الجيّدة للمدينة واجب التجّار.

هێنانی کاڵای باش بۆ شارەکە ئەرکی بازرگانانە.

181 هەرسێکیان بەمانای تاوان دێن. تاوان= گوناه

ارتكب الشابّ ذنبًا.

گەنجەکە تاوانێکی ئەنجامدا.

المعترف بالجريرة مُستحقٌّ للغفيرة.

ئەوەی دان بەتاوانەکەیدا بنێت، شیاوی لێخۆشبونە.

شرب الخمر إثم عظيم.

خواردنەوەی مەی تاوانێکی گەورەیە.

182 في أحكامه شطط.

بڕیارەکانی ستەمیان تێدایە.

جور القريب يدمّر الإنسان.

ستەمی کەسی نزیك مرۆڤ لەناودەبات.

(رَخيص) هەرزانە[183]، (بَخْس) واتە کەم[184]

[.73](#) (انتِحار) چیە؟ واتە خۆکوشتن[185]

(شِراء) کڕینە[186]، (بَیْع)یش فرۆشتن[187]

[.74](#) (لَجوج) و (عَنید) هەردوکیان ئینکار[188]

(حَدّ) واتە سنور[189]، (مَحدود) سنوردار[190]

[.75](#) (تَباهي) چیە؟ خۆ هەڵکێشانە[191]

---

ظلم الجائر لا يستمرّ للأبد.

ستەمی ستەمکار بۆ هەتاهەتایە بەردەوام نابێت.

183 أنت بخيل، لا تشتري الّا الأشياء الرخيصة.

تۆ چروکیت، شتگەلی هەرزان نەبێت نایکڕیت.

184جمع بُخوس

(وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ)

بە نرخێکی کەم کڕییان.

185 حاول الرجل الانتحار.

پیاوەکە هەوڵی خۆکوشتنی دا.

186لا تبذّر مالك في شراء أشياء لست بحاجة اليها.

سامانەکەت لەکڕینی شتگەلێکدا بەفیرۆمەدە کە پێویستت پێی نیە.

187هو يعمل فى مجال بيع و شراء البيوت.

ئەو لەبواری فرۆشتن و کڕینی خانودا کاردەکات.

188بێگومان وشەی ئینکار کوردی نیەو نارەسمییە بەڵام بەکارهێنانی باوە. بە کەسێك دەووترێت، کە بە چاك و بە خراپ سور بێت لەسەر قسەی خۆی و مل نەدات، تۆ بڵێی نێرە، ئەو بڵێی دەیدەم بە شوو!!!

أنت رجل لجوج، لا أحب المناقشة معك.

تۆ پیاوێکی ئینکاریت، حەزم لەگفتوگۆکردن نیە لەگەڵتدا.

زوجها عنيد جداً.

مێردەکەی زۆر ئینکارە.

189 جمع حُدود

لا تتجاوز حدود الناس.

سنورەکانی خەڵك مەبەزێنە.

190نريد أن تؤكد حضورك لأن عدد الكراسي محدود.

(ضَحْك) پێکەنین[192]، (بُکاء) گریانە[193]

**.76** (مَقْدَم) و (مَجيِء) هەردوکیان هاتن[194]

(تَأجيل) و (تَأخير) مانای دواخستن[195]

**.77** (قَبَّان) و (مِيزان) هەردوو تەرازوو[196]

(خَسّ) واتە کاهوو[197] (خسَأَ) لاوازبوو[198]

---

دەمانەوێت ئامادەبونت دڵنیابکەیتەوە، چونکە ژمارەی کورسییەکان سنورداره. واتە کەمە.

[191]تباهيك بنفسك أكثر من إنجازاتك.

خۆ هەڵکێشانت بە خۆت، لەدەسکەوتەکانت زیاترە.

[192]الضحك بدون سبب شيء غير مقبول.

پێکەنین بەبێ هۆ شتێکی پەسەندکراو نیە.

[193]البكاء للميّت شيء طبيعي.

گریان بۆ مردوو شتێکی سروشتییە.

[194]سررت كثيراً بمقدمك.

زۆر خۆشحاڵ بوم بە هاتنت.

مجيئ المجرم الى المنطقة خطر على الجميع.

هاتنی تاوانبارەکە بۆ ناوچەکە مەترسییە لەسەر هەموان.

[195]تأجيل محاكمة المجرمين أغضب أهالي الضحايا.

دواخستنی دادگاییکردنی تاوانبارەکان، کەسوکاری قوربانییەکانی تورەکرد.

لا أحبذ تأخير عملي اليوم الى الأسبوع القادم.

حەزم لەدواخستنی ئیشی ئەمڕۆ بۆ هەفتەی داهاتوو.

[196]تەرازوو= قەپان.

القبَّان قديم جداً.

قەپانەکە زۆر کۆنە.

هل تجيد إستخدام ذلك الميزان الجديد؟

ئایا دەزانیت بە باشی ئەو تەرازووە تازەیە بەکاربهێنیت؟

[197]الخسّ غذاء صديق لمرضى السكري.

کاهوو خواردەمەنییەکی دۆستی توشبوانی شەکرەیە.

[198]خسَأَ يَخسَأ ، خَسْئًا وخُسُوءًا

خسأت عيناي بسبب المرض.

چاوەکانم بەهۆی نەخۆشییەوە لاوازبون.

**.78** (عَديل) هاوتایەو ئاوەڵزاوایە[199]

(حَماة) خەسووە[200]، (صِهْر) زاوایە[201]

**.79** (نِسْيان) چیە؟ بیرچونەوە[202]

(تَيَبُّس) مانای وشکبونەوە[203]

**.80** (بِدّ) و (مَثيل) و (نَظير) هاوتایە[204]

(نَخْل) دارخورما[205]، (تَمْر) خورمایە[206]

---

[199] جمع أعدال وعُدَلاء

أنّه شاب وسيم جدّاً، ليس له عديل في المنطقة.

ئەو گەنجێکی زۆر قۆزە، هاوتای نیە لەناوچەکەدا.

عديلك رجل كذّاب.

ئاوەڵزاواکەت پیاوێکی درۆزنە.

[200] جمع حَمَوات

لم أزر حماتي منذ يومين.

دوو رۆژە سەردانی خەسوم نەکردووە.

[201] جمع أَصْهار وصُهَراءُ

لقد قتل صهر صدام في معركة داخلية.

زاواکەی سەدام لەشەڕێکی ناوخۆییدا کوژرا.

[202] النسيان نعمة من نعم الله الكثيرة.

بیرچونەوە نیعمەتێکە لەنیعمەتە زۆرەکانی خودا.

[203] يجب عليك زيارة طبيبك بعد تيبُّس الجرح.

پاش وشکبونەوەی برینەکە، پێویستە لەسەرت سەردانی پزیشکەکەت بکەیت.

[204] هەرسێکیان بەمانای هاوتا دێن.

ما أنت بِدّي في الخطابة.

تۆ لەوتاربێژیدا هاوتای من نیت.

من ناحية الذّكاء، لا مثيل له في الصف.

لەڕوی زیرەکییەوە، لەپۆلەکەدا هاوتای نیە.

إجتمع وزير صحة العراق بنظيره البريطاني لمناقشة تصاعد عدد المصابين بوباء فيروس كورونا الجديد.

بۆ تاووتوێکردنی هەڵکشانی ژمارەی توشبوان بە پەتای ڤایرۆسی کۆرۆنای نوێ، وەزیری تەندروستیی عیراق لەگەڵ هاوتا بریتانییەکەی کۆبووەوە.

**.81** (فِناء)و (باحة) هەردوكيان حەوشە[207]

(خُطَّة) پلانە[208]، (خارِطة) نەخشە[209]

**.82** (تَعافي) چيە؟ چاكبونەوەيە[210]

(اِضطهاد) ماناى چەوساندنەوەيە[211]

**.83** (بَيِّن)، (واضِح) روون[212]، (صَريح) راشكاو[213]

---

[205]جمع الجمع نخيل، مفرد نخْلة.

جنوب العراق مشهور بالنخل.

باشورى عيراق بە دارخورما بەناوبانگە.

[206]جمع الجمع تُمور وتُمْران، مفرد تَمْرة.

شرب الشاي مع التمر مضرّ للصحة.

خواردنەوەى چا لەگەڵ خورمادا زيانبەخش بۆ تەندروستى.

[207]يلعب الأطفال في فِناء البيت.

منداڵەكان لەحەوشەى ماڵەكەدا ياريدەكەن.

اقتحم عدد من الجنود اليهود باحة المسجد الأقصى.

ژمارەيەك لەسەربازە جولەكەكان هەڵيانكوتايە سەر حەوشەى مزگەوتى ئەقسا.

[208]جمع خُطَط

تمّ وضع خُطَّة دوليّة لمكافحة الإرهاب.

پلانێكى نێودەوڵەتى دانرا بۆ لەناوبردنى تيرۆريزم.

[209]هل تستطيع رسم خارطة إقليم كردستان؟

ئايا دەتوانيت نەخشەى هەرێمى كوردستان بكێشيت؟

[210]بعد تعافيك من المرض سأزورك لمناقشة الموضوع.

پاش چاكبونەوەتە لەنەخۆشييەكە، بەمەبەستى تاووتوێكردنى بابەتەكە، سەردانت دەكەم.

[211]جمع اضطهادات

لا يزال الشَّعبُ الكردي يتعرَّض لاضطهادات كثيرة.

تائێستاش گەلى كورد روبەڕوى چەوساندنەوەگەلى زۆر دەبێتەوە.

[212]كلامي بَيّنٌ، لا أحبّك.

قسەكەم روونە، خۆشم ناوێيت.

الخطّة غير واضِحة.

پلانەكە روون نيە.

[213]جمع صرائحُ وصِرَاح وصُرَحاءُ

(نادِر) دەگمەنە[214]، (شائِع) ماناى باو[215]

**84.** (صدَرَ) دەرچوو[216]، سەرچاوە (مَصْدَر)[217]

(أمام) لەبەردەم[218]، (إزاء) بەرامبەر[219]

**85.** (فَخّ) و (مِصْيَدة) هەردوو تەڵەیە[220]

(بَثْرة) زیپکەیە[221]، (بُقْعَة) پەڵەیە[222]

---

هو صريح في كلامه و اراءه.

ئەو لەقسەو بۆچونەکانیدا راشکاوە.

[214] جمع نوادِرُ، مؤ نادِرة، جمع مؤ نادِرات ونوادِرُ

هذا الحيوان نادر جداً.

ئەم گیاندارە زۆر دەگمەنە.

[215] إستخدام الكتنولوجيا لأغراض فاسدة في مجتمعنا  شائع جداً.

بەکارهێنانی تەکنۆلۆجیا بۆ مەبەستی خراپ لەکۆمەڵگەکەمان، زۆر باوە.

[216] صدَرَ يَصدُر صُدورًا وصَدْرًا.

الشهر الماضي صدَر العددُ الأوّل من المجلّة.

مانگی رابردوو یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە دەرچوو.

[217] جمع مَصادِر

مصدر خبرك غير موثوق.

سەرچاوەی هەواڵەکەت متمانەپێکراو نیە.

[218] رأيته واقفًا أمام المسجد.

بینیم لەبەردەم مزگەوتەکەدا وەستابوو.

لن تتوقف المرأة عن طلب المساواة حتى ترى الرجل يلد أمامها!. آل باتشينو.

ژن لەداواکردنی یەکسانی لەگەڵ پیاو کۆڵنادات تا بە چاوە گەشەکانی خۆی نەبینێت پیاو لەبەردەمیدا منداڵی دەبێت!!!

[219] بيتُه إزاء بيتي.

ماڵەکەی بەرامبەر ماڵەکەمە.

[220] وقع العصفور في الفخّ.

چۆلەکەکە کەوتەناو تەڵەکەوە.

هل تستطيع صنع مصيدة بسيطة لرحلتنا؟

ئایا دەتوانیت تەڵەیەکی سادە دروستبکەیت بۆ گەشتەکەمان؟

[221] جمع بَثَرات وبَثْرات وبَثْر، جمع الجمع بُثور.

هناك بثرة كبيرة في وجهك.

.86 (أغلى) گرانكرد، وەك (سلَقَ)ش كوڵاند[223]

(حرَقَ)، (أحرقَ) بەماناى سوتاند[224]

.87 (غَفير)و (خَفير) هەردوو پاسەوان[225]

(غَفير) زۆريشە[226]، (راعِي) ماناى شوان[227]

.88 (هَشيم) هەم لاواز، هەم پوش و پەڵاش[228]

---

دەموچاوت زيپكەيەكى گەورەى تێدايە.

[222] جمع بُقَع

علاج البقع الجلديّة سهل.

چارەسەرى پەڵەكانى سەر پێست ئاسانە.

[223] واتە وشەى (أغلى) بەماناى گرانكرد دێت، هەروەها هاوماناي وشەى (سلق)شە كە بەماناى كوڵاند دێت.

التاجر أغلى سعر البضائع.

بازرگانەكە نرخى شمەكەكانى گرانكرد.

أغلى الماءَ بنار سريعة.

بە ئاگرێكى خێرا ئاوەكەى كوڵاند.

زوجتي سلَق الطَّعامَ و قدّمته بسرعة.

هاوسەرەكەم خواردنەكەى كوڵاندو بەپەبە پێشكەشيكرد.

[224] الرجل الغاضب حرَق أوراقَ الملفِّ.

پياوە توڕەكە لاپەڕەكانى دۆسيەكەى سوتاند.

أحرقَتِ النَّارُ أغلب مناطق جسمه.

ئاگرەكە زۆربەى ناوچەكانى جەستەى سوتاند.

[225] هەردوكيان بەماناى پاسەوان دێن، واتە لەم مانايەدا موراديفى (حارس)ن.

أنا معجب بشجاعة غفيرك الشخصي.

من سەرسامم بە ئازايەتيى پاسەوانە تايبەتەكەت.

عُيِّن خفيرًا بمكتب الرئيس.

وەك پاسەوانى نوسينگەى سەرۆك دامەزرێنرا.

[226] واتە هەر ئەم وشەيە بەماناى زۆريش دێت.

حضر المبارة جمهوراً غفيراً.

جەماوەرێكى زۆر ئامادەى يارييەكە بوو.

[227] الراعي واجه الذئاب بشجاعة كثيرة.

شوانەكە بە ئازايەتييەكى زۆرەوە روبەڕوى گورگەكان بووەوە.

(جَنين) كۆرپەیە[229]، (مَشیمة) وێڵاش[230]

**89.** (رَحِم) منداڵدان[231]، (فَرْج)و (مَهْبَل) زێ[232]

(أَخْمَصُ القَدَم) ماناى بنى پێ[233]

**90.** (اليَوم) ئەمڕۆیە، (اللَيلة) ئەمشەو[234]

---

[228]بەماناى لاواز (لەڕوى جەستەییەوە)و پوش و پەڵاشیش دێت. پوش و پەڵاش: پاشماوەى وشكبوى رووەك.

كان الحارس رجلاً هشيماً.

پاسەوانەكە پیاوێكى لاواز بوو.

إشعال النار وسط الهشيم خطير للغاية.

ئاگركردنەوە لەناو پوش و پەڵاشدا ئەوپەڕى مەترسیدارە.

[229]جمع أجنَّة.

كۆرپە: منداڵ لەناو منداڵدان، واتە پێش لەدایكبون.

المرأة المطلّقة أجهضت جنينها.

ژنە تەڵاقدراوەكە كۆرپەكەى لەباربرد.

[230] جمع مَشيمات ومشايِمُ ومشِيم.

الجنين يتنفس فقط عبر المشيمة.

كۆرپە تەنها لەڕێگەى وێڵاشەوە هەناسەدەدات.

231 ج: أَرحام. ئەم وشەیە دەتوانرێت لەڕستەدا وەك نێرو مێش بەكاربهێنرێت.

أمراض الرحم شائعة.

نەخۆشییەكانى منداڵدان باون.

232 هەردوكیان بەماناى زێ دێن، بەڵام دووەمیان زیاتر بەماناى بەشى ناوەوەى دێت نەك دەرەوەى.

زێ= قوز.

ج فرج: فُروج. ج مهبل: مَهابِل.

حفظ فرج المرأة من الجنس المحرّم واجب على الكلّ.

پاراستى زێى ژن لەسێكسكردنى حەرام ئەركى هەموانە.

المهبل عضو حساس.

زێ ئەندامێكى هەستیارە.

233بەدیاریكراوى بەماناى ئەو بەشەى بنى پێ دێت كە لەكاتى رۆشتندا بەر زەوى ناكەوێت.

يرتعش الخائف من رأسِه حتى أَخْمَص قدمه أثناء الحرب.

ترسنۆك لەكاتى جەنگدا هەر لەسەرییەوە تا بنى پێى دەلەرزێت.

[234] اليوم أراك.

(رُؤية) بينينه[235]، (حُلْم)، (رُؤيا) خەو[236]

**91.** (شَجَّعَ) هاندا[237]، (مُشَجِّع) هاندەر[238]

(مُستاء) بێزاره[239]، (مُزعِج) بێزارکەر[240]

**92.** (عَبقريّ) چیه؟ واته بلیمەت[241]

---

ئەمڕۆ دەتبینم.

ستقام الليلة حفلة غنائية رائعة.

ئەمشەو ئاهەنگێکی نایابی گۆرانیوتن سازدەکرێت.

[235] جمع رُؤًى.

رؤية الهلال دليل على بداية و نهاية شهر رمضان.

بینینی مانگی یەکشەوە، بەڵگەیە لەسەر سەرەتاو کۆتایی مانگی رەمەزان.

[236] هەردوکیان بەمانای خەو دێن.

رأيت الليلة حلماً مخيفاً.

ئەمشەو خەوێکی ترسناکم بینی.

الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ، وَالرُّؤْيَا السَّوْءُ مِنَ الشَّيْطَانِ.

خەوی باش لەلایەن خوداوەیەو خەوی خراپ لەلایەن شەیتانەوەیە.

[237] شجَّعَ يشجِّع ، تشجيعًا ، فهو مُشجِّع ، والمفعول مُشجَّع.

شجَّع القائدُ الجنديَّ للقتال.

فەرماندەکە سەربازەکەی هاندا بۆ جەنگ.

[238] أنا مُشجِّع نادي برشلونة.

من هاندەری یانەی بەرشەلۆنەم.

[239] أنا مستاء منك بسبب سلوكك تجاه مديري.

بێزارم لێت بەهۆی رەفتارت بەرامبەر بەڕێوەبەرەکەم.

[240] ولدك مزعج جداً.

کوڕەکەت زۆر بێزارکەرە.

کان لأحول صديق مزعج جداً. فغيّر أحول رقم جواله ويرسل له رسالة برقمه الجديد قائلاً: لقد غيرت رقمي و أرتحت منك، من الان فصاعدا لن تستطيع إزعاجي.

فيجيبه صديقه برسالة نصية قائلاً: والله لأجدنّ رقمك لو كان تحت الأرض!

ئەحوَل هاوڕێیەکی زۆر بێزارکەری دەبێت. لەداخا رەقەم مۆبایلەکەی دەگۆڕێت و بە رەقەمە تازەکەی نامەیەکی بۆ دەنێرێت و دەڵێت: ئەوە رەقەمەکەم گۆڕی و نەجاتم بوو لەدەستت، ئیتر هەرگیز ناتوانیت ئیزعاجم بکەیت.

هاوڕێکەش لەوەڵامدا بۆی دەنوسێت: بەخودا لەژێر ئەرزیشدا بێت، رەقەمەکەت هەر دەدۆزمەوە!

(وَضَعَ) دانا[242]، (مَوْضوع)یش بابەت[243]

**93.** (زَميل) هاوكاره[244]، (صَديق) هاوڕێیە[245]

(ذَبْحة صدريّة) سنگەكوژێیە[246]

**94.** (وَرَقة) پەڕەیە[247]، (سَطْر) مانای دێڕ[248]

---

[241]جمع عَباقِرةُ، مؤ عبقريّة، جمع مؤ عبقريّات وعَباقِرةُ.

كان بيرەميرد شاعراً عبقريّاً.

پیرەمێرد شاعیرێكی بلیمەت بوو.

[242]وضَعَ، يضَع ، ضَعْ ، وَضْعًا ، فهو واضع ، والمفعول مَوْضوع.

وَضَعَ الكتاب على الأرض، فعاتبته.

كتێبەكەی لەسەر زەوی دانا، بۆیە گلەییم لێكرد.

243 جمع مَوْضُوعات ومَواضيعُ

قبل البرنامج يجب أن نتفق على موضوع الحوار.

پێش بەرنامەكە پێویستە لەسەر بابەتی گفتوگۆكە رێكبكەوێن.

[244] جمع زُمَلاء

هو زميلي في الدائرة.

ئەو هاوكارمە لەفەرمانگە.

[245] جمع أَصْدقاء، مؤ صديقة وصديق

أنت صديق عزيز.

تۆ هاوڕێیەكی ئازیزیت.

"الصديق الحقيقي هو من يمسك بيدك ويقول لك كل شيء سيكون على ما يرام." – مجهول

هاوڕێی راستەقینە ئەو كەسەیە كە دەستت دەگرێت و پێت دەڵێت هەموو شتێك باش دەبێت.

[246] سنگەكوژێ: جۆرە حاڵەتێكی نەخۆشییە كە تێیدا توشبوو ئازارێكی توند لەسنگیدا پەیدادەبێت.

ما هو الفرق بين الذبحة الصدريّة والسكتة القلبيّة؟

جیاوازی لەنێوان سنگەكوژێ و جەڵتەی دڵدا چیە؟

[247]جمع وَرَقات وأوراق ووَرَق.

يتكوّن الكتاب من 110 ورقة، أي 220 صفحة.

كتێبەكە لە 110 پەڕە پێكهاتووە، واتە 220 لاپەڕە.

[248]جمع أَسْطُر وسُطور وأسطار. جمع الجمع أساطير.

هناك خطأ كبير في السطر الثاني من الصفحة الثالثة.

دێڕی دووەمی لاپەڕەی سێیەم هەڵەیەكی گەورەی تێدایە.

(راكِب) سەرنشین[249]، (سائِق)یش شۆفێر[250]

**95.** (سِرّ) نهێنییه[251]، (كَنْز) گەنجینه[252]

(اِعتِداد بالنّفْس) بەخۆنازینه[253]

**96.** (نار) واته ئاگر[254]، (هامِد) كوژاوه[255]

(فَصیح)و (بَلیغ) زمانپاراوه[256]

---

[249]جمع راكبون ورُكّاب، مؤ راكِبة، جمع مؤ راكِبات ورواكب.

جرح جميع رُكّاب الحافلة في الحادثة.

لەڕوداوەكەدا سەرجەم سەرنشینانی پاسەكه برینداربون.

[250]جمع سائقون وساقة.

نجا سائق السيّارة في الهجوم.

شۆفێری ئۆتۆمبێلەكه لەهێرشەكه رزگاری بوو.

[251]جمع أسرار وسِرار.

إعط سِرّك لإمرأة خرساء، ستتكلّم بإذن الله!

نهێنییەكەت بده به ژنێكی لاڵ، به ئیزنی خوا دەكەوێته قسه!

[252]جمع كُنُوز.

موقع ويكيبيديا كنز من المعرفة.

ماڵپەڕی ویكیپیدیا گەنجینەیەكه لەزانیاری.

[253]بەخۆنازین= خۆ هەڵكێشان.

الاعتداد بالنفس سلوك شنيع.

بەخۆنازین، رەفتارێكی ناشرینه.

[254]جمع نِيران

هل تخاف من النار؟

لەئاگر دەترسیت؟

مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى الْكَذِبِ

هەركەسێك حەزدەكات سەیری ئاگر (ی دۆزەخ) بكات، با سەیری درۆ بكات.

[255]النار هامدة، فلا تخف.

ئاگرەكه كوژاوەیه، بۆیه مەترسه.

[256]هەردوكیان بەمانای زمانپاراو دێن.

زوجها خطيب فصيح.

مێردەكەی وتاربێژێكی زمانپاراوه.

**.97** (رائِد) پێشەنگە، کۆکەی (رُوَّاد)ە[257]

(دَیُّوث)و (قَوّاد) هەردوو گەوادە[258]

**.98** (أُغنیَة) چیە؟ مانای گۆرانی[259]

(عُمْدَة) سەرۆکە، هی شارەوانی[260]

**.99** (أَجْر) کرێیە، جەمعەکەی (أُجُور)[261]

(رَبیبة) زڕکچ[262]، (رَبیب)ە زڕکوڕ[263]

---

هو کاتب ناجح ولكنّه غير بليغ أثناء التحدّث.

ئەو نوسەرێکی سەرکەوتووە، بەڵام لەکاتی قسەکردندا زمانپاراو نیە.

[257] هەروەها بە (رائدون) و (رادَة)ش کۆدەکرێتەوە.

عادل إمام رائد في فنّ الكوميديا.

عادل ئیمام پێشەنگە لەهونەری کۆمیدیادا.

[258] هەردوکیان بەمانای گەواد دێن. گەواد: کەسێك پیاوی داوێنپیس پەیدابکات بۆ ژنی لەشفرۆش یان بۆ ژنی خۆی یان کەسوکاری.

الدَّیُّوثُ لا يدخل الجنّة.

گەواد ناچێتە بەهەشت.

كان زوجها قَوّاداً، لذا إنفصلت عنه.

مێردەکەی گەواد بوو، بۆیە لێی جیابووەوە.

[259] جمع أُغْنِيَات وأغانٍ.

لبهجت يحيى أغانٍ كثيرة.

بەهجەت یەحیا ژمارەیەکی زۆر گۆرانی هەیە.

[260] جمع عُمُدات وعُمْدات وعُمَد.

بەمانای سەرۆکی شارەوانی دێت.

عُمْدَةُ مدينة السليمانية رجل نزيه.

سەرۆکی شارەوانیی سلێمانی پیاوێکی پاکە.

[261] أعطوا الأجير أَجْره قبل أن يجفَّ عرقُه.

کرێی کرێکار بدەن، پێش ئەوەی عارەقەکەی وشکببێتەوە.

[262] جمع مؤ: ربيبات وربائِب

هي ربيبتها وليست إبنتها.

ئەو زڕکچیەتی، کچی نیە.

[263] جمع أَرِبَّاءُ وأَرِبَّة.

**.100** (ثِقَة) متمانەو خاوەن متمانە[264]

(خَطِيب) وتارخوێن، هەم دەزگیرانە[265]

**.101** (مُتخَلِّف) چیە؟ مانای دواکەوتوو[266]

(دَيْدَن)، (عادَة)، (دَأْب) هەرسێ واتای خوو[267]

**.102** (غِلاف) واتە بەرگ[268]، (فَحْوَى)یە کرۆك[269]

---

ربيبه ولد شجاع.

زڕکوڕەکەی کوڕێکی ئازایە.

[264] جمع ثِقات.

بەمانای متمانە دێت. هەروەها بەمانای کەسێکیش دێت کە خاوەن متمانە بێت، واتە ڕاستگۆ بێت و سیقەی پێبکرێتز

حاول أن لا تخسر الثقة لدى زملاءك.

هەوڵبدە متمانە لای هاوکارەکانت لەدەست نەدەیت.

علي الوردي مؤرّخ ثِقَة.

عەلی وەردی مێژونوسێکی خاوەن متمانەیە.

[265] ج: خُطباء

أعتقلت الشرطة خطيب المسجد.

پۆلیس وتارخوێنی مزگەوتەکەی دەستگیرکرد.

خطيبها مهندس ماهر.

دەزگیرانەکەی ئەندازیارێکی کارامەیە.

[266] إنه شخص متخلف جداً، لا أحبّ مناقشته.

بەڕاستی کەسێکی زۆر دواکەوتووە، حەزناکەم مشتومڕی لەگەڵدا بکەم.

[267] هەرسێکیان بەمانای خوو دێن.

الكذب من ديدن المنافقين.

درۆکردن خووی دووڕووەکانە.

الإستيقاظ من النوم مبكراً أحد أهم عاداتي.

زوو هەستان لەخەو یەکێکە لەگرنگترین خووەکانم.

التدخين دأب سيء.

جگەرەکێشان خوویەکی خراپە.

[268] جمع غِلافات وأَغْلِفة وغُلُف.

قرأت الكتاب من الغلاف الى الغلاف.

کتێبەکەم لەبەرگەوە بۆ بەرگ خوێندەوە.

(أبترْ) وەجاخکوێر[270]، (عَقیم)ە نەزۆك[271]

**103.** (شَریطة) چیە؟ واتە بەمەرجێ[272]

(زُقاق) کۆڵانە، هەم باریکەڕێ[273]

**104.** (شَعْب) واتە گەل[274]، (شِعْب) ڕێگا(ی ناوشاخ)[275]

(کأْس) و (قَدَح) هەردوکیان پەرداخ[276]

---

[269] جمع فحاوَى وفحاوٍ.

فهمت قصده من خلال فحوى رسالته.

لەڕێگەی کرۆکی نامەکەیەوە، لەمەبەستی تێگەیشتم.

[270] جمع بُتْر، مؤ بَتْراءُ، جمع مؤ بُتْر.

{إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ}.

بەڕاستی قینلەدڵەکانت وەجاخکوێرن.

[271] جمع عِقام وعُقَماءُ، مؤ عقيم وعقيمة، جمع مؤ عقائِمُ وعُقُم.

زوجها عقيم، لذا تطلب الطلاق.

مێردەکەی نەزۆکە، بۆیە داوای جیابونەوە دەکات.

[272] بەمەرجێ= بەمەرجێك.

اذهب إلى السينما شريطة أن تنتهي من مذاكرتك مبكرًا.

بڕۆ بۆ سینەما بەمەرجێك زوو سەعیکردنەکەت تەواوبکەیت.

[273] جمع أَزِقَّة.

بەمانای کۆڵان و باریکەڕێش دێت. باریکەڕێ: ڕێگای تەسك.

زقاقنا قريب من الجامعة.

کۆڵانەکەمان لەزانکۆوە نزیکە.

الأزِقَّة كثيرة في المناطق الشعبيّة.

ناوچە میلییەکان باریکەڕێی زۆر تێدایە.

[274] جمع الجمع شُعوب

الشعب الكردي شجاع.

گەلی کورد ئازایە.

[275] جمع شِعاب

هل تستطيع الذهاب في شعاب هذا الجبل؟

ئایا دەتوانیت بە ڕێگاکانی ناو ئەم شاخەدا بڕۆیت؟

[276] هەردوکیان بەمانای پەرداخ دێن، بەڵام یەکەمیان دەبێت خواردنەوەی تێدا بێت و دووەمیان دەبێت خاڵی بێت.

**.105** (مُستشار) چیه؟ واته راوێژكار[277]

(قُطْر) تیرەیە، جەمعەكەی (أقْطار)[278]

**.106** (اِنْتِشار) مانای بڵاوبونەوە[279]

(بَحْث)و (دِراسَة) لێكۆڵینەوە[280]

**.107** (قائِلَة)و (ظَهيرة) هەردوو نیوەڕۆ[281]

(جامِع) مزگەوتە[282]، (جامِعة) زانكۆ[283]

---

شربت كأساً من الماء بسرعة.

بەپەلە پەرداخێك ئاوم خواردەوە.

كسر الطفل القدح.

منداڵەكە پەرداخەكەی شكاند.

[277]قتل مستشار السفارة فی هجوم مسلّح.

راوێژكاری باڵیۆزخانەكە لەهێرشێكی چەكداریدا كوژرا.

[278]إيجاد قُطْر الدَّائرة عمل بسيط.

دۆزینەوەی تیرەی بازنە كارێكی ئاسانە.

279 اِنتِشار فايروس كورونا يهدد البشرية.

بڵاوبونەوەی ڤایرۆسی كۆرۆنا هەڕەشە لەمرۆڤایەتی دەكات.

280نشر بحثي عن أسباب المرض في المجلة.

لێكۆڵینەوەكەم لەسەر هۆكارەكانی نەخۆشییەكە، لەگۆڤارەكەدا بڵاوكرایەوە.

دِراسة جديدة تؤكد على خطر مرض السكّري.

لێكۆڵینەوەیەكی نوێ جەخت لەسەر مەترسیی نەخۆشیی شەكرە دەكاتەوە.

[281]ينام والدي في القائِلة كلّ يوم.

باوكم هەموو رۆژێك لەنیوەڕۆدا دەخەوێت.

مكث في البيت حتى الظَّهيرة.

تا نیوەڕۆ لەماڵدا مایەوە.

[282]جمع جامعون وجَوَامعُ

الجامع كبير جداً.

مزگەوتەكە زۆر گەورەیە.

[283]جمع جامعات

هل تستطيع التدريس في الجامِعة؟

108. (نائِب) هەم جێگر، هەم پەرلەمانتار[284]

(بِئْر) واتە بیر، جەمعەکەی (أَبْآر)[285]

109. (مُطرِب)، (مُغَنّي) گۆرانیبێژە[286]

(قَصیر) کورت[287]، (طَوِیل) مانای درێژە[288]

110. (مُتحدِّث) چیە؟ واتە وتەبێژ [289]

---

ئایا دەتوانیت لەزانکۆ وانە بڵێیتەوە؟

[284] جمع نائبون ونُوَّاب، مؤ نائبة، جمع مؤ نائبات ونوائبُ (لغير العاقل)

تولّى نائب المدير العمل.

جێگری بەڕێوەبەر کارەکەی گرتەدەست.

هو نائب عن الحزب الوطني الحاكم.

ئەو پەرلەمانتارێکی پارتی نیشتمانیی فەرمانڕەوایە.

[285] هەروەها بە (آبار) و (أبْؤُر) و (بئار)یش کۆدەکرێتەوە. ئەم وشەیە دەتوانرێت بەشێوەی نێرو مێش بەکاربهێنرێت.

هذا البئرُ عميق.

ئەم بیرە قوڵە.

[286] هەردوکیان بەمانای گۆرانیبێژ دێن.

ناظم الغزالي مُطرِب مشهور.

نازم غەزلی گۆرانیبێژێکی بەناوبانگە.

ألقي القبض على المغني بتهمة إمتلاك المخدّرات.

گۆرانیبێژەکە بەتۆمەتی پێبونی ماددەی هۆشبەر دەستگیرکرا.

[287] جمع قِصار وقُصَراءُ، مؤ قصيرة، جمع مؤ قصيرات وقصَائِرُ وقِصار

الحياة قصيرة غير أنّها حلوة.

ژیان کورتە، بەڵام شیرینە.

[288] جمع طِوَال

الحبل طَوِيل.

گورسیەکە درێژە.

تمتلك كندا أطول ساحل بين جميع دول العالم، حيث يمتد على طول 202,080 كيلومترًا (125,567 ميلًا). تمتلك أيضًا عددًا من البحيرات يفوق عدد جميع البحيرات الأخرى في العالم مجتمعة.

کەنەدا خاوەنی درێژترین کەناراوە لەجیهاندا کە درێژییەکەی 202 هەزارو 80 کیلۆمەترە. هەروەها ژمارەی دەریاچەکانی ئەم وڵاتە لەکۆی دەریاچەکانی سەرجەم وڵاتەکانی تری جیهان پێکەوە زیاترە.

[289] نفى المُتحدِّث الرسمي بإسم الحكومة الخبر.

(شريحة) پلە، دێش بەمانای توێژ[290]

**.111** (حسَمَ) بەمانای یەکلاکردەوە[291]

(حاسِم) بەواتای یەکلاکەرەوە[292]

**.112** (مِخطَم) و (مِنْقَار) هەردوکیان دەنوك[293]

(عَريس) زاوایە[294]، (عَروس) واتە بوك[295]

**.113** (خِنَّابَة)، (كِبْر) خۆبەزلزانین[296]

---

وتەبێژی رەسمیی حکومەت هەواڵەکەی رەتکردەوە.

[290] جمع شريحات وشرائح

دوان لەدیارترین ماناکانی پل و توێژن. پل: پارچە.

أكل الكلب شريحة من اللحم.

سەگەکە پلێك لەگۆشتەکەی خوارد.

الموّظفون شريحة واسعة من المجتمع الكردي.

فەرمانبەران توێژێکی فراوانی کۆمەڵگەی کوردین.

[291] حسَمَ يَحسِم ، حَسْمًا ، فهو حاسم ، والمفعول مَحْسوم.

یەکلاکردەوە: بڕاندەوە.

حسم المحامي القضيّة لصالح موّكله.

پارێزەرەکە کێشەکەی لەبەرژەوەندی بریگرتەکەی یەکلاکردەوە.

[292] المشكلة بحاجة الى قرار حاسم من قبل الرئيس.

کێشەکە پێویستی بە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە هەیە لەلایەن سەرۆکەوە.

[293] الطائر له مخطم طويل.

باڵندەکە دەنوکێکی درێژی هەیە.

ضرب الطائر الطفل بمنقاره.

باڵندەکە بە دەنوکی لەمنداڵەکەی دا.

[294] جمع عِرْسان و عروس

العريس طلّق عروسه بعد اسبوع واحد من الزواج.

زاواکە پاش هەفتەیەك لەهاوسەرگیری، بوکەکەی تەڵاقدا.

[295] جمع عُرُس وعِرْسان

العروس جميلة جداَ.

بوکەکە زۆر جوانە.

(بُسْتان) واته باخ، کۆکەی (بساتین)[297]

**114.** (حِصار) ئابڵوقه[298]، (حَصیر) حەسیره[299]

(صَمْغ) واته زەمق[300]، (غِراء) کەتیره[301]

**115.** (بالمَرّة) چیه؟ بەهیچ شێوەیەك[302]

(صارِخ) واته زەق[303]، (صاروخ)ە موشەك[304]

---

[296]هەردوکیان بەمانای خۆبەزلزانین دێن. خۆبەزلزانین= لوتبەرزی.

الخِنّابة تدّمر الانسان.

خۆبەزلزانین مرۆڤ لەناودەبات.

لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ.

هەرکەسێك ئەوەندەی گەردێك خۆبەزلزانین لەدڵیدا هەبێت، ناچێتە بەهەشت.

[297]أصبحت بساتين القرية منتجعات للزوّار.

باخەکانی گوندەکە بونەتە هاوینەرهەوار بۆ میوان.

[298]الحصار الإقتصادي دمّر العراق.

ئابڵوقەی ئابوری عیراقی لەناوبرد.

[299]الجمع : حُصُرٌ ، أحْصِرَةٌ ، حَصَائِرُ

حەسیر: راخەری دروستکراو لەبەرهەمی رووەك.

هل تستطيع النوم على الحصير؟

دەتوانیت لەسەر حەسیر بخەویت؟

[300]جمع الجمع صُمُوغ، مفرد صَمْغة.

استعمل الصَمْغ لإلصاق الورقة بالحائط.

بۆ لکاندنی وەرەقەکە بە دیوارەکەوە، زەمق بەکاربهێنە.

[301]جمع أَغْراء، غَرا، غِرا.

للغراء رائحة كريهة.

کەتیرە بۆنێکی ناخۆشی هەیە.

[302]هي لم تجب أسئلته بالمَرّة.

ئەو بەهیچ شێوەیەك وەڵامی پرسیارەکانی نەدایەوە.

[303]زەق: زۆر روون و ئاشکرا.

كان جوابه إعترافاً صارخاً بالجريمة.

وەڵامەکەی دانپێدانانێکی زەق بوو بە تاوانەکە.

[304]جمع صواريخ

**.116** (شُهاق) چیه؟ كۆكەڕەشە[305]

(أَهوَج) و (طائِش) هەردوو هەڵەشە[306]

**.117** (أَثْرَد) چیه؟ لێوقڵیشاو[307]

(كُحْلِيّ) كلساز، هەم شینی رەشباو[308]

**.118** (بلَغَ) گەیشت[309]، (مَبْلَغ)یش بڕە[310]

(نَیص) لەگەڵ (شَیهَم) هەردوو سوچڕە[311]

---

موشەك= رۆكێت

أسقطت الطائرة بواسطة صاروخ مضادّ للطائرات.

فڕۆكەكە بەهۆی موشەكێكی دژەفڕۆكەوە خرایه خوارەوە.

[305]الشهاق مرض مزعج.

كۆكەڕەشە نەخۆشییەكی بێزاركەرە.

[306]هو رجل أهوج، لا أثق به.

ئەو پیاوێكی هەڵەشەیە، متمانەی پێناكەم.

الإنسان الطائش لا يفكّر.

مرۆڤی هەڵەشە بیرناكاتەوە.

[307]الجمع : ثُرْد ، المؤنث : ثَرْدَاء ، و الجمع للمؤنث : ثُرْد

الأثرد لايستطيع الضحك.

لێوقڵیشاوەكە ناتوانێت پێبكەنێت.

[308]بەمانای كلسازو شینی رەشباویش دێت. كلساز: ئەو كەسەی كل دروستدەكات.

الكُحليّ غنيّ جدّاً.

كلسازەكە زۆر دەوڵەمەندە.

إرتديت قميصي الكُحليّ للحفلة.

بۆ ئاهەنگەكە كراسە شینە رەشباوەكەم لەبەركرد.

[309] بلَغَ يَبلُغ، بُلوغًا وبَلاغًا ، فهو بالِغ.

بلَغ النَّبأُ الرئيس فور وقوعه.

هەواڵەكە دەسبەجێ لەگەڵ رودانیدا گەیشتە سەرۆك.

[310]فقدت مَبْلغاً من المال فی السوق.

لەبازاڕ بڕێك پارەم ونكرد.

[311] هەردوكیان بەمانای سوچڕ دێن كە گیاندارێكی دڕكاوییەو گۆشتیشی دەخورێت.

.119 (مُستَهلِك چيه؟ واته بەكاربەر[312]

(حارّ) گەرم و تونه[313]، (فُلْفُل)يش بيبەر[314]

.120 (والِد) باوكه[315]، (والِدة) داكه[316]

(خائِن)و (خَوّان) هەردوو ناپاكه[317]

.121 (مُدرِّب) چيه؟ واته راهێنەر[318]

---

حاول أن لا تقترب من النيص، إنّه خطير.

هەوڵبده لەسوچڕەكه نزيك نەبيتەوه، بەڕاستى مەترسيداره.

هل أكلت لحم الشَيهَم؟

گۆشتى سوچڕت خواردووه.

[312] بكەرى (استهلك)يه.

حياة مستهلِكي الوجبات السريعة في خطر.

ژيانى بەكاربەرانى خواردنه خێراكان، لەمەترسيدايه.

يستهلك الإنترنت كمية هائلة من الكهرباء، تعادل 10% من إجمالي استهلاك الكهرباء في العالم.

ئينتەرنێت بڕێكى ئێجگار زۆر كارەبا بەكاردەبات، كه دەكاته لەسەدا 10ى كۆى هەموو ئەو كارەبايەى لەجيهاندا بەكاردەبرێت.

[313]الماء حارٌّ، لا أحبّه.

ئاوەكه گەرمه، حەزم لێى نيه.

هل تستطيع أكل الفلفل الحارّ.

دەتوانيت بيبەرى توون بخۆيت؟

[314]لا أحبّ الفُلْفُل.

حەزم لەبيبەر نيه.

[315]والدي فَلاَّح.

باوكم جوتياره.

[316]داك= دايك

والدتي إمرأة ذكيّة.

دايكم ژنێكى زيرەكه.

[317]هەردوكيان بەماناى ناپاك دێن، بەڵام دووەميان شێوگى موبالەغەيه، واته ناپاكييەكەى زۆرەو زياتره لەوەى يەكەميان.

كان زوجها خائناً، لذا طلبت الطلاق.

مێردەكەى ناپاك بوو، بۆيه داواى جيابونەوەى كرد.

الخَوّان لا تكفيه إمرأة واحدة.

ناپاك ژنێك بەشى ناكات.

(قَرين) هاوتايه، هاوسەر، برادەر[319]

**122.** (عُقْرُبان) دوپشك، بەڵام نێر نەك مێ[320]

(مِئْناث) كەسێكە، بەس كچی ئەبێ[321]

**123.** (مُصطلَح) چيه؟ واتە زاراوە[322]

(خَرِير) پرخە(ی خەو)، هەم خوڕە(ی ئاوە)[323]

**124.** (ثَلْج) بەفر[324]، (وَدْق)، (غَيْث)، (مَطَر) باران[325]

---

[318] استقالَ مدرِّب النادي بعد الهزيمة.

پاش شكتەكە، ڕاهێنەری یانەكە دەستی لەكاركێشايەوە.

[319]بەو سێ مانايە دێت.

جمع قُرَناءُ، مؤ قرينة، جمع مؤ قرينات وقرائِنُ.

هو قرينه في الشجاعة والذكاء.

ئەو هاوتايەتی لەئازايەتی و زيرەكيدا.

خرجت مع قرينها.

لەگەڵ هاوسەرەكەيدا دەرچوو.

إيّاك وقرين السوء.

ورياى برادەری خراپ بە.

[320]بەمانای دوپشكی نێر دێت.

هل تخاف من العُقرُبان؟

ئايا لەدوپشكی نێر دەترسيت؟

[321]زوجته مِئناث لذا قرّر الزواج الثاني.

ژنەكەی تەنها كچی دەبێت (نەك كوڕ)، بۆيە بڕياری هاوسەرگيريی دووەمی دا.

[322]جمع مصطلحات

لا أفهم معنى هذا المصطلح الطبيَّ.

لەمانای ئەم زاراوە پزيشكييە تێناگەم.

[323]أيقظني خرير الماء.

خوڕەی ئاوەكە خەبەری كردمەوە.

خريره أثناء النوم يزعجني كثيراً.

پرخەكەی لەكاتی خەودا زۆر بێزارمدەكات.

[324]جمع الجمع ثُلُوج،مفرد ثَلْجَة

(تجوُّل)، (تَجْوَال) هەردوكیان گەڕان[326]

**125.** (عاصِفة) چیە؟ واتە گەردەلول[327]

(زَوج)و (بَعْل) مێرد، كۆی دووەم (بُعُول)[328]

**126.** (جَلَد)، (لَدَغ)، (لَسَعَ) پێوەدا[329]

---

تساقط الثلج يبيّض الجبال.

بارینی بەفر شاخەكان سپیدەكات.

[325] یەكەم و سێیەمیان بەمانای باران بەگشتی دێت، بەڵام دووەمیان زیاتر بەمانای بارانێك دێت كە خێرو بەرەكەت بێت.

هل عندك قصيدة حول الودق؟

ئایا قەسیدەت هەیە سەبارەت بە باران؟

نزل الغيثُ ففرحت المدينة.

باران باری و شارەكە دڵخۆش بوو.

الشعراء يحبّون المطر أكثر منّا.

شاعیران لەئێمە زیاتر حەزیان لەبارانە.

[326] حظر التجوال عملية ضرورية ضد الوباء.

قەدەغەكردنی گەڕان كارێكی پێویستە لەدژی پەتاكە.

التجوُّل فى الجبال له طعم خاص.

گەڕان بە شاخدا تامێكی تایبەتی هەیە.

[327] جمع عاصفات وعَوَاصِفُ

هبَّت عاصِفةٌ ثلجيّة.

گەردەلولێكی بەفرین هەڵیكرد.

[328] واتە هەردوو وشەی (زوج)و (بعل) بەمانای مێرد دێن. كۆی وشەی دووەمیان، واتە جەمعی وشەی دووەمیان كە (بعل)ە، دەبێتە (بعول).

علاقتها مع زوجها ضعيفة.

پەیوەندیی ئەو لەگەڵ مێردەكەیدا لاوازە.

بعلها تاجر ثري.

مێردەكەی بازرگانێكی دەوڵەمەندە.

[329] هەرسێكیان لەم مانایەدا هاومانان.

جَلَدَتْهُ حَيَّةٌ سوداء.

ڕەشمارێك پێوەیدا.

لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ.

(مَرْكَز) بنكەیە[330]، (مَقَرّ) بارەگا[331]

127. (أبو بُريص) چیە؟ ماناى مارمێلکە[332]

(سِحليّة) قۆڕى[333]، (أَرْنَب) کەروێشکە[334]

128. (أُسْطورة) چیە؟ واتە ئەفسانە[335]

(إضاعة) ماناى بەفیڕۆدانە[336]

129. (زُحار) زەحیرى[337]، (إسهال)ە سکچون[338]

---

بڕوادار دووجار لەیەك كونەوە پێوەى نادرێت.

لَسَعَتهُ عَقْرَب سامّ، لذا مات في اليوم التالي.

دوپشکێکی ژەهراوی پێوەیدا، بۆیە ڕۆژی دواتر مرد.

[330]جمع مراكز

مركز الشرطة قريب من بيتنا.

بنکەی پۆلیسەکە لەماڵەکەمانەوە نزیکە.

[331]جمع مقرّات ومقارٌّ

قتل الرئيس في مقرّه.

سەرۆك لەبارەگاکەی خۆیدا کوژرا.

[332]أبو بريص حيوان زاحف.

مارمێلکە گیاندارێکی خشۆکە.

[333]ما هو تفسير رؤية السحليّة في المنام؟

لێکدانەوەی بینینی قۆڕی لەخەودا، چیە؟

[334]جمع أَرانِبُ وأَرانٍ

رؤية الأرنب البني في المانم يدلّ علي أنّك تتجه نحو المسار الصحيح للعمل في الحياة .

بینینی کەروێشکی قاوەیی لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تۆ دەڕۆیتەسەر ڕێڕەوێکی ڕاستی کارکردن لەژیاندا.

[335]جمع أُسْطورات وأساطير.

العلم يهدم الأساطير.

زانست ئەفسانەکان لەناودەبات.

[336]إضاعة الوقت أخطر من إضاعة المال.

بەفیڕۆدانی کات لە هی سامان مەترسیدارترە.

[337]زەحیری: جۆرە نەخۆشییەکە کە بەهۆیەوە توشبوو پیسایی بەشێوەی پچڕپچڕ دەکات و زۆربەی پیساییەکەی خوێن دەبێت و ئازاریشی لەگەڵدا دەبێت.

(عَنِيَ)ماندوبوو[339]، (عَنَاء) ماندوبون[340]

**.130** (فَطير) چيه؟ هەڵنەهاتوو[341]

(نَزور) كەممنداڵ، هەروەها كەمدوو[342]

**.131** (رَكايا) "بير"ە، بەڵام كۆ نەك تاك[343]

(بَريء الذِّمَّة) ماناى ئەستۆپاك[344]

**.132** (باكورَة) چيه؟ واتە نۆبەرە[345]

---

هل أصبت بالزُحار؟

توشى زەحيرى بويت؟

[338]ما هو علاج الإسهال؟

چارەسەرى سكچون چيه؟

[339]عنِيَ في يَعنَى ، اعْنَ ، عَناءً وعَنًى ، فهو عانٍ ، والمفعول مَعْنِيٌّ فيه.

بەماناى ماندوبونێك دێت كە زۆر بێت كە ماندوبونى كەم: شەتەكبوو.

عنِي في كتابة بحثِه كبيراً.

لەنوسينى لێكۆڵينەوەكەيدا زۆر ماندوبوو.

[340] الصمت عبادة بدون عناء.

بێدەنگى پەرستشێكى بێ ماندوبوونە.

[341]العجين الفطير لا يصلح للخبز.

هەويرى هەڵنەهاتوو بۆ نان ناشێت.

[342]الجمع : نُزُر. كەمدوو= كەمقسە.

زوجته نَزُور.

ژنەكەى كەممنداڵە. واتە منداڵى كەم هەيە، يان منداڵى كەم دەبێت.

هو رَجُلٌ نَزُور.

ئەو پياوێكى كەمدووە.

[343]تاكەكەى (رَكيّة)يە. هەروەها بە (رُكِيّ)يش كۆدەكرێتەوە.

الرَّكِيَّةُ غير بعيدة من هنا.

بيرەكە لێرەوە دوور نيە.

[344]ئەستۆپاك: كەسێك كە هيچ قەرزو مافێكى رەسمى و نارەسمى لا نەبێت.

رغم أنّه بريء الذِّمَّة، ولكنّ المدير لا يسمح له بالنّقل.

هەرچەندە ئەو ئەستۆپاكە، بەڵام بەڕێوەبەر رێگەى گواستنەوەى پێنادات.

(مُؤسِّس) ماناى دامەزرێنەرە[346]

133. (أَزْعر) بەدڕەوشت، هەم كلكبڕاو[347]

(حَسيس) هەستبەهێز، وەك (مَقْتول) كوژراو[348]

134. (اِتِّجاه) چيە؟ ماناى ئاڕاستە[349]

(كَلِمة) وشە[350]، (جُملة) كۆو رستە[351]

---

[345] جمع باكورات وبَواكير.

نۆبەرە: يەكەم بەرهەم.

هذا الاختراع باكورَة الشركة.

ئەم داهێنانە نۆبەرەى كۆمپانياكەيە.

[346] مات مُؤسِّس المنظّمة قبل ثلاث سنوات من الان.

دامەزرێنەرى رێكخراوەكە سێ ساڵ بەر لەئێستا مرد.

[347] جمع زُعْر، مؤ زَعْراءُ، جمع مؤ زَعْراوات وزُعْر

هو رجل أَزْعر، فلا تقترب منه.

ئەو پياوێكى بەدڕەوشتە، بۆيە لێى نزيك مەبەرەوە.

هاجمني كلبه الأَزْعر.

سەگە كلبڕاوەكەى پەلامارىدام.

[348] واتە ئەم وشەيە بەماناى هەستبەهێز دێت، سەربارى ئەوەش هەروەك وشەى (مقتول) بەماناى كوژراويش دێت. هەستبەهێز: مرۆڤێك يان زيندەوەرێك كە هەستى بەهێز بێت.

من الأفضل أن لا تخالط ذلك الحسيس كثيراً.

باشتر وايە زۆر تێكەڵاوى ئەو هەستبەهێزە نەبيت.

الحَسِيس شابّ من أهالي المدينة.

كوژراوەكە گەنجێكى خەڵكى شارەكەيە.

الرجل المقتول غير معروف.

پياوە كوژراوەكە نەناسراوە.

[349] إذهب بإتجاه الجنوب.

بەئاڕاستەى باشور برۆ.

[350] جمع كَلِمات وكَلِم

الجملة تكوّنت من كلمة واحدة فقط.

رستەكە لەتەنها يەك وشە پێكهاتووە.

ما هو جمع كلمة "مُفرد"؟ (مُفردات، مُفرد، مُفردون، مُفردين)

**.135** (تبادُل) چیه؟ ماناى ئاڵوگۆڕ[352]

(جَرّار) تراكتۆر، دێش بەماناى زۆر[353]

**.136** (عَرَضْ) نیشانە، جەمعەكەى (أعراض)[354]

(نَخّاس) كۆیلەفرۆش، هەروەها جامباز[355]

**.137** (مُتَّهَم) چیه؟ ماناى تۆمەتبار[356]

(سُور) واتە پەرژین، جەمعەكەى (أَسْوار)[357]

---

كۆى وشەى "مُفرد" چیه؟ مفردات

[351]جمع جُمْلات وجُمَل.

بەماناى كۆ (پێچەوانەى تاك) و رستەش دێت.

هل تبیعني القمیص بسعر الجملة؟

ئایا كراسەكەم بە نرخى كۆ پێدەفرۆشیت؟

تكوین الجملة الإسمیة أسهل من نظیرتها الخبریة.

دروستكردنى رستەى ناوى لەهاوتا كارییەكەى ئاسانترە.

[352]تبادُل الأسرى بین الدولتین عمل إنساني.

ئاڵوگۆڕى دیلەكان لەنێوان هەردوو وڵات، كارێكى مرۆییە.

[353]هل تعلم سیاقه الجرّار؟

دەزانیت تراكتۆ لێبخوڕیت؟

هاجم جیش جرّار المدینة.

سوپایەكى زۆر پەلامارى شارەكەى دا.

[354]بەتایبەتى بەماناى نیشانەى نەخۆشى دێت.

ما هي أعراض فقر الدَّم؟

نیشانەكانى كەمخوێنى چین؟

[355] جامباز: فرۆشیارو دەلالى مەڕو ماڵات و وڵاخ

باع النَّخَّاسُ جمیع عبیده و تاب.

كۆیلەفرۆشەكە سەرجەم كۆیلەكانى فرۆشت و تۆبەیكرد.

النَّخَّاسُ رجل نصّاب.

جامبازەكە پیاوێكى قۆڵبڕە.

[356]المتّهم بريء حتّى تثبت جریمته.

تۆمەتبار بێتاوانە تا ئەو كاتەى تاوانەكەى دەسەلمێنرێت.

**138.** (تَوزيع) وەك (تَقسيم) دابەشكردنە[358]

(اغتِصاب) مانای لاقەكردنە[359]

**139.** (قَرْقرة) چیە؟ قۆڕەو گارەگار[360]

(مَحْضَر) كۆنوسە، وەك (سِجِلّ) تۆمار[361]

**140.** (مَحْضَر) چیە؟ ئامادەبوون[362]

(نَجْد) ڕێگایە، بەس ئاشكراو روون[363]

---

[357]بنيت سوراً متيناً لحديقتي الجديدة.

پەرژینێكی قایمم بۆ باخچە نوێكەم دروستكرد.

[358]هەردوكیان بەمانای دابەشكردن دێن.

توزيع الغذاء مجاناً على الفقراء واجب كلّ تاجر مسلم.

دابەشكردنی خۆراك بەبێ بەرامبەر بەسەر هەژاراندا، ئەركی هەموو بازرگانێكی موسڵمانە.

هل تستطيع تقسيم الهدايا على المشاركين؟

ئایا دەتوانیت دیارییەكان بەسەر بەشداربووەكاندا دابەش بكەیت؟

[359]اغتصاب جريمة كبيرة.

لاقەكردن تاوانێكی گەورەیە.

[360]دوان لەدیارترین ماناكانی ئەم وشەیە قۆڕە(ی سك)و گارەگار(ی مریشك و هاوشێوەكانی)ن.

قرقرة الوضوء لا تفسد الوضوء.

قۆڕەی سك دەسنوێژ ناشكێنێت.

هل تزعجك قرقرة الدجاج؟

ئایا گارەگاری مریشك بێزارتدەكات؟

[361]واتە وشەی (مَحضَر) بەمانای كۆنوس دێت، هەروەها هاومانای (سِجِلّ)یشە كە بەمانای تۆمار دێت.

لقد كُتب محْضَر اجتماع مجلس الوزراء بسرعة.

كۆنوسی كۆبونەوەكەی ئەنجومەنی وەزیران بەخێرایی نوسرا.

هل قرأت مَحْضَر وفيات اليوم.

ئایا تۆماری مردووەكانی ئەمڕۆت خوێندەوە؟

لم يكن إسمه موجوداً في سِجِلّ المواليد.

ناوی لەتۆماری لەدایكبواندا نەبوو.

[362]قرّرت الخطوة اللازمة بمحضر جميع أعضاء الحزب.

بە ئامادەبونی سەرجەم ئەندامانی حزب، بڕیار لەسەر هەنگاوی پێویست درا.

**.141** (مِيراث)، (تَرِكة) هەردوكيان ميرات[364]

(قاضٍ) دادوەرە، جەمعەكەی (قُضاة)[365]

**.142** (سُحْت) چيە؟ ماڵی حەرام[366]

(هَرَمْ) قوچەكە، جەمعەكەی (أهرام)[367]

**.143** (عَقيلة) هاوسەر[368]، (أرمَل) بێوەپیاو[369]

(مَغمور)و (مَجهول) هەردوو نەناسراو[370]

---

[363] جمع أنْجاد ونِجَاد ونُجُود

بەمانای ڕێگایەك دێت كە روون و ئاشكرا بێت.

إذهب على النجد.

لەسەر ڕێگای روون بڕۆ.

[364] قسَّموا ميراثَ أبيهم بالتَّساوي.

ميراتەكەی باوكيان بە یەكسانی دابەشكرد.

هل أخذت نصيبك من التَّرِكةَ؟

ئايا بەشی خۆت وەرگرت لەميراتەكە؟

[365] هەروەها بە (قاضون)يش كۆدەكرێتەوە.

والدي قاضٍ مشهور.

باوكم دادوەرێكی بەناوبانگە.

[366] جمع أسْحات

لا تعش على السّحت.

لەسەر ماڵی حەرام مەژی.

[367] جمع الجمع أهرامات

أهرام مصر مشهورة.

قوچەكەكانی ميسر بەناوبانگن.

[368] جمع عقائِل. بەمانای هاوسەری مێ (ژن) دێت و زیاتر لەبۆنە ڕەسمییەكاندا بەكاردەهێنرێت.

وصل السَّيِّد الرَّئيس وعقيلتُه.

بەڕێز سەرۆك و هاوسەرەكەی گەیشتن.

[369] جمع أَرامِلُ وأرامِلَة.

شقيقي أرمل متديّن، حاول أن تجد له امرأة مناسبة.

براكەم بێوەپیاوێكی دیندارە، هەوڵبدە ژنێكی گونجاوی بۆ بدۆزیتەوە.

**144.** (فَلاة) وەك (بَيْداء) چۆڵەوانییە[371]

(خَلّ) سرکە[372]، (خِلّ)یش هاوڕێی گیانییە[373]

**145.** (حانَ) کاتیهات، هەروەها تیاچوو[374]

(بَطِرَ) بەمانای لەخۆبایی بوو[375]

**146.** (صَرِير) چیە؟ جیڕە(ی دەرگا)[376]

---

[370]هو كاتب مغمور ولكن مقالته هذه شهيرة جداً.

ئەو نوسەرێکی نەناسراوە، بەڵام ئەم وتارەی زۆر بەناوبانگە.

في الحديث شخص مهجول، لذا غير معتبر.

فەرمودەکە کەسێکی نەناسراوی تێدایە، بۆیە بڕواپێکراو نیە.

[371]چۆڵەوانی= بیابان. واتە موراديفی (صحراء)ن.

هل تحبّ المشي في الفلاة.

حەز لەڕۆشتن دەکەیت بەناو بیاباندا.

البيداء منطقة جافّة.

بیابان ناوچەیەکی وشکە.

[372]جمع خُلول

أضافت بعض الخَلّ للسَّلَطة.

هەندێك سرکەی کردە ناو زەڵاتەکەوە.

[373]جمع أخلال

يندر الخِلّ الوفيُّ في زماننا.

هاوڕێی گیانیی بەوەفا لەم سەردەمەدا دەگمەنە.

[374]حانَ يَحين، حِنْ ، حَيْنًا وحَيْنونةً ، فهو حائن ، والمفعول مَحين له.

حانتِ الصّلاةُ.

کاتی نوێژ هات.

حان الرجل فی المعرکة.

پیاوەکە لەجەنگەکەدا تیاچوو.

[375]بطِرَ يَبطَر ، بَطَرًا ، فهو بَطِر ، والمفعول مبطور.

بطِر الطالب بعد نجاحه في الإمتحان.

پاش دەرچونی لەتاقیکردنەوەکە، خوێندکارەکە لەخۆباییبوو.

[376]حاول أن تجد حلّاً لصرير باب غرفة النوم.

هەوڵبدە چارەسەرێك بۆ جیڕەی دەرگای ژوری خەوتنەکە بدۆزیتەوە.

(قفَزَ) و (وثَبَ) هەردوو بازیدا[377]

**.147** (سِفْر) پەڕتوکە، جەمعەکەی (أسْفار)[378]

(مَقال)، (مَقالة) هەردوکیان وتار[379]

**.148** (تسوُّس) چیە؟ ماناى کلۆربوون[380]

(غامِض) ناڕونە[381]، (جَليّ)، (واضِح) روون[382]

**.149** (أَنيس) هاودەمە، وەك (أليف) ماڵی[383]

---

[377]قفَزَ من الفرحة.

لەخۆشیدا بازیدا.

وثَب الرياضيُّ بصورة مذهلة.

وەرزشکارەکە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن بازیدا.

[378]زیاتر بەمانای پەڕتوکی گەورە دێت نەك بچوك.

هل قرأت السفر كلّه؟

ئایا هەموو کتێبەکەت خوێندووەتەوە؟

[379] لم ينشر مقالي بعد.

هێشتا وتارەکەم بڵاونەکراوەتەوە.

قرأت مقالة الصحيفة الرئيسيّة.

وتاری سەرەکیی رۆژنامەکەم خوێندەوە.

[380]تسوُّس الأسنان مرض شائع.

کلۆربوونی ددان نەخۆشییەکی باوە.

[381] مشروعه غامِض.

پرۆژەکەی ناڕوونە.

[382]جوابه جَليّ.

وەڵامەکەی روونە.

كان المدير صريحاً و واضحاً في آراءه.

بەڕێوەبەر لەبۆچونەکانیدا راشکاوو روون بوو.

[383]بەمانای هاودەم دێت. هەروەها موورادیفی وشەی (أليف)یشە کە بەمانای ماڵی دێت.

هُوَ أنِيسُ وَحْدَتِي.

ئەو هاودەمی تەنیاییمە.

هل عندك أيّ حيوان أنيس؟

(صَبِيّ) منداڵە[384]، (صِبا) مناڵی[385]

**150.** (كارِثة) چيە؟ واتە كارەسات[386]

(وِسام) مەداليا[387]، (جائِزة) خەڵات[388]

**151.** (سِلْسِلة) چيە؟ زنجير، زنجيرە[389]

(طابور) واتە ريز، كۆی (طَوابير)ە[390]

---

هيچ گيانداريَكی ماڵيت هەيە؟

[384]جمع صِبْيَة وصِبْيان وصُبْيان، مؤ صَبِيَّة، جمع مؤ صَبايا.

إنّه حقًّا صَبِيٌّ ذكيٌّ.

بەڕاستی منداڵێكی زيرەكە.

[385]مناڵی= منداڵی

كان صلاحُ الدين الأيُّوبي أكثر ميلًا نحو العُلوم الشرعيَّة بدل العُلوم العسكريَّة في صباه.

سەلاحەدينی ئەيوبی لەمنداڵيدا ئەوەندەی حەزی لەزانستە شەرعييەكان دەكرد، ئەوەندە حەزی لەزانستە سەربازييەكان نەدەكرد.

[386]الجمع : كوارِث

الحرب كارثة.

جەنگ كارەساتە.

[387]جمع أَوْسِمة

نال الجندي وسام الشجاعة.

سەربازەكە مەداليای ئازايەتی بەدەستهێنا.

[388]جمع جائزات وجوائزُ

برثا فون سوتنر هي أول امرأة تحوز جائزة نوبل للسلام، في سنة 1905، وكانت قبل حوالي 30 سنة من ذلك سكرتيرة ألفرد نوبل.

بێرشا ڤۆن سوتنەر يەكەم ژنە كە خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بەدەستهێناوە كە ئەويش هی ساڵی 1905 بووە. 30 ساڵ پێشتر ئەم خانمە سكرتێری ئەلفرێد نۆبڵ بووە.

[389]جمع سلاسِل

بەمانای زنجيرو زنجيرەش دێت.

ربط السارق بسلسلة متينة.

دزەكە بە زنجيرێكی پتەو بەسترايەوە.

سلسلة انفجارات هزّت المنطقة.

زنجيرەيەك تەقينەوە ناوچەكەی هەژاند.

[390] أمامي طابور طويل من السيارات.

ريزێكی درێژ ئۆتۆمبێل لەبەردەممدايە.

**152.** (آمِر) فەرماندە[391]، (أَمْر) فەرمانە[392]

(اِشتباك) ماناى پێکهەڵپژانە[393]

**153.** (حمَلَ) هەڵگرت[394]، (حُمولة) بارە[395]

(تاجِر) بازرگان، کۆکەی (تُجّار)ە[396]

**154.** (مَقْبَرة)، (تُرْبة) هەردوو گۆڕستان[397]

(فَضاء) بۆشایی، حەتمەن هی ئاسمان[398]

---

[391]قتل آمر الفوج فی الهجوم.

فەرماندەی فەوجەکە لەهێرشەکەدا کوژرا.

[392]جمع أوامر

نقل الموّظف بأمر الوزير نفسه.

کارمەندەکە بە فەرمانی خودی وەزیر گواسترایەوە.

[393] جمع اشتباكات

جرح شخصان في الاشتباكات الأخيرة.

لەپێکهەڵپژانەکانی ئەم دواییەدا دوو کەس بریندار بوون.

[394]حمل الحمّال الحجرة بسهولة.

حەماڵەکە بەردەکەی بە ئاسانی هەڵگرت.

[395]أفرغتِ السَّفينةُ حُمولتَها.

کەشتییەکە بارەکەی بەتاڵکرد.

[396]هەروەها بە (تِجار)یش کۆدەکرێتەوە.

كان والدى تاجراً ثريّاً.

باوکم بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو.

[397]جمع مقبرة: مَقْبَرات ومقابِر. جمع تربة: تُرُبات وتُرْبات وتُرَب.

هەردوکیان بەمانای گۆڕستان دێن.

أكبر مقبرة في العالم هي مقبرة وادي السلام في مدينة النجف.

گەورەترین گۆڕستان لەجیهاندا، گۆڕستانی وادی ئەلسەلامە لەشاری نەجەف.

دُفن الراحل في تُرْبة الأسرة.

کۆچکردوو لەگۆڕستانی خێزانەکە بەخاك سپێردرا.

[398]جمع أَفْضِيَة.

بەمانای بۆشایی ئاسمان دێت.

155. (بَرْقيَّة) چيه؟ واته بروسکه[399]

(عَبْرة) وەك (دَمْعَة) مانای فرمێسکه[400]

156. (عِظام) مەزنە، کۆیە، نەك تاکه[401]

(فُرْشاة) فلْچەیە[402]، (مِسواك) سیواکه[403]

157. (رَهْن) بارمتە، کۆکەی (رِهان)ە[404]

(صَفّ) ریزو پۆلە[405]، (دَرْس) مانای وانه[406]

---

أرسلت روسيا مركبة إلى الفضاء لأغراض علميّة.

بەمەبەستی زانستی، روسیا کەشتییەکی نارد بۆ بۆشایی ئاسمان.

[399] تبادل الزُّعماء برقيّات التّهاني بمناسبة عيد الفطر المبارك.

سەرکردەکان بەبۆنەی جەژنی رەمەزانی پیرۆزەوە، بروسکەی پیرۆزباییان ئاڵوگۆڕکرد.

[400] هەردوکیان بەمانای فرمێسك دێن.

قد تدخل الجنّة بسبب عبرة من أجل الله.

رەنگە بەهۆی فرمێسکێك لەپێناوی خوا، بچیتە بەهەشتەوە.

دمعتها تدلّ على الندمان.

فرمێسکەکەی بەڵگەیە لەسەر پەشیمانی.

[401] واته ئەم وشەیە بەمانای مەزن (گەورە) دێت، بەڵام وشەکە کۆیە نەك تاك. تاکەکەی (عظیم)ە. هەروەها بە (عُظَماءُ)یش کۆدەکرێتەوە.

بيرميرد شاعرٌ عظيم.

پیرەمێرد شاعیرێکی مەزنە.

[402] جمع فُرَش

فُرْشاة الأسنان لها أنواع عديدة.

فلْچەی ددان چەندین جۆری هەیە.

[403] جمع مساويك

هل تستخدم المسواك بشكل يومي؟

ئایا بەشێوەیەکی رۆژانە سیواك بەکاردەهێنیت؟

[404] بە (رُهُن)و (رُهون)یش کۆدەکرێتەوە.

جمع الجمع رُهُونات.

هل طلبت منك الشركة الرهن؟

ئایا کۆمپانیاکە داوای بارمتەی لێکردیت؟

**.158** (إحصاء) ئاماره، واته (سەرژمێر)[407]

(مَحْض) ماناى پوخت، هەم مێیه، هەم نێر[408]

**.159** (جِسْر) واته پرد، كۆكەى (جُسور)ە[409]

(سَمَكْ) ماسییه[410]، (سَمیك) ئەستوره[411]

---

[405]جمع صُفوف.

دخل صفوف العدوّ خلسة.

بەدزییەوه چووەناو ریزەكانى دوژمنەوه.

بەماناى ریزو پۆلیش دێت.

أخي في الصَّفّ الثَّالث الاعدادي.

براكەم لەپۆلى سێیەمى ئامادەییه.

[406]جمع أدراس ودُروس

درس الرِّیاضیّات صعب.

وانەى بیركارى قورسه.

[407]جمع إحصاءات

بێگومان وشەى سەرژمێر بادینییه، سۆرانییەكەى (ئامار)و (سەرژمێرى)یه.

الإحصاء العام للسكان عملية صعبة.

سەرژمێریى گشتیى دانیشتوان پرۆسەیەكى قورسه.

[408] جمع مِحاض

ئەم وشەیه بەماناى پوخت دێت و لەڕوى رێزمانیشەوه دەكرێ بەهەمان داڕشته بۆ نێرو مێش بەكاربهێنرێت. هەروەها دەشكرێ نیشانەى مێینەشى پێوەبلكێنرێت.

هل عندكم الفضة المحض؟

ئاڵتونى پوختتان لایه؟

اللبن المحض له فوائد كثيرة.

شیرى پوخت سودى زۆره.

[409]هەروەها به (أَجْسُر)یش كۆدەكرێتەوه.

بني الجسر خلال عام فقط.

پردەكه لەماوەى تەنها ساڵێكدا دروستكرا.

[410]جمع الجمع أسْماك،مفرد سَمَكَة

السمك منجم للعديد من الفيتامينات والمعادن، مثل: الكالسيوم، والفوسفور، والحديد، واليود، والمغنيسيوم، والبوتاسيوم، والأحماض الأمينية والدهنية.

160. (صُنْبور) بەلوعە، کۆکەی (صَنابير)[412]

ئەفسانەناسی (عِلمُ الأساطير)[413]

161. (تَقيُّؤ) چيە؟ ڕشانەوەيە[414]

(انسِحاب) مانای کشانەوەيە[415]

162. (أَغْلَقَ) داخست[416]، (إِغلاق) داخستن[417]

(هُمْ) ئەوان[418]، (نَحنُ) ئێمە[419]، (أنا) من[420]

---

ماسی کانێکە بۆ ژمارەیەکی زۆر لەڤیتامین و کانزاکان، لەوانە: کالسیۆم، فۆسفۆڕ، ئاسن، یۆد، مەگنیسیۆم، پۆتاسیۆم و ترشە ئەمینی و چەورییەکان.

[411]جلده سميك جدّاً.

پێستی زۆر ئەستورە.

[412]فتحتُ صنبور الماء.

بەلوعەی ئاوەکەم کردەوە.

[413]کمّلت قسم علم الأساطير في إحدى جامعات الدول العربية.

بەشی ئەفسانەناسیم لەیەکێك لەزانکۆکانی وڵاتە عەرەبییەکان، تەواوکردووە.

[414]التقيُّؤ حالة مزعجة.

ڕشانەوە حاڵەتێکی بێزارکەرە.

[415]انسِحاب الجيش من المناطق المحرّرة خطأ جسيم.

کشانەوەی سوپا لەناوچە ئازادکراوەکان هەڵەیەکی گەورەیە.

[416]أغلقَ يُغلق ، إغلاقًا ، فهو مُغلِق ، والمفعول مُغلَق.

أغلقت الحكومة المدارس بسبب كورونا.

میری بەهۆی کۆرۆناوە خوێندنگەکانی داخست.

417 إغلاق الأماكن العامّة عمل غير ضروري.

داحستنی شوێنە گشتییەکان کارێکی ناپێویستە.

418هم ثلاثة رجال شجعان.

ئەوان سێ پیاوی ئازان.

419نَحْنُ أَبْنَاءُ هَذَا الوَطَنِ.

ئێمە ڕۆڵەی ئەم نیشتمانەین.

[420] أنا طالب مجتهد.

من خوێندکارێکی کۆششکەرم.

163. (كُتْلَة) چيه؟ بارستایی[421]

(نِهاية) حەتمەن مانای کۆتایی[422]

164. (سُلطان) پاشایە، کۆکەی (سَلاطين)[423]

(نُقطةُ تفتيش) خاڵی پشکنین[424]

165. (وَثَن) مانای بت، کۆکەی (أوثان)ه[425]

(مَزْهريّة)یە مانای ئینجانە[426]

166. (شِبْر) واتە بست، جەمعەکەی (أَشْبار)[427]

(بائِع) فرۆشیار[428]، (مُشتري) کڕیار[429]

---

[421] جمع كُتُلات وكُتْلات وكُتَل

كتلة المادة هي 30 كيلوغراماً.

بارستایی ماددەکە 30 کیلۆگرامە.

[422] تغيَّرت النتيجةُ في نهاية المباراة.

لەکۆتایی یارییەکەدا ئەنجامەکە گۆڕا.

[423] واتە لەم مانایەدا موڕادیفی (ملك)ه.

حضر المؤتمر بعض الحكّام والسّلاطين.

لەکۆنگرەکەدا هەندێك فەرمانڕەواو پادشا ئامادەبون.

[424] لقد اعتقل السارق فى أقرب نقطة تفتيش المدينة.

دزەکە لەنزیکترین خاڵی پشکنینی شارەکە دەستگیرکرا.

[425] بە (وُثْن) و (وُثُن)یش کۆدەکرێتەوە.

لا تعبد وَثَناً لا يفيدك شيئاً.

بتێك مەپەرستە کە هیچ سودێکت پێناگەیەنێت.

[426] اشتريت مَزْهريّة جميلة للغرفة الكبيرة.

ئینجانەیەکی جوانم کڕی بۆ ژورە گەورەکە.

[427] دافعوا عن وطنهم شبرًا شبرًا.

بەرگرییان لەنیشتمانەکەیان کرد بست بەبست.

[428] جمع بائعون وباعة، مؤ بائعة، جمع مؤ بائعات.

اشتريت الكتاب من بائع جوّال.

کتێبەکەم لەفرۆشیارێکی گەڕۆك کڕی.

[429] عضب المشتري من البائع.

**.167** (آثَرَ) واته بەباشتر زانی[430]

(بَطّانيَّة)یە مانای بەتانی[431]

**.168** (جُزَيْء) واته گەرد[432]، (ذَرّة) گەردیله[433]

(بَقْشيش) بەخشیشە[434]، (رَشْوَة) بەرتیله[435]

**.169** (زَلْزال) چیه؟ زەمینلەرزە[436]

(شاهِق)، (مُرْتَفِع)، وەك (شَامِخ) بەرزە[437]

---

کڕیارەکە لەفرۆشیارەکە توڕەبوو.

430آثَرَ يُؤثر، إيثارًا، فهو مُؤثِر، والمفعول مُؤثَر

آثر البقاءَ بجوار والديه.

مانەوەی بە تەنیشت دایکوباوکییەوە بەباشتر زانی.

431جمع بَطّانيّات وبَطاطين

بَطّانيَّتي الجديدة غالية.

بەتانییە تازەکەم گرانە.

432جمع جُزَيْئات

الجُزَيْء أكبر من الذرّة.

گەرد لەگەردیلە گەورەترە.

433جمع ذرّات وذرّ.

هل تستطيع تعريف الذرَّة؟

دەتوانیت پێناسەی گەردیلە بکەیت؟

434جمع بَقاشيش

هل أخذت البقشيش من المدير؟

ئایا بەخشیشەکەت لەبەڕێوەبەر وەرگرت؟

435جمع رَشَوات ورَشْوات ورَشَاوَى

إذا تفشَّت الرشوة في مجتمع ضاعت الحقوق.

ئەگەر بەرتیل لەهەر کۆمەڵگایەکدا بڵاوبویەوە، مافەکان دەفەوتێن.

436جمع زَلازِل

زەمینلەرزە= بومەلەرزە.

ضرب زلزال بقوة 6.7 درجة إندونيسيا.

زەمینلەرزەیەك بەگوڕی 6.7 پلە دای لە ئیندۆنوسیا.

**170.** (بَلُّوط)، (سِنْدِيان) هەردوكيان بەڕوو[438]

(مَيْت)، (مَيِّت) مردوو[439]، (مُصَاب) شێت، توشبوو[440]

**171.** (سَجّادة) قاڵی، هەروەها بەرماڵ[441]

(مِجْرَفَة الثَّلج) واتە بەفرماڵ[442]

---

[437] هەرسێكیان بەمانای بەرز دێن واتە موراديفی (عالي)ن.

مدينة السليمانية مليئة بمبانٍ شاهقة.

شاری سلێمانی پڕە لەباڵەخانەی بەرز.

سقف البيت مرتفع جدّاً.

بنميچی ماڵەكە زۆر بەرزە.

هل تخاف من صعود جَبَل شَامِخ؟

ئایا لەسەركەوتن بەسەر شاخی بەرز، دەترسیت؟

[438] يعالج البَلّوط قروح الفم، ونزيف اللثة.

بەڕوو چارەسەری برینی دەم و خوێنبەربونی پوك دەكات.

يستخدم السنديان فی معالجة السلس البولي و التبوّل الليلي اللاإرادي.

بەڕوو بەكاردەهێنرێت لەچارەسەركردنی میزەچركەو میزبەخۆداكردنی خۆنەویستانەی شەوانە.

[439] هەردوكيان بە (أَمْوات) و(مَوْتَى)ش كۆدەكرێنەوە.

دَمُ الميْت في عنق الحكومة.

خوێنی مردووەكە لەئەستۆی حكومەتدایە.

كان الميِّت رجلاً صالحاً.

مردووەكە پیاوێكی چاك بوو.

[440] رَجُل مُصاب ضربني بشدّة.

پیاوێكی شێت بەتوندی لێیدام.

يجب على المصاب بمرض كورونا الابتعاد عن الناس.

پێویستە لەسەر توشبووی نەخۆشیی كۆرۆنا لەخەڵك دوربكەوێتەوە.

[441] جمع سَجّادات وسَجاجِيدُ وسَجَّاد.

قاڵی= مافور= راخەر.

سَجّادات إيران مشهورة.

قاڵییەكانی ئێران بەناوبانگن.

اشتريت سجّادة جديدة.

بەرماڵێكی تازەم كڕی.

**.172** (مُقاوِل) چيه؟ واته بەڵێندەر[443]

(صَدْع) ماناى درز[444]، (صُداع) ژانەسەر[445]

**.173** (سَدّ) واته ئاڤ بەند، کەواته بەنداو[446]

(بطيءُ الخَطْو) ماناى هەنگاوخاو[447]

**.174** (قادِم)، (مُسْتقبَل)، (مُقْبِل) داهاتوو[448]

(مَاضِي)و (مُنْصَرِم)، (فائت) رابردوو[449]

---

[442]مِجْرَفَة الثَلج آلة متوسطة الحجم.

بەفرماڵ ئامێرێکى قەبارە مامناوەندە.

[443]لم ينفذّ المُقاوِل جميع واجباته.

بەڵێندەرەکە هەموو ئەرکەکانى جێبەجێ نەکرد.

[444]جمع صُدوع

أحدث الزِّلزالُ صُدوعًا في المبنى.

زەمینلەرزەکە چەند درزێکى لەباڵەخانەکەدا دروستکرد.

[445]أصابه صُداعٌ من شدّة الحَرّ.

بەهۆى زۆریى گەرماوە، توشى ژانەسەر بوو.

[446]جمع سُدود

بيتنا قريب من سَدّ دربنديخان.

ماڵمان لەبەنداوى دەربەندیخانەوە نزیکە.

[447]السلحفاة حيوان بطيء الخطو.

کیسەڵ گیاندارێکى هەنگاوخاوە.

[448] سأزورك الأُسْبُوعِ الْقَادِم.

هەفتەى داهاتوو سەردانت دەکەم.

أعمالك اليوم تحدّد مستقبلك.

کارەکانى ئەمڕۆت، داهاتوت دیاریدەکەن.

هناك مناسبات عديدة فِي الشَّهْرِ الْمُقْبِلِ.

مانگى داهاتوو چەندین بۆنەى تێدایە.

[449]أنتخب الرئيس فِي الشَّهْرِ الْمَاضِي.

مانگى رابردودا سەرۆك هەڵبژێردرا.

خلال العقد المنصرم تزايدت حالات الانتحار.

175.  (هامِش)، (حاشِية) هەردوو پەراوێز[450]

(قَسوَرة) شێرە، بەڵام هی بەهێز[451]

176.  (سَيَّارة) چيە؟ واتە ئۆتۆمبێل[452]

(حُفْرَة) ماناى چاڵ[453]، (نفَق)يش تونێل[454]

177.  (مُثَقَّف) چيە؟ واتە رۆشنبير[455]

---

لەماوەی دەیەی رابردودا حاڵەتەكانی خۆكوشتن زۆربون.

كان الشتاء الفائت جافّاً.

زستانی رابردوو گەرم بوو.

[450]هامش الكتاب مليء بعلومات عامّة.

پەراوێزی كتێبەكە پڕە لەزانیاریگەلی گشتی.

ذكر الكاتب المصادر في حاشية كتابه.

نوسەر لەپەراوێزی پەڕتوكەكەیدا باسی سەرچاوەكانی كردووە.

[451]ج: قساوِر و قساوِرَة

بەمانای شێری بەهێز دێت.

هاجمه ككسقوره.

وەك شێرێكی بەهێز پەلاماریدا.

[452]سَيَّارتك الجديدة غالية جدّاً.

ئۆتۆمبێلە نوێكەت زۆر گرانە.

في ألمانيا، يُمنع ملء خزان الوقود بالسيارة بالكامل.

لەو ئەڵمانیایەی لای خۆمان پڕكردنی تانكیی سوتەمەنیی ئۆتۆمبێل قەدەغەیە.

[453]جمع حُفُرات وحُفْرات وحُفَر.

من حفر حفرة لأخيه، وقع فيها.

ئەوەی چاڵ بۆ براكەی هەڵبكەنێت، خۆی تێدەكەوێت.

[454]جمع أنْفاق.

هل ذهبت عبر نفق دربنديخان؟

ئایا بەناو تونێلی دەربەندیخاندا رۆیشتویت؟

455هو رجل مُثَقَّف و نظيف.

ئەو پیاوێكی رۆشنبیرو پاكە.

قبل أن تكون مثقفاً كُن محترماً فالإحترام نصف الثقافة.

پێش ئەوەی رۆشنبیر بیت، بەڕێز بە. چونكە رێزگرتن نیوەی رۆشنبیرییە.

(بَصَل) پیاز[456]، (ثُوْم)یش دێت بەمانای سیر[457]

**.178** (فَجْر) چیە؟ بەرەبەیان[458]

(مُؤَامَرَة)یە بەمانای پیلان[459]

**.179** (طاووس) تاووسە، کۆکەی (طواويس)[460]

(دَرْك) بن[461]، (دَرَك) وەك (شُرْطَة) پۆلیس[462]

**.180** (قِشْرة الرأس) واتای کرێشە[463]

---

[456]مفرد بَصَلَة

رائحة البصل كريهة.

بۆنی پیاز ناخۆشە.

[457] مفرد ثُومة

الثوم مفيد للصحة.

سیر بۆ تەندروستی بەسودە.

[458]استمر الاحتفال حتى الفجر.

ئاهەنگەکە تا بەرەبەیان بەردەوامبوو.

[459]جمع مؤامرات

اغتيل الرئيس فى مؤامرة شنيعة.

سەرۆك لەپیلانێکی قێزەوندا تیرۆرکرا.

[460] هەروەها بە (أطواس)یش کۆدەکرێتەوە.

يبلغ طول أنثى الطاووس تقريبًا 90 سم.

درێژی تاووسی مێ دەگاتە نزیکەی 90 سم.

[461]جمع أَدْراك

بلغ الغوّاصُة دَرْكَ البحرِ.

ژێردەریاییەکە گەیشتە بنی دەریاکە.

[462]ألقى رِجَالُ الدَّرَكِ القبض على السارق.

پیاوانی پۆلیس دزەکەیان گرت.

الشرطة في خدمة الشعب.

پۆلیس لەخزمەتی گەلدایە.

[463]جمع القِشْرة: قِشْرات وقِشْر. جمع الجمع قُشُور.

ظهور قشرة الرأس في المنام تشير إلى الفشل والرسوب في الدراسة إذا كان الرائي طالب علم.

(مُعادَلَة)يە، مانای هاوکێشە[464]

**181.** (جُرَذ) واتە جرج، کۆی (جُرْذَان)، (جِرْذَان)[465]

(تَدخين) بەمانای جگەرەکێشان[466]

**182.** (بُومة) بەواتای کوندەپەپووە[467]

(خَيّاط) بەمانای بەرگدرووە[468]

**183.** (أُرجوحة) چیە؟ مانای جۆلانە[469]

(تَوأَم) جمکە، کەواتە دوانە[470]

**184.** (زَوْج) جۆرو هاوسەر، دێش بەمانای جوت[471]

---

دەرکەوتنی کرێش لەخەودا ئاماژەیە بۆ شکستهێنان و کەوتنی خەوبین ئەگەر فێرخواز بێت.

[464] حلّ معادلة ذات مجهولين ليس سهلاً.

شیتەڵکردنی هاوکێشەیەك کە دوو نەزانراوی تێدابێت، ئاسان نیە.

[465] الجرذ في المنام لصٌّ ماكرٌ.

جرج لەخەودا دزێکی فێڵبازە.

[466] التَّدخين ممنوع فى الأماكن العامة.

جگەرەکێشان لەشوێنە گشتییەکاندا قەدەغەیە.

[467] جمع بُومات وبُوم، جمع الجمع أبوام

يقول ابن سيرين أن البومة في المنام تدل على على اللصوص.

ئیبن سیرین دەڵێت، کوندەپەپو لەخەودا ئاماژەیە بۆ دز.

[468] والدي خياط ماهر.

باوکم بەرگدروویەکی کارامەیە.

[469] جمع أراجيحُ وأُرجوحات

توضع الأراجيح للأطفال في الحدائق العامّة.

جۆلانە لەشوێنە گشتییەکاندا بۆ منداڵان دادەنرێت.

[470] الجمع : التَّوَائم و التُّوَام

رؤية التوأم في منام الشاب يشير إلى الزواج القريب من فتاة صالحة.

بینینی دوانە لەخەوی کوڕی گەنجدا ئاماژەیە بۆ هاوسەرگیریکردنی لەگەڵ کچێکی چاکدا، لەداهاتویەکی نزیکدا.

[471] جمع أزواج

رأيت كلّ زوج من الحشرات فى الحقل.

هەموو جۆرە مێرویەکم بینی لەکێڵگەکەدا.

(نَزيفُ الأنْف) خوێنبەربونی لوت[472]

**185.** (حرَّكَ) جوڵاند[473]، (حرُكَ) (جوڵا)یە[474]

(سِبْط) کچەزا، هەم کوڕەزایە[475]

**186.** (صَفار) لەگەڵ (مُحّ) هەردوو زەردێنە[476]

(تَجَلُّط الدَم) مەینی خوێنە[477]

---

استأذنت زوجها لقيام الليل.

بۆ شەونوێژ داوای مۆڵەتی لەهاوسەرەکەی کرد. لێرەدا هاوسەر بەمانای مێرد.

زوجها ليست جميلة.

هاوسەرەکەی جوان نیە. لێرەدا هاوسەر بەمانای ژن. واتە لێرەدا هاومانای (زوجة)یە.

اشتريت زوجاً جديداً من الجوارب.

جوتێك گۆرەویی تازەم کڕی.

[472] نزيف الأنف يقلل مستوى الدم في الجسم.

خوێنبەربونی لوت ئاستی خوێن لەلەشدا کەمدەکات.

[473] حرَّكَ يحرِّك ، تحريكًا ، فهو مُحرِّك ، والمفعول مُحرَّك

إنه قوي جداً، حرَّكَ برميل نفط دون مساعدة أحد.

بەڕاستی ئەو زۆر بەهێزە، بەبێ یارمەتی هیچ کەسێك بەرمیلێك نەوتی جوڵاند.

[474] حرُكَ يَحرُك ، حَرْكًا وحَرَكَةً ، فهو حارِك

حرُك الرجل من مكانه.

پیاوەکە لەشوێنەکەی خۆی جوڵا.

[475] جمع أسْباط.

الحسين سِبْط رسول الله.

حوسەین کچەزای پێغەمبەری خودایە.

سبطي طفل مزعج.

کوڕەزاکەم منداڵێکی زۆر بێزارکەرە.

[476] هەردوکیان بەمانای زەردێنە (ی هێلکە) دێن.

صفار البيض مُفيد للجسم.

زەردێنەی هێلکە بەسودە بۆ جەستە.

بدأت الأمُّ في إطعام طفلها الصغير محّ البيض.

دایکەکە دەستیکرد بە پێدانی زەردێنەی هێلکە بە منداڵە بچوکەکەی.

[477] قد يسبب تَجَلُّط الدَم الموت.

**187.** (إطار) تایەیە، لەگەڵ چوارچێوە[478]

(أحمرُ الشِّفاه) سواروی لێوە[479]

**188.** (حَفْلَة) ئاهەنگە[480]، (مَحْفَل) واتە کۆڕ[481]

(عِید) مانای جەژن[482]، (تَجْرِبة) سەربۆر[483]

**189.** (یافِع) مێردمنداڵ[484]، (شابّ) واتە جەهێڵ[485]

---

دەکرێ مەینی خوێن ببێتەهۆی مردن.

[478]جمع إطارات وأُطُر

هل تسطيع تبديل إطارات سيارتك بنفسك؟

دەتوانیت خۆت تایەکانی ئۆتۆمبێلەکەت بگۆڕیت؟

إطار الصُّورة أجمل من الصورة نفسها.

چوارچێوەی وێنەکە لەخودی وێنەکە جوانترە.

[479]رؤية أحمر الشفاه في المنام للرائي الرجل قد تدل على عدم ثقته في نفسه.

بینینی سوارو لێو لەخەودا لەلایەن پیاوەوە رەنگە ئاماژە بێت بۆ متمانەبەخۆنەبونی.

[480] جمع حَفَلات وحَفْلات

زيّنت الحَفْلَة بالغناء.

ئاهەنگە بە گۆرانی رازێنرایەوە.

في جزيرة بالي الإندونيسية، من المعتاد أن يرمي الناس الفواكه والخضروات على بعضهم البعض خلال حفلات الزفاف. ويعتقدون أن هذا يجلب الحظ السعيد للعروسين.

یەکێك لەشتە باوەکانی دورگەی بالیی ئەو ئیندۆنوسیایەی لای خۆمان، ئەوەیە کە لەکاتی ئاهەنگی هاوسەرگیریدا خەڵکەکە میوەو سەوزە دەگرنە یەکتر چونکە لەو بڕوایەدان ئەم کارە بەختێکی باش دەهێنێت بۆ بوك و زاوا.

[481]جمع مَحافِل

تحسَّنت سمعةُ الكرد في المحفل الدَّولي الأخير.

ناوبانگی کورد لەم کۆڕە نێودەوڵەتییەی دواییەدا جوانبوو.

[482]جمع أعياد

يحتفل المسلمون بعيديْ الفِطْر والأضحى المباركَيْن.

موسڵمانان بەبۆنەی هەردوو جەژنی پیرۆزی رەمەزان و قوربانەوە ئاهەنگ دەگێڕن.

[483]جمع تَجارِب.

سەربۆر= ئەزمون

هل عندك أيّ تجربة في كتابة الشعر؟

هیچ ئەزمونێکت هەیە لەنوسینی شیعردا؟

(أعْوَر) یەكچاوە[486]، (أَحوَل) ماناى خێل[487]

**190.** (مِضَخّة) چیە؟ ماناى ترومپا[488]

(مِصْباح)و (سِراج)، (نِبْراس)یش چرا[489]

**191.** (رقَعَ) پینەكرد[490]، (رُقْعة)یە پینە[491]

---

[484]جمع یافعون وأيْفاع ويُفعان ويَفَعَة.

مێردمنداڵ: منداڵی تەمەن حەوت تا 10 ساڵ.

أشكّ في قوّته البدنية لأنه يافع نحيل.

گومانم لەتوانا جەستەییەكەی هەیە، ئەو مێردمنداڵێكی لاوازە.

[485]جمع شَباب وشُبّان، مؤ شابّة، جمع مؤ شابّات وشوابّ.

جەهێڵ= لاو.

(الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الْجَنَّةِ)

حەسەن و حوسێن سەروەرانی لاوانی بەهەشتن.

[486]جمع عُور، مؤ عوراءُ، جمع مؤ عوراوات وعُور.

یەكچاو: كەسێك یەكێك لەچاوەكانی كوێر بێت.

الأعور في بلاد العميان ملك.

یەكچاو لەوڵاتی نابینایان پاشایە.

[487]جمع حُول، مؤ حَولاء، جمع مؤ حُول

أحد أبناءه أحول.

یەكێك لەكوڕەكانی خێلە.

[488]جمع مِضخّات ومَضَاخّ

مِضخَّة ماءنا قديمة ولا تعمل بصورة جيّدة.

ترومپای ئاوەكەمان كۆنەو بەباشی كارناكات.

[489]هەرسێكیان بەماناى چرا دێن.

انطفأ المصباح.

چراكە كوژایەوە.

اشتريت سراجا جديداً لغرفتي الجديدة.

چرایەكی نوێم بۆ ژوورەكەم كڕی.

لا تسمح الطفل أن يقترب من النبراس.

مەهێڵە منداڵەكە لەچراكە نزیكبێتەوە.

[490]رقَعَ يَرقَع ، رَقْعًا ، فهو راقِع ، والمفعول مَرْقوع.

(رُباعِيَّة)یە مانای چوارینە[492]

**192.** (جارِیة) دائیم، کەشتی، کەنیزەك[493]

(سلَّحَ) پڕچەککرد[494]، (سِلاح) واتە چەك[495]

**193.** (اِنحِناء) چیە؟ چەمانەوەیە[496]

---

رقَعت قميص زوجها.

شەڕواڵی کراسی مێردەکەی پینەکرد.

[491]جمع رُقُعات ورُقْعات ورِقاع ورُقَع

وجود رُقْعة في سرواله، دليل على فقره.

بونی پینەیەك لەشەڕواڵەکەیدا بەڵگەی هەژاریەتی.

[492]تُرجمت رباعياتُ عمر الخيام إلى اللغة الكردية.

چوارینەکانی عومەر خیام بۆ زمانی کوردی وەرگێردراون.

[493]جمع جاريات وجوارٍ.

دائیم= (ع: دائم)= بەردەوام.

بناء المسجد صدقة جارية.

دروستکردنی مزگەوت خێرێکی بەردەوامە.

كانت الجارية كبيرة جداً.

کەشتییەکە زۆر گەورە بوو.

أعتق الملك جاريته الجميلة.

پادشا کەنیزەکە جوانەکەی ئازادکرد.

[494]سلَّحَ يُسلِّح ، تسليحًا ، فهو مُسلِّح ، والمفعول مُسلَّح.

سلَّح الجيش المقاتلَين.

سوپا جەنگاوەرەکانی پڕچەککرد.

[495]جمع أسلحة

لا ترفَع السِّلاح في وجه أخيك.

چەك بە ڕووی براکەتدا بەرزمەکەرەوە.

الوقاحة هي سلاح الضعفاء.

چەقاوەسویی چەکی دەستی کەسانی بێدەسەڵاتە.

[496]چاوگی (انحنى)یە.

الانحناء لغير الله غير مقبول.

چەمانەوە بۆ غەیری خودا، پەسەند نیە.

(اِنفجار) واتای تەقینەوەیە[497]

**.194** (عِيديَّة) چیە؟ مانای جەژنانە[498]

(ذَقَن) چەناگە، کۆکەی (أذقان)ە[499]

**.195** (ثَرْثار)و (مِهْذار) هەردوو چەنەباز[500]

(اِنفِصاليّ)یە مانای جوداخواز[501]

**.196** (مَطْبَعَة) چیە؟ مانای چاپخانە[502]

(طبَخَ) لێنا[503]، (مَطْبَخ) چێشتخانە[504]

---

[497] چاوگی (إنفَجَرَ)یە.

أدى الانفجار الى مقتل أربعة أشخاص.

تەقینەوەکە بووەهۆی کوژرانی چوار کەس.

[498] چاوگی دەستکردی وشەی (عيد)ە.

أعطى الأبُ أولادَه العيديّة يوم العيد.

لەڕۆژی جەژندا باوکەکە جەژنانەی دا بە منداڵەکانی.

[499] بە (ذقون)یش کۆدەکرێتەوە. وشەیەکی نێرە. بە (ذِقْن)یش دەنوسرێت.

ذَقَنه عريض جداً.

چەناگەی زۆر پانە.

[500] چەنەباز= زۆربڵێ.

الثَّرْثار لا يمَلّ.

چەنەباز بێتاقەت نابێت.

لا تكن مِهذارًا.

چەنەباز مەبە.

[501] جوداخواز: کەسێك یان لایەنێك کە دەیەوێت لەکۆمەڵەکەی یان وڵاتەکەی جیابێتەوە.

شنّت الحكومة هجومًا على الانفصاليين.

حکومەت هێرشێکی کردەسەر جوداخوازەکان.

[502] جمع مَطْبعات ومَطابُع

يعمل في مطبعة حكومية.

لەچاپخانەیەکی حکومیدا کاردەکات.

[503] طبَخَ يَطبُخ ، طبْخًا ، فهو طابِخ ، والمفعول مَطْبوخ وطبيخ.

طبَخَ اللحم بسرعة.

**.197** (حَبّ) دانەوێڵە[505]، (بَيدَر)، (جُرْن) خەرمان[506]

(حادّ) توندو تیژە[507]، (مِسَنّ)یش هەسان[508]

**.198** (أُسْبوع) هەفتەیە[509]، (يَوْم) رۆژ[510]، (شَهْر) مانگ[511]

---

بەخێرایی گۆشتەکەی لێنا.

[504]جمع مَطابِخ

لا تقترب من المطبخ أثناء المشادة الكلامية.

لەکاتی دەمەقاڵەدا لەچێشتخانەکە نزیك مەبەرەوە.

[505]جمع الجمع حُبوب،مفرد حَبَّة.

يأكل الطير حبوب الحقل.

باڵندە دانەوێڵەی کێڵگەکە دەخوات.

[506]خەرمان: شوێنی پاککردن و کۆکردنەوەی کاتیی دانەوێڵە لەنزیك کێڵگە.

باع الفلاح حبوبه في البَيْدَر.

جوتیارەکە دانەوێڵەکەی لەخەرمانەکەدا فرۆشت.

نقلوا حصادهم إلى الجُرْن.

بەروبومە کشتوکاڵییەکەیان گواستەوە بۆ خەرمانەکە.

[507]جمع حادُّون وحِداد. بەمانای توندو تیژیش دێت.

هناك ألم حادّ في يدي اليمنى.

قطع السكين الحادّ يدها.

چەقۆ تیژەکە دەستی بڕی.

ئازارێکی توند لەدەستی ڕاستمدایە.

[508]هەسان= تیژکەر: بەردی تیژکردنی چەقۆو مقەست یان هەر ئامێرێکی تری تیژکەر.

اشتريت مِسَنّاً آليّاً لزوجتي.

هەسانێکی ئۆتۆماتیکیم بۆ ژنەکەم کڕی.

509 ج: أسابيع

قضينا أسبوعًا خارج البلاد.

هەفتەیەکمان لەدەرەوەی وڵات بەسەربرد.

[510]جمع أيّام

بەمانای رۆژ وەك 24 سەعاتەکەو هەروەها بەمای رۆژ (لەخۆرهەڵاتنەوە تا خۆرئاوابون)یش دێت، واتە لەمانای دووەمیاندا موورادیفی (نهار)ە.

ولد طفلنا الجديد قبل 24 يوماً من الان.

(شُهْرة) ناوبانگە[512]، (مَشْهور) بەناوبانگ[513]

**199.** (مُباشِر) چیە؟ مانای ڕاستەوخۆ[514]

(مَغازِل) تەشی، بەڵام تاك نا، كۆ[515]

**200.** (حُبَّ) مەحبوببوو[516]، (حُبّ) خۆشەویستی[517]

(حاجّ) واتە حاجی[518]، (حاجة) پێویستی[519]

---

منداڵەكە نوێكەمان 24 ڕۆژ پێش ئێستا لەدایكبوو.

أكملت قراءة الكتاب خلال يوم فقط.

لەماوەی تەنها ڕۆژێكدا خوێندنەوەی كتێبەكەم تەواوكرد.

[511] ج: أشهر، شهور.

اللهم بلغنا شهر رمضان المبارك.

خودایە بمانگەیەنیتە مانگی ڕەمەزان.

512جمع شُهُرات وشُهْرات

جاكی شان لە شُهْرة واسعة بين النَّاس.

جاكی چان ناوبانگێكی فراوانی هەیە لەناو خەڵكدا.

[513] ج: مَشَاهِير

الإمام الغزالي عالم مشهور.

پێشەوا غەزالی زانایەكی بەناوبانگە.

[514] نُقلت المبارات بشكل مباشر.

یارییەكە بەشێوەی ڕاستەوخۆ گوێزرایەوە.

[515] تاكەكەی (مَغزِل)ە.

هل تجيد استخدام المغزل الخشبيّ؟

ئایا دەتوانیت بەباشی تەشیی دارین بەكاربهێنیت؟

[516] حُبَّ يُحَبّ ، حُبًّا ، والمفعول مَحْبوب.

مەحبوب بوو= خۆشەویست بوو.

[517] إن الحبّ لا يمكن أن يمحو الماضي لكنه يغير المستقبل.

بێگومان خۆشەویستی ناتوانێت ڕابردوو بسڕێتەوە، بەڵام داهاتوو دەگۆڕێت.

[518] جمع حاجُّون وحُجّاج وحَجِيج، مؤ حاجَّة، جمع مؤ حاجّات وحواجّ.

والده حاجّ متدين.

باوكی حاجییەكی دیندارە.

[519] جمع حاجات وحاج وحوائِج

201. (نَعامَة) چيه؟ واته حوشترمەل[520]

(فَساد) گەندەڵی[521]، (فاسِد)یش گەندەڵ[522]

202. (أَخْطَبوط) هەشتپەل[523]، (حُوت) و (نُون) نەهەن[524]

(ضُراط) واته تڕ[525]، (ضَرُوط)یش تڕکەن[526]

203. (إخفاء) شاردنەوە[527]، (أخفى) شاردەوە[528]

---

الحاجة أمّ الاختراع.

پێویستی دایکی داهێنانە.

[520]جمع نعامات ونَعائمُ ونَعَام

رؤية النعامة في منام الفتاة العزباء تشير الى الزواج القريب من شخص ميسور الحال.

بينینی حوشترمەل لەخەوی کچی شونەکردودا ئاماژەیە بۆ بەمزوانە هاوسەرگیریکردنی لەگەڵ کەسێکی دەوڵەمەندا.

[521]أُتهم رئيس الحكومة بالفساد، لذا استقال عن مصبه.

سەرۆکی حکومەت بە گەندەڵی تۆمەتبارکرا، بۆیە دەستی لەپۆستەکەی کێشایەوە.

[522]جمع فاسدون وفَسْدى

وجود وزير فاسد في الحكومة يثير عضب شعباً بأكمله.

بونی تەنها وەزیرێکی گەندەڵ لەحکومەتدا تورەیی گەلێك بەتەواوەتی، دەوروژێنێت.

[523]هەروەها بە (أُخْطُبوط)یش دەنوسرێت. هەشتپەل= هەشتپێ: زیندەوەرێکی دەریاییە، سەرێکی بچوك و هەشت پەلی هەیە.

جمع أَخْطَبوطات/ أُخْطُبوطات.

الأخطبوط أذكى الحيوانات اللافقارية.

هەشتپەل زیرەکترین زیندەوەری نابڕبڕەدارە.

[524]هەردوکیان بەمانای نەهەنگ دێن. لەنیوەبەیتەکەدا پیتی "گ"ەکە بەر جادەی زەروراتی شیعری کەوتووە، ئەمەش شتێکی ئاساییە!.

يعتبر الحوت الأزرق أكبر حيوان على وجه الأرض، حيث يصل طوله إلى 30 مترًا ويزن 170 طنًا.

نەهەنگی شین بە گەورەترین زیندەوەر لەسەر زەوی، دادەنرێت، درێژییەکەی دەگاتە 30 مەترو بارستاییەکەی دەگاتە 170 تۆن.

[525]الضراط في المنام هو اشارة الى الكلام السيء.

تڕ لەخەودا ئاماژەیە بۆ قسەی خراپ و ناشرین.

[526]ولدك الضَرُوط شتمنى.

کوڕە تڕکەنەکەت جوێنی پێدام.

[527]چاوگی (أخفى)یە.

إخفاء بعض الحقائق عن الأطفال مفيد.

شاردنەوەی هەندێك راستی لەمنداڵان، بەسودە.

[528]أخفى يُخفي ، أَخْفِ ، إخفاءً ، فهو مُخفٍ ، والمفعول مُخفًى.

(أَلْغَى)و (أبطَلَ) هەڵوەشاندەوە[529]

**.204** (بَرنامَج) چيە؟ ماناى بەرنامە[530]

(صابِر) ئارامگر[531]، (صَبْر) ئارامە[532]

**.205** (اقْتِراح) چيە؟ واتە پێشنياز[533]

(غَثِيث) لاوازە[534]، (كَلِيل) كول، لاواز[535]

**.206** (مِجْرَفَة)، (جَارُوف)، (رَفْش) خاكەناز[536]

---

أخفى الذَّهبَ في مكان بعيد.

ئاڵتونەكەى لەشوێنێكى دوردا شاردەوە.

[529] ألغى الرئيس الجديد القانونَ القديم.

سەرۆكى نوێ ياسا كۆنەكەى هەڵوەشاندەوە.

أبطلت محكمة التمييز الحُكْمَ.

دادگاى تێهەڵچونەوە بڕيارەكەى هەڵوەشاندەوە.

[530] برنامجك التلفزيوني غير مفيد.

بەرنامە تەلەفزيۆنييەكەت بێسود.

[531] الفقير الصابر يدخل الجنة قبل الغني الصابر.

هەژارى ئارامگر لەپێش دەوڵەمەندى ئارامگر دەچێتە بەهەشتەوە.

[532] زوجها يغضب بسرعة، ليس عنده صبر على أخطاءها.

مێردەكەى خێرا توڕەدەبێت، ئارامى نيە لەسەر هەڵەكانى (ژنەكەى).

[533] پێشنياز= پێشنيار

اقتراحك رائع، ولكنّ الحكومة لا تؤيده بحجة الأزمة الإقتصادية..

پێشنيازەكەت نايابە، بەڵام حكومەت بەبيانوى قەيرانى ئابور، پشتگيرى ناكات.

[534] ولدها غَثِيث جداً لذا عليها مراجعة طبيب مختص.

منداڵەكەى زۆر لاوازە، بۆيە پێويستە لەسەرى سەردانى پزيشكێكى پسپۆڕ بكات.

[535] سيفه كليل، لا يصلح للحرب.

شمشێرەكەى كولە، بەكەڵكى جەنگ نايەت.

عيناه كليلتان، لذا لم يعرفني.

چاوەكانى لاوازن، بۆيە نەيناسيم.

[536] اشتريت مجرفة جديدة لوالدي.

خاكەنازێكى تازەم بۆ باوكم كڕى.

(مَكرْ)و (حِيلة) فێڵ[537]، (ماكِر)یش فێڵباز[538]

**[207.](#)** (قَصَّ) گێڕاوە[539]، (قاصّ) چیرۆكنوسە[540]

(رسَّام) وێنەكێش[541]، (خَطَّاط) خۆشنوسە[542]

**[208.](#)** (مَخْصِيّ) وەك (خَصِيّ) مانای خەسێنراو[543]

---

جاروفك قديم و لايصلح للزراعة.

خاكەنازەكەت كۆنەو بۆ كشتوكاڵ ناشێت.

إستخدام الرفش عمل بسيط ولكنّه يحتاج الى قوة كبيرة.

بەكارهێنانی خاكەناز كارێكی سادەیە، بەڵام پێویستی بە هێزێكی گەورە هەیە.

[537] إذا ارتدى الزور و المكر لباس التقوى، ستقع أكبر فاجعة في التاريخ.

ئەگەر ساختەو فێڵ پۆشاكی لەخواترسانیان لەبەركرد، ئەو كاتە گەورەترین كارەسات لەمێژودا رودەدات.

حيلتك هذه مكشوفة لديّ، جرّب شخصاً آخراً!

ئەم فێڵەت لەلای من ئاشكرایە، كەسێكی تر تاقیبكەرەوە!

[538] أكل ثعلب ماكرٌ دجاجتي في وضح النهار.

رێوییەكی فێڵباز بە رۆژی روناك مریشكەكەی خواردم.

[539] قَصَّ قَصَصْتُ ، يَقُصّ ، اقْصُصْ، قَصًّا، فهو قاصّ، والمفعول مَقْصوص.

گێراوە= گێڕایەوە.

قَصَّ القصَّةَ على أصدقائه بطريقة جذّابة.

بەشێوازێكی سەرنجڕاكێش چیرۆكەكەی بۆ هاوڕێكانی گێڕایەوە.

[540] جمع قاصّون وقُصَّاص

نجيب محفوظ قاصٌّ عالميّ.

نەجیب مەحفوز چیرۆكنوسێكی جیهانییە.

[541] إنه رسّام ماهر، يتقن رسم المناظر الطبيعيّة.

بەڕاستی وێنەكێشێكی كارامەیە، بەباشی وێنەی دیمەنە سروشتییەكان دەكێشێت.

[542] شقيقي الأكبر خطّاط رائع.

برا گەورەكەم خۆشنوسێكی نایابە.

[543] هەردوكیان ناوی كراوی (خصَى)ن.

هل حصانك مَخْصِيّ؟

ئایا ئەسپەكەت خەسێنراوە؟

حارسه الشخصي رجل خَصِيّ.

پاسەوانە تایبەتەكەی پیاوێكی خەسێنراوە.

(فَيَضـان)و (طُوفان) هەردوكيان لافاو[544]

**.209** (قِفْ) بۆستە[545]، (ائْتِ) وەرە[546]، (قُلْ) بێژە[547]

(قاتِل) بكوژە[548]، (سَفّاح) خوێنڕێژە[549]

**.210** (لجَمَ) لغاوكرد[550]، (لِجام) لغاوە[551]

(مُسْتَتِر)، (خَفيّ) هەردوو شاراوە[552]

---

[544] هەردوكيان بەماناى لافاو دێن، بەڵام (طوفان) گەورەترە.

أدت الفيضانات إلى إبعاد آلاف السكان عن منازلهم.

لافاوەكان بونەهۆى دورخستنەوەى هەزاران دانيشتوان لەماڵەكانيان.

تسبّب الطُّوفان في كوارث كثيرة.

لافاوەكە چەند كارەساتێكى گەورەى لێكەوتەوە.

[545]بۆستە= بووەستە.

قف في مكانك ولا تتحرك.

لەشوێنەكەى خۆتدا بووەستەو مەجوڵێ.

[546]ائْتِ الى مكتبى الخاص لنناقش المشكلة بالتفصيل.

وەرە بۆ نوسينگە تايبەتەكەم، بۆ ئەوەى بە دورودرێژى گفتوگۆ لەسەر كێشەكە بكەين.

[547]بێژە= بڵێ.

قل لي ما فى داخلك بصراحة، فأنا لا أحب اللف والدوران.

ئەوەى لەناختدايە بەڕاشكاوى پێم بڵێ، چونكە من حەزم لەپێچ و پەنا نيە.

[548]جمع قاتِلون وقَتَلَة (للعاقل)، مؤ قاتلة، جمع مؤ قاتلات وقواتل.

كان قاتل الرئيس حارسه الشخصي.

بكوژى سەرۆك پاسەوانە تايبەتەكەى خۆى بوو.

[549]قتل سَفّاح لئيم زوجتي البريئة.

خوێنڕێژێكى نامەرد هاوسەرە بێتاوانەكەمى كوشت.

[550]لجَمَ يَلجُم ، لَجْمًا ، فهو لاجِم ، والمفعول مَلْجوم.

لجَم المزارع فرسَه.

جوتيارەكە ماينەكەى لغاوكرد.

[551]جمع ألجمة ولُجْم ولُجُم

صنَع الرجل لِجامًا لحماره.

پياوەكە لغاوێكى بۆ كەرەكەى دروستكرد.

[552]شاراوە= نهێنى.

211. (هَيْبة) و (مَهابة) شان و شەوکەتە[553]

(غَمّ) لەگەڵ (حُزْن) هەردوو خەفەتە[554]

212. (جَدَّة) واتە نەنك[555]، (جَدّ)یش باپیرە[556]

(طابور) مانای ریز، کۆی (طَوابیر)ە[557]

213. (سَقیم) و (مَریض)، وەك (عَلیل) نەخۆش[558]

---

ضمير الجملة مستتر و يرجع الى "هو".

جێناوی رستەکە شاراوەیەو دەگەڕێتەوە بۆ "ئەو".

استخدمت الفتاه أساليب خَفيّة لإختبار خطيبها.

کچەکە شێوازگەلی نهێنی بەکارهێنا بۆ تاقیکردنەوەی دەزگیرانەکەی.

[553]شيخ العشيرة له هيبة عظيمة.

سەرۆك هۆزەکە شان و شەوکەتێکی مەزنی هەیە.

حافظ على مهابتك ولا تجلس مع شاربي الخمر.

پارێزگاری لەشان و شەوکەتت بکەو لەگەڵ شەرابخۆران دامەنیشە.

[554]قتله غمّ وفاة والدته.

خەفەتی کۆچیدوایی دایکی، کوشتی.

الإثم مصدر للسعادة المؤقتة و الحزن الدائم.

تاوان سەرچاوەیەکە بۆ خۆشحاڵیی کاتی و خەفەتی بەردەوام.

[555]جمع جَدّات

نەنك= داپیرە= دایەگەورە: دایکی دایك یان باوك.

كانت جدَّته أحنّ عليه من أبيه.

نەنکی لەباوکی بەسۆزتر بوو بۆی.

[556]جمع أجداد وجُدود.

باپیر= باوەگەورە: باوکی باوك یان دایك.

رؤية الجد والجدة في الحلم يكون مؤشراً بأن الشخص الحالم له حنين للماضي.

بینینی باپیر یان نەنك لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خەوبینەکە سۆزو شەوقی هەیە بۆ رابردوو.

[557]أمامي طابور من السيارات.

ریزێك ئۆتۆمبێلم لەبەردەمدایە.

[558] هەرسێکیان بەمانای نەخۆش دێن.

إنه رجل سقيم.

بێگومان پیاوێکی نەخۆشە.

(سَكران) و (ثَمِل) هەردوكيان سەرخۆش[559]

**.214** (كَرِيم) و (جَوّاد)، (سَخِيّ) بەخشندە[560]

(ابتِسامَة)يە وەك (بَسْمَة) خەندە[561]

**.215** (رَبَّة بَيْت) چيە؟ واتە كەيبانوو[562]

(نَعْسان)و (ناعِس) هەردوو خەوالْوو[563]

---

المريض خرج من المستشفى دون سماح الاطباء له.

نەخۆشەكە بەبێ مۆڵەتی پزیشكەكان، لەنەخۆشخانەكە دەرچوو.

ما يَزَالُ عَلِيلاً.

تائێستاش نەخۆشە.

[559] هەردوكيان بەمانای سەرخۆش دێن، بەڵام ئاستی سەرخۆشیی وشەی دووەمیان زیاترە لەیەكەم. دووەمیان (مەست)یشی پێدەووترێت.

الرجل السكران خطير.

پیاوی سەرخۆش مەترسیدارە.

هو يتحدث بشكل غير مستقر كأنه ثمل.

ئەو بەشێوەیەكی ناجێگیر قسەدەكات، وەك ئەوەی بڵێیت سەرخۆشە.

[560]إنه رجل كريم، لا يطرد أيّ سائل.

بەڕاستی پیاوێكی بەخشندەیە، هیچ سواڵكەرێك دەرناكات.

كان حاتم الطائيُّ رجلاً جوّادًا.

حاتەمی تائی پیاوێكی بەخشندە بوو.

{السَّخِيُّ قَرِيبٌ مِنَ اللهِ، قَرِيبٌ مِنَ الْجَنَّةِ، قَرِيبٌ مِنَ النَّاسِ}

بەخشندە لەخوداوە نزیكە، نزیكە لەبەهەشتەوە، نزیكە لەخەڵكیشەوە.

[561]هەردوكيان بەمانای خەندە دێن. خەندە= زەردەخەنە.

الابتسامة هي اللغة التي لا تحتاج إلى ترجمة.

خەندە بریتییە لەو زمانەی پێویستی بە وەرگێڕان نیە.

البسمة قد لا تعني أنك مسرور بل تعني أنك راضٍ بقضاء الله وقدره.

خەندە رەنگە مانای ئەوە نەبێت كە دڵخۆشیت، بەڵكو مانای ئەوەیە كە رازیت بە قەزاو قەدەری خودا.

[562] كەيبانوو= كابانی ماڵ.

والدتي ربة بيت ماهرة.

دایكم كەیبانوویەكی لێهاتووە.

[563]السائق النعسان أخطر من القاتل المأجور.

216. (خَيِّر) خێرخوازە، کۆی (خِيار)، (أخيار)[564]

(مَسْرور) دڵخۆشە[565]، (حَزِين) خەفەتبار[566]

217. (خَاصِرَة) چیە مانای کەلەکە[567]

(كَنَسَ) گسکدا[568]، (مِكْنَسة) گسکە[569]

218. (سِحْر) جادووە[570]، (ساحِر) جادوباز[571]

---

شۆفێری خەواڵوو لەپیاوکوژی بەکرێگیراو مەترسیدارترە.

الموظف الناعس لا يصلح للأعمال العاجلة.

کارمەندی خەواڵوو بۆ کارگەلی بەپەلە ناشێت.

564 واتە وشەی (خيِّر) بە (خِيار)و (أخيار) کۆدەکرێتەوە.

بُني الجامع على مصاريف رجل خيِّر.

مزگەوتەکە لەسەر خەرجیی پیاوێکی خێرخواز دروستکرا.

565 الولد مسرور جداً بعودة والده من جبهات القتال.

کوڕەکە زۆر خۆشحاڵە بە گەڕانەوەی باوکی لەبەرەکانی جەنگ.

566 جمع حَزانَى وحُزَناء

بكى الرجل الحزين لولده المفقود.

پیاوە خەفەتبارەکە بۆ منداڵە بێسەروشوێنەکەی گریا.

567 جمع خَواصِر

ألم الخاصرة في الحلم قد يدل على الندم على إنفاق مالٍ في غير محلّه.

ئازاری کەلەکە لەخەوبینیندا رەنگە ئاماژە بێت بۆ پەشیمانی لەخەرجکردنی پارە لەبوارێکی نەگونجاودا.

568 كَنَسَ، يَكنُس ، كَنْسًا، فهو كانس ، والمفعول مَكْنوس.

إذا رأى الشخص في الحلم انه يكنس باستخدام المكنسة فهذا يدل على أنه يرغب في تنظيف حياتة من بعض الأخطاء.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی بە گسك گسکدەدا، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کەسە حەزدەکات ژیانی لەهەندێك هەڵە پاکبکاتەوە.

569 جمع مِكْنسات ومَكانِس

لمكنستنا الكهربائية صوت مزعج.

گسکە کارەباییەکەمان دەنگێکی بێزارکەری هەیە.

570 جمع أسْحار وسُحُور

يقول ابن سيرين أن رؤية السحر تدل على اتباع النفس وشهوات الدنيا.

ئیبن سیرین دەڵێت، بینینی جادوو لەخەودا ئاماژەیە بۆ شوێنکەوتنی حەزو ئارەزووەکانی دونیا.

571 جمع ساحِرون وسُحّار وسَحَرَة. مؤ ساحرة، جمع مؤ ساحرات وسواحر

من رأى ساحراً في المنام فهذا أمر غير جيد ويدل على شخص منافق في حياته وكاذب ومخادع.

(عرَّاف) فاڵگرەوە[572]، (مُختَلِف) جیاواز[573]

**.219** (هذِهِ) (ئەم)ە، بەس بۆ مێ نەك نێر[574]

(هذا) ئەم بۆ نێر[575]، (مُراقِب) چاودێر[576]

**.220** (هِلال) کەوانەو مانگی یەکشەوە[577]

(سَوِيًّا)، (معاً) هەردوو پێکەوە[578]

**.221** (بَدْر) بەمانای مانگی چواردەشەو[579]

---

ئەگەر کەسێك لەخەودا جادوبازێکی بینی، ئەوە شتێکی باش نیەو ئاماژەیە بۆ بونی کەسێکی دوڕوو و درۆزن و فێڵباز لەژیانیدا.

[572] {مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ}

هەرکەسێك بچێت بۆ لای فاڵگرەوە، ئەوە بێباوەڕ بووە بەوەی کە دابەزیوە بۆ سەر محەمەد (د.خ).

[573] رأي مختلف في الموضوع.

بۆچونم لەبابەتەکەدا جیاوازە.

هناك حوالي 160 لهجة إنجليزية مختلفة.

زمانی ئینگلیزی نزیکەی 160 شێوەزاری جیاوازی هەیە.

[574]ناوی ئاماژەیەو بۆ تاکی مێ بەکاردەهێنرێت.

هذه الفتاة جميلة.

ئەم کچە جوانە.

[575]ناوی ئاماژەیە بۆ تاکی نێر.

هذا الرجل شجاع.

ئەم پیاوە ئازایە.

[576]رصد مراقب الامتحانات ثلاث حالات الغش.

چاودێری تاقیکردنەوەکان سێ حاڵەتی قۆپیکردنی تۆمارکرد.

[577]ج: أَهِلَّة

ظهر هلال رمضان.

مانگی یەکشەوەی رەمەزان دەرکەوت.

تُوضع الجملة التوضيحية بين هلالين.

رستەی رونکردنەوە لەنێوان دوو کەوانەدا دادەنرێت.

[578]جاء الرجال والنساء سَوِيًّا للمشاركة في المظاهرة.

پیاوان و ژنان پێکەوە هاتن بۆ بەشداریکردن لەخۆپیشاندانەکە.

ذهب الرجل و زوجته معًا للمحكمة.

(تَفسير الأحلام) لێکدانەوەی خەو[580]

**222.** (عِبادة) چیە؟ مانای پەرستن[581]

(جلَسَ) دانیشت[582]، (جَلْسَة) دانیشتن[583]

**223.** (اِغتیال) چیە؟ تیرۆرکردنە[584]

(تَعیین)و (تَأْسِیس) دامەزراندنە[585]

---

پیاوو ژنەکە پێکەوە چون بۆ دادگا.

[579] جمع أبدار وبُدور

الفتاة جميلة كالبدر.

کچەکە وەك مانگی چواردە جوانە.

[580] هل تؤمن بتفسير الأحلام؟

بڕوات بە لێکدانەوەی خەو هەیە؟

[581] چاوگی (عبَدَ)یە.

عبادة الله واجب على كلّ انسان عاقل.

پەرستنی خودا ئەرکە لەسەر هەموو مرۆڤێکی ژیر.

[582] جلَسَ يَجلِس، جُلوسًا، فهو جالِس وجليس

جلَس الرجل على المقعد.

پیاوەکە لەسەر کورسییەکە دانیشت.

[583] جمع جَلَسات وجَلْسات

رُفعت الجَلْسَة للأسبوع القادم.

دانیشتنەکە بۆ هەفتەی داهاتوو هەڵگیرا.

[584] چاوگی اِ(غتالَ)یە.

كان اغتيال الرئيس الأمريكي الأسبق جريمة كبيرة.

تیرۆرکردنی سەرۆکی پێشوتری ئەمەریکا تاوانێکی گەورە بوو.

[585] هەردوکیان بەمانای دامەزراندن دێن، بەڵام (تعیین) بەمانای دامەزراندنی کارمەندو هاوشێوەکانی دێت، بەڵام (تَأْسیس) بەمانای دامەزراندنی دامەزراوەو رێکخراوو حزب و هاوشێوەکانی دێت.

تَأْسِيس المنظمات الخيرية واجب أنساني.

دامەزراندنی رێکخراوە خێرخوازییەکان ئەرکێکی مرۆییە.

تعيين خريجي الجامعات واجب على الحكومة.

دامەزراندنی دەرچوانی زانکۆکان ئەرکە لەسەر میری.

224. (يائِس) نائومێد[586]، (أَمَل)یش ئاوات[587]

(صَلاحِيَة)ه ماناى دەسەڵات[588]

225. (تأخُّر) چيه؟ واته دواكەوتن[589]

(سُقوط الأسنان) ماناى دانكەوتن[590]

226. (زغزغة) چيه؟ ختوكەدان[591]

(قَلْع الأسنان)ه ماناى دانكێشان[592]

227. (دَغدَغة) چيه؟ ختوكەدان[593]

---

[586]مؤ يائِس ويائِسة، جمع مؤ يائسات ويَوائِس

اليائس لا ينجح أبداً.

نائومێد هەرگيز سەرناكەوێت.

[587]جمع آمال

ئاوات= هيوا.

كُن مُخلصًا في عملك، تبلغْ أملك.

دڵسۆز به لەكارەكەت، به ئاواتت دەگەيت.

[588]زوجها مهندس ذو صلاحية تامّة.

مێردەكەى ئەندازيارێكى خاوەن دەسەڵاتى تەواوە.

[589]چاوگى (تأخَّرَ)يه.

تأخُّرك عن الدوام شيء غير مقبول.

دواكەوتنت لەدەوام شتێكى قبوڵنەكراوە.

[590]دانكەوتن= ددانكەوتن= كەوتنى ددان.

لسقوط الأسنان عوامل عديدة.

دانكەوتن چەندين هۆكارى هەيه.

[591]چاوگى (زغزغَ)يه.

زغزغة الجرذ شيء مقزِّز.

ختوكەدانى جرج شتێكى قێزەونه.

[592] دانكێشان: دەرهێنانى ددان لەڕەگەوە.

قلع الأسنان عمل صعب.

دانكێشان كارێكى قورسه.

[593]چاوگى (دغدغَ)يه.

(ساكِن) دانیشتوو[594]، (سُكّان) دانیشتوان[595]

**228.** (حَمْلَة) هەڵمەتە[596]، دروشم (شِعار)ە[597]

(مَيْسِر) قومارە[598]، (نَرد) مانای زارە[599]

**229.** (مِحدَلَة) رۆڵە، لەگەڵ باگردێن[600]

---

لا أحب دغدغة الأصدقاء.

حەزم لەختوكەدانی هاورێیان نیە.

[594]جمع ساكنون وسُكّان، مؤ سَاكِنَة، جمع مؤ ساكِنات وسَوَاكِن.

هو ساكن مدينة السليمانية.

ئەو دانیشتووی شاری سلێمانییە.

هل أنت ساكن المدينة هذه؟
ئایا تۆ دانیشتووی ئەم شارەیت؟

[595]كۆی (ساكن)ە.

سُكّان مدينة أربيل مثقفون.

دانیشتوانی شاری هەولێر رۆشنبیرن.

وصل عدد سكّان مصر أكثر من 102 مليون نسمة.
ژمارەی دانیشتوانی میسر گەیشتە زیاتر لە 102 ملیۆن.

[596]جمع حَمَلات وحَمْلات

بدأت حملة صحافيّة لإطلاق سراح الصحفيين.

هەڵمەتێكی رۆژنامەوانی دەستپێكرد بۆ ئازادكردنی رۆژنامەوانەكان.

[597]جمع شعارات وأشْعِرة وشُعُر

ما هو شعار المظاهرة؟

دروشمی خۆپیشاندانەكە چیە؟

[598] (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ)

سەبارەت بە شەراب و قومار پرسیارت لێدەكەن، بڵێ گوناهێكی گەورەیان تێدایە.

[599]زار= بەردەزار

ارْمِ النرد لنرى حظك.

زارەكە هەڵدە با بەختت ببینین.

[600] ج: مَحَادِل

بەمانای رۆڵەو باگردێنیش دێت. رۆڵە: جۆرە ئۆتۆمبێلێكە كە تایەی خڕو پانی زەبەلاحی ئاسنینی پێوەیەو بۆ تەختكردنی رێگا بەكاردەهێنرێت.

للمحدلة صوت مزعج.

(مَفْقود) هەم ونە، هەم بێسەروشوێن[601]

**.230** (عَبْد) کۆیلە(ی تاك)، (عَبید)یش بە کۆ[602]

(غَریب) بێگانە، هەروەها نامۆ[603]

**.231** (لَبَن) مانای شیر[604]، (مَخیض) واتە دۆ[605]

(زَوایا) گۆشە، بەڵام تاك نا، کۆ[606]

**.232** (خسَرَ) دۆڕاند[607]، (خُسْران) دۆڕاندن[608]

---

رۆڵە دەنگێکی بێزارکەری هەیە.

هل تستطیع حمل تلك المِحدَلة؟

ئایا دەتوانیت ئەو باگردێنە هەڵبگریت؟

[601]زوجها جندي مفقود.

مێردەکەی سەربازێکی بێسەروشوێنە.

قلمي الغالي مفقود، إذا وجدته قل لي.

پێنوسە گرانەکەم ونە، ئەگەر دۆزیتەوە پێمبڵێ.

[602]واتە (عبد) بەمانای کۆیلە دێت و تاکە، کۆکەی (عبید)ە.

هرب العبد من سیده.

کۆیلەکە لەدەست گەورەکەی هەڵات.

[603]جمع أغْراب وغُرَباء، مؤ غریبة، جمع مؤ غریبات وغرائِب.

نامۆ= سەیر، ناباو.

الرجل غریب و لیس لدیه علم حول المدینة.

پیاوەکە بێگانەیەو زانیاری سەبارەت بە شارەکە نیە.

رأیت شیئاً غریباً داخل الطعام.

شتێکی نامۆم لەناو خواردنەکەدا بینی.

[604]ج: ألبان

اللبن یحوي بعض المعادن والسُّکر الذائب وبعض البروتینات والشحوم.

شیر هەندێك لەکانزاکان و شەکری تواوەو هەندێك لەپرۆتینەکان و چەوری تێدایە.

[605]مخیض والدتي لذیذة.

دۆکەی دایکم زۆر بەچێژە.

[606]تاکەکەی (زاوِیة)یە. هەروەها بە (زاویات)یش کۆدەکرێتەوە.

جلس الطفل الغاضب في زاویة الغرفة وحیداً.

(خصَى) (خەساند)[609]ە، (خَصْي) خەساندن[610]

**233.** (مُكتشِف) چيە؟ دۆزەرەوەيە[611]

(رِثاء) بەماناى لاواندنەوەيە[612]

**234.** (مُؤسَّسة) چيە؟ دامەزراوە[613]

(عَجين) هەويرە[614]، (مَعْجون) دۆشاوە[615]

---

منداڵە تورەكە بەتەنها لەگۆشەى ژورەكەدا دانيشت.

607 خسَرَ يَخسِر ، خَسْرًا وخُسْرًا وخَسارةً وخُسْرانًا ، فهو خاسِر ، والمفعول مخسور.

خسَر التاجر ثروتَه في القمار.

بازرگانەكە سامانەكەى لەقوماردا دۆڕاند.

608 خسران النقود فى اللعب عمل شنيع.

دۆڕاندنى پارە لەياريدا كارێكى قێزەونە.

609 خصَى يَخصِي ، اخْصِ ، خَصْيًا وخِصاءً ، فهو خاصٍ ، والمفعول مَخْصِيّ وخَصِيّ.

خصَى الفلاح حِصانَه.

جوتيارەكە ئەسپەكەى خەساند.

610 ألا تعتقد بأن خَصْي الحيوانات عمل لا إنساني؟

لەو بڕوايەدا نيت كە خەساندنى گياندارا ن كارێكى نامرۆييە؟

611 من هو مكتشف البنسلين؟

دۆزەرەوە پەنسلين كێيە؟

612 چاوگى (رثَى)يە.

رثاء الميت حرام.

لاواندنەوەى مردوو حەرامە.

613 ج: مؤسَّسات

إنه يشتغل في مؤسَّسة علميّة.

لەدامەزراوەيەكى زانستيدا كاردەكات.

614 ج: عُجُن

يُصنع الخُبْزُ من العَجين.

نان لەهەوير دروستدەكرێت.

615 ج: معاجين

معجون التمر يُعالج اضطرابات المعدة، فهو يحتوي على مادة النيكوتين التي تساعد الجسم على التخلص من البكتيريا الضارة.

**.235** (حَشِيَّة) دۆشەك[616]، (مِخَدّة) سەرین[617]
(وَسادة)ش سەرین[618]، (شاسِع)ە بەرین[619]
**.236** (مِعَى) هەم (مِعاء)، (مَصير) ریخۆڵە[620]
(لَهاة) زمانە، بەڵام بچكۆلە[621]

---

دۆشاوی خورما چارەسەری تێكچونەكانی گەدە دەكات، چونكە ماددەی نیكۆتینی تێدایە كە یارمەتی جەستە دەدات لەڕزگاربونی لەبەكتریای زیانبەخش,

[616]ج: حَشِيَّات وحَشايا
اشتريت حَشِيَّة ملكية لغرفة نومنا.
دۆشەكێكی شاهانەم كڕی بۆ ژوری نوستنەكەمان.
[617]جمع مِخَدَّات ومَخادّ ومِخَادّ
وضع رأسه على مِخَدَّته ونام.
سەری خستەسەر سەرینەكەی و خەوت.
[618] هەروەها بە (وُسادة)و (وِسادة)ش دەنوسرێت.
ج: جمع وِسادات ووَسائد
رؤية الوسادة في الحلم تدل على الأبناء والزوجة.
بینینی سەرین لەخەودا ئاماژەیە بۆ منداڵ و هاوسەر.
[619]بەرین= فراوان.
جبت سهلاً شاسعاً ثم وصلت القرية.
دەشتێكی فراوانم بڕی، پاشان گەیشتمە گوندەكە.
[620]هناك مشكلة غير معروفة في مِعاه.
كێشەیەكی نەناسراو لەڕیخۆڵەیدا هەیە.
مِعاء الإنسان عضو معقد.
ریخۆڵەی مرۆڤ ئەندامێكی ئاڵۆزە.
أثبت فحص مصير المريض وجود ورم نظيف.
پشكنینی ریخۆڵەی نەخۆشەكە بونی لویەكی پاكی سەلماند.
[621]بەمانای زمانەبچكۆلە دێت.
ج: لَهَوات ولَهَيات ولَهًا.
من رأى في المنام أن لهاته زادت حتى كادت تسد حلقه دل ذلك على حرصه في جمع المال وتضييق النفقة على نفسه وقد دنا أجله.
ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی زمانەبچكۆلەی هێندە گەورە بوو كە خەریكە گەروی دادەخات، ئەوەی ئاماژەیە بۆ سوربونی ئەو كەسە لەسەر كۆكردنەوەی سامان و كەمكردنەوەی خەرجی بۆ خۆی و نزیكبونەوەی مەرگی.

237. (صَلاة) ماناى نوێژ[622]، (صَوْم) واته رۆژوو[623]

(نِفاق) دووڕوویی[624]، (مُنافِق) دووڕوو[625]

238. (الأَحَد) یەکشەم[626]، (الإِثنَین) دووشەم[627]

(عَصْر) گوشین و ئێوارەو سەردەم[628]

239. (نَمیمَة) چیە؟ دوزمانییە[629]

---

[622]جمع صَلَوات

صلاة الفجر صعبة على المنافيقن.

نوێژی بەیانی قورسە بۆ دوڕووەکان.

[623]إذَا نَسِيَ الصائم فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ.

ئەگەر رۆژووەوان لەبیریچوو، خواردی و خواردەوە، با رۆژووەکەی تەواوبکات. واتە با نەیشکێنێت.

[624]لا تبالغ في المجاملة حتى لا تسقط في بئر النفاق.

لەپیاهەڵداندا زیادەڕۆیی مەکە، بۆ ئەوەی نەکەویتەناو بیری دووڕوویيەوە.

[625]{إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ}

بێگومان دووڕووەکان لەخواری خوارەوەی دۆزەخدان.

[626]ج: الآحاد والأُحْدان والأَحَدون.

یەکشەم= یەکشەممە.

لا يعمل الأوربيّون أيّام الآحاد.

ئەوروپییەکان رۆژانی یەکشەممان کارناکەن.

[627] توفي الرئيس اَلإِثْنَيْن الماضي.

دووشەممەی رابردوو سەرۆك کۆچی دوایی کرد.

[628]لەماناى یەکەمیاندا چاوگی (عصَرَ)یە.

عَصْر الثوب المبلل باليد عمل صعب.

گوشینی جلوبەرگی تەڕ بە دەست کارێکی قورسە.

وصَل الضيف عَصْر اليوم.

میوانەکەی ئێوارەی ئەمڕۆ گەیشت.

كان عصر هارون الرشيد مرعباً لأعداء الإسلام.

سەردەمی هارونە رەشید تۆقێنەر بوو بۆ دوژمنانی ئیسلام.

[629]جمع نمائِم.

دوزمانی: قسەهێنان و بردن لەنێوان خەڵکدا بەمەبەستی خراپ.

الغيبة والنَّميمة من الكبائر.

(قَلَقْ) بەمانای نیگەرانییە[630]

**.240** (طبَعَ) چاپکرد[631]، (طابِع) چاپکەر، پول[632]

(دَخْل) داهاتە، جەمعەکەی (دُخول)[633]

**.241** (لبِسَ)، (ارتدى) هەردوو لەبەرکرد[634]

(طَريد) دەرکراو[635]، (طرَدَ) دەرکرد[636]

---

غەیبەتکردن و دوزمانی لەگوناهە گەورەکانن.

[630]القلق يدمّر القلب.

نیگەرانی دڵ لەناودەبات.

[631]طبَعَ يَطبَع طَبْعًا وطِباعةً، فهو طَابِع، والمفعول مَطْبوع.

طبَع كتابَه الجديد في مطبعة بيروت.

پەڕتوکە نوێیەکەی لەچاپخانەی بەیروت چاپکرد.

[632]لەمانای یەکەمیاندا ناوی بکەر (اسم فاعل)ی (طبَعَ)یە.

كان طابع الجريدة يعمل لمطبعة كبيرة.

چاپکەری کتێبەکە کاری بۆ چاپخانەیەکی گەورە دەکرد.

لصق الطابع بالرسالة.

پولەکەی بە نامەکەوە لکاند.

[633]هذا المشروع لا يدرُّ دَخْلاً كثيراً.

ئەم پرۆژەیە داهاتێکی زۆر ناهێنێت.

[634]لبِسَ يَلبَس ، لُبْسًا ، فهو لابس ، والمفعول مَلْبوس.

ارتدى، يَرتَدي ، ارْتَدِ ، ارتداءً ، فهو مُرتَدٍ ، والمفعول مُرتَدًى.

لبِس الثَّوبَ بسرعة.

جلوبەرگەکەی بەخێرایی لەبەرکرد.

ارتدى قميصه الجديد للحفلة.

کراسە نوێیەکەی لەبەرکرد بۆ ئاهەنگەکە.

[635]جمع طُرَدَاءُ وطَرْدَى، مؤ طريد وطريدة، جمع مؤ طريدات وطرائد.

الطالب الطريد يكره المدرس.

فێرخوازی دەرکراو رقی لەمامۆستایە.

[636]طرَدَ، يَطرُد، طَرْدًا، فهو طارِد ، والمفعول مَطْرود وطريد.

طرد المدرس الطالب المزعج من الصف.

مامۆستایەکە فێرخوازە بێزارکەرەکەی لەپۆلەکە دەکرد.

.242 (بُؤْرَة) سەرچاوەو چاڵە، هەم تیشکۆ[637]

(وُعَّاظ) ئامۆژگار، بەڵام تاك نا، كۆ[638]

.243 (عَدْوَى) چیە؟ تەنینەوەیە[639]

(اِكْتِشَاف) مانای دۆزینەوەیە[640]

.244 (إسْطَبل) چیە؟ مانای تەویلە[641]

(مَنْدِيل) دەستەسڕ، كۆی (مَنادِيل)ە[642]

.245 (فَوْضَى) بەمانای پاشاگەردانی[643]

---

[637] جمع بُؤُرات وبُؤْرات وبُؤَر.

أصبح الحزب بُؤْرة فساد.

حزبەكە بووەتە سەرچاوەیەكی گەندەڵی.

وقع الطفل في بؤرة كبيرة.

منداڵەكە كەوتەناو چاڵێكی گەورەوە.

تجمَّعت الحشرات عند بُؤْرة الضَّوء.

مێرووەكان لەلای تیشكۆی روناكییەكە گردبونەوە.

[638] تاكەكەی (واعِظ)ە. هەروەها بە (واعِظون)یش كۆدەكرێتەوە.

ئامۆژگار= ئامۆژگاریكەر.

يا واعظ الناس لا تفعل ما تنهي الناس عنه.

ئەی ئامۆژگاری خەڵك شتێك مەكە كە خەڵكی لێ رێگری دەكەیت.

[639] قد يكون الهواء سببًا في عَدْوَى الزُّكام.

دەكرێ هەوا هۆكارێك بێت لەتەنینەوەی هەڵامەتدا.

[640] اكتشاف سبب المرض خطوة مهمة بإتجاه علاجه.

دۆزینەوەی هۆكاری نەخۆشییەكە هەنگاوێكی گرنگە بە ئاڕاستەی چارەسەركردنی.

[641] جمع إسْطَبلات

في هذا الإسطبل خيول عربيّة أصيلة.

ئەم تەویلەیە ئەسپیی عەرەبیی رەسەنی تێدایە.

[642] منديلك أغلى لديّ من سيارة جديدة.

دەستەسڕەكەت لەئۆتۆمبێلێكی نوێ بەبەهاترە بەلامەوە.

[643] شاعت الفوضى في البلد.

پاشاگەردانی لەوڵاتدا بڵاوبووەوە.

(كأسُ العالَم)ە جامی جیهانی[644]

**.246** (صِناعة) چیە؟ پیشەسازییە[645]

(نادي) یانەیە، کۆکەی (أندية)[646]

**.247** (وَثِيقَة) چیە؟ بەڵگەنامەیە[647]

(جِنْسِيَّة)ش مانای رەگەزنامەیە[648]

**.248** (تَزْوِير) چیە؟ ساختەکردن[649]

(أرسلَ) واتە نارد[650]، (إرسال)یش ناردن[651]

---

[644] أيّ منتخب فاز بلقب بطولة كأس العالم؟

کام هەڵبژاردە نازناوی پاڵەوانێتیی جامی جیهانیی بردەوە؟

[645] صناعة السِّينما في العراق ضعيفة.

پیشەسازیی سینەما لەعیراق، لاوازە.

[646] هەروەها بە (نوادي)ش کۆدەکرێتەوە.

تناول الغداءَ في النادي.

نانی نیوەڕۆی لەیانەکە خوارد.

[647] جمع وَثائِق

هل عندك وثيقة زواجك؟

بەڵگەنامەی هاوسەرگیرییەکەت پێیە؟

[648] جمع جنسيَّات

هل حصلت على الجنسيَّة البريطانية؟

رەگەزنامەی بریتانیت بەدەستهێنا؟

[649] چاوگی (زوَّرَ)ە.

تزوير النقود جريمة كبيرة.

ساختەکردنی دراو تاوانێکی گەورەیە.

[650] أرسلَ، يُرسل، إرسالاً، فهو مُرسِل، والمفعول مُرسَل.

أرسل الرئيسُ مبعوثًا خاصًّا له للإجتماع.

سەرۆك نێردراوێکی تایبەتی خۆی نارد بۆ کۆبونەوەکە.

[651] چاوگی (أرسلَ)یە.

إرسال الأطفال الى السينما شيء مقيت.

ناردنی منداڵ بۆ سینەما شتێکی قێزەونە.

249. (اقْتِصاد) چیه؟ مانای ئابوری[652]

(مَسَافَة)و (مِشوار) هەردوكیان دوری[653]

250. (مَسِيرَة) چیه؟ واتە رێپێوان[654]

(وَزْن) كێش، كێشان، كۆی یەكەم (أوزان)[655]

251. (نَشَرَ)و (نَثَرَ) بڵاوكردەوە[656]

(جدَّدَ) مانای تازەكردەوە[657]

---

[652] زوجها أستاذ في الاقْتِصاد السِّياسيّ.

مێردەكەی مامۆستای ئابوریی سیاسییە.

[653] جمع مسافة: مسافات ومساوفُ.

جمع مشوار: مشاوير

المسافة بين المدينتين قليلة.

دوریی نێوان دوو شارەكە كەمە.

أن المشوار الذي يقطعه الدم في مجراه كل يوم يبلغ ١٦٨ مليون ميل .

ئەو دورییەی خوێن هەموو رۆژێك لەڕێرەوەكەیدا دەیبڕێت، دەگاتە 168 ملیۆن میلی ناسك!

[654] خرج طلبة الجامعة في مسيرة سلميَّة للتنديد بالفساد.

خوێندكارانی زانكۆكە لەڕێپێوانێكی ئاشتیخوازانەدا دەرچون بەمەبەستی ئیدانەكردنی گەندەڵی.

[655] واتە وشەی (وزن) بەمانای (كێش)و (كێشان)یش دێت، كۆی ئەم وشەیەش لەمانای یەكەمیاندا (أوزان)ە. لەمانای دووەمیاندا چاوگی (وَزَنَ)یە.

أن وزن الطن من الحديد بعد أن يصدأ تماماً يصبح ثلاثة أطنان.

كێشی تۆنێك لەئاسن پاش ئەوەی بەتەواوەتی ژەنگدەكات، دەبێتە سێ تۆن.

وَزْن الأشياء الثقيلة باليد عمل مرهق.

كێشانی شتگەلی قورس بەدەست، كارێكی شەتەككەرە.

[656] نَشَرَ الكاتب كِتَاباً جَدِيداً.

نوسەر كتێبێكی نوێی بڵاوكردەوە.

تدخين سيجارة واحدة فقط ينثر في الهواء أربعة ملايين جزيء من الرماد.

كێشانی تەنها یەك جگەرە، چوار ملیۆن گەردی خۆڵەمێش لەهەوادا بڵاودەكاتەوە. (ئەگەر بڕواش ناكەیت بیژمێرە!).

[657] جدَّدَ يُجدِّد ، تجديدًا ، فهو مُجدِّد ، والمفعول مُجدَّد.

جدَّدوا انتخابَ الرَّئيس.

هەڵبژاردنی سەرۆكیان تازەكردەوە.

252. (وِلادة) چيه؟ لەدايكبون[658]

(حَفْلَة تخرُّج) ئاهەنگی دەرچون[659]

253. (فَكّ) شەويلگەيە، جەمعەكەی (فُكُوك)[660]

(مُنجَد) واتە شاخ، بەڵام هی بچوك[661]

254. (تِمْسَاح) تيمساحە[662]، (بُوَيْضة) هێلكۆكە[663]

(سُلَحْفاة) كيسەڵ[664]، (زاحِف) خشۆكە[665]

255. (خُصْيَة) هێلكەگون[666]، (قَضيب)، (آلة) چوك[667]

---

[658]الطفل لا يمكنه البكاء قبل مرور خمسة أسابيع على الأقل بعد الولادة، إذ تبدأ حينئذٍ فقط القنوات الدمعية في عملها.

مندالْ پێش تێپەڕبونی پێنج هەفتە بەسەر لەدايكبونيدا ناتوانێت بگری، چونكە پاش ئەو كاتە جۆگەكانی فرمێسكی دەستدەكەن بەكار.

[659]لم أستطع الذهاب الى حَفْلَة تخرُّج صديقتي بسبب المرض.

بەهۆی نەخۆشييەوە نەمتوانی بچم بۆ ئاهەنگی دەرچونی هاوڕێكەم.

[660] كلّ الكائنات تحرّك فكّها السفلي عند الأكل، عدا التمساح، الذي يحرّك فكّه العلوي.

هەموو گياندارانی لەكاتی خواردندا شەويلگەی خوارەوەيان دەجوڵێنن، جگەلە تيمساح كە هی سەرەوەی دەجوڵێنێت.

[661]بيتنا قريب من المنجد.

ماڵمان لەشاخە بچكوكەكەوە نزيكە.

[662]جمع تَماسِيح

ذيل التمساح يساعده على السباحة بسرعة 25 ميلاً في الساعة.

كلكی تيمساح يارمەتيدەدات لەمەلەكردن بە خێرايی 25 ميل لەسەعاتێكدا.

[663]هل تعرف ما هي البويضة؟

ئايا دەزانيت هێلكۆكە چيە؟

[664]جمع سلاحِف

تعيش السلاحف لأعمار كبيرة جداً، قد تصل إلى قرنيين.

كيسەڵ تەمەنێكی زۆر دەژی، رەنگە بگاتە دوو سەدە.

[665]ج: زواحِف.

خشۆك: زيندەوەری خشۆك وەك مارو كيسەڵ و هتد...

الثعبان زاحف بلا أرجل.

مار خشۆكێكی بێپێيە.

[666]جمع خُصْيات وخُصًى

خُصْيَتي اليسرى أكبر من نظيرتها اليمنى.

(كَبير) گەورەيە[668]، (صَغير)یش بچوك[669]

**256.** (صَحْرَاء) بيابان، كۆكەی (صَحْراوات)[670]

(عادَ) گەڕاوە[671]، (عائِد)یش داهات[672]

---

هێلكەگونی چەپم لەهی راستم گەورەترە.

[667]هەردوكيان بەمانای چوك دێن. چوك= كێر.

قضيبه كبير جداً.

چوكی زۆر گەورەيە.

لا توجد أية علاقة بين حجم أنف الرجل و آلته.

هيچ پەيوەندييەك نيە لەنێوان قەبارەی لوتی پياوو چوكيدا.

[668]جمع كِبار وكُبراءُ، مؤ كبيرة، جمع مؤ كبيرات وكبائِر (لغير العاقل).

التلفاز جهاز كبير.

تەلەفزيۆن ئامێرێكی گەورەيە.

[669]جمع صِغار، مؤ صغيرة، جمع مؤ صغيرات وصَغائرُ وصِغار.

الكتاب صغير في الحجم ولكن فحواه مفيد للغاية.

كتێبەكە لەقەبارەدا بچوكە، بەڵام ناوەڕۆكەكەی ئەوپەڕی بەسودە.

[670]هەروەها بە (صَحارَى)و (صَحارِيّ)يش كۆدەكرێتەوە.

أن أكبر صحراء في العالم هي الصحراء الكبرى في شمال أفريقيا.

گەورەترين بيابان لەجيهاندا بيابانی گەورەيە لەباكوری ئەفەريقا.

[671]عادَ يَعود، عُدْ، عَوْدةً وعَوْدًا، فهو عائد.

گەڕاوە= گەڕايەوە.

عادَ المهاجر الى مسقط رأسه.

كۆچبەرەكە گەڕايەوە بۆ زێدی خۆی.

عاد أديسون الصغير إلى بيته، قال لأمه: هذه رسالة من إدارة المدرسة

غمرت عينيها الدموع وهی تقرأ لابنها الصغير محتوى الرسالة، حيث قرأت له:

"ابنك عبقري والمدرسة صغيرة عليه وعلى قدراته، عليك أن تعلميه بالبيت".

مرت السنوات وتوفيت أم أديسون والذي تحوّل إلى أكبر مخترع بالتاريخ البشري.

وفي أحد الأيام وهو يبحث بخزانة والدته وجد رسالة كان نصها:

" ابنك غبي جدا. فمن صباح الغد لن ندخله إلى المدرسة"

بكى أديسون لساعات طويلة وبعدها كتب في دفتر مذكراته:

أديسون كان طفلا غبياً ولكن بفضل والدته الرائعة تحول لعبقري.

**257.** (مِساحة) روبەر[673]، (حَجْم) قەبارە[674]

(سُور) لەگەڵ (جِدار) هەردوو دیوارە[675]

**258.** (إِصْبَع) پەنجەیە[676]، (خِنْصَر)یش توتە[677]

---

جارێك ئەدیسۆن بە منداڵی لەخوێندنگە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بە دایكی گوت: ئیدارەی خوێندنگەكە ئەم نامەیان پێداوم. دایكی نامەكەی لێ وەردەگرێت و چاوی پڕدەبێت لەفرمێسك و بەچاوی پڕ لەفرمێسكەوە "نامەكە دەخوێنێتەوە"و پێیدەڵێت: "كوڕەكەت بلیمەتەو خوێندنگەكە بچوكە بە بەراورد بە تواناكانی، بۆیە پێویستە لەسەرت لەماڵەوە فێری بكەیت." چەندین ساڵ هاتن و تێپەڕین و دایكی ئەدیسۆن كۆچیدوایی كردو ئەدیسۆن بوو بە گەورەترین داهێنەر لەمێژوی مرۆڤایەتیدا. رۆژێك لەكاتێكدا بەناو شتە كۆنەكانی دایكیدا دەگەڕا، نامەكەی دۆزییەوە كە تێیدا نوسرابوو: "كوڕەكەت زۆر گێلە، لەسبەینێوە نایەڵین بێتە ناو خوێندنگەكە". كاتێك ئەدیسۆن ئەمەی بۆ دەركەوت، كاتێكی زۆر گریاو دواتر لەیاداشتەكانیدا نوسیویەتی: "ئەدیسۆن منداڵێكی گێل بوو، بەڵام بە هۆی دایكە نایابەكەیەوە بوو بە بلیمەتێك."

[672] جمع عائدات وعوائد

عائدُ تجارتي الحالية قليل.

داهاتی بازرگانییەكەی ئێستام كەمە.

[673] مساحة بيتي الجديد أكبر.

روبەری ماڵە تازەكەم گەورەترە.

[674] جمع أحْجام وحُجُوم

هل تعتقد بأن حجم الثلاجة مناسب للغرفة.

لەو بڕوایەدایت كە قەبارەی بەفرگرەكە گونجاوە بۆ ژورەكە؟

[675] هل زرت سور الصين العظيم؟

ئایا سەردانی دیواری مەزنی چینت كردووە؟

جدار الغرفة غير نظيف.

دیواری ژورەكە پاك نیە.

[676] ئەم وشەیە بە نۆ سپێڵی جیاواز دەنوسرێت. دەتوانرێت هەر سێ حەرەكەی زەممەو فەتحەو كەسرە لەسەر هەمزەو بائەكەش بەكاربهێنرێت. وشەكە مێیە بەڵام جاری واش هەیە بە داڕشتەی نێریش بەكاردەهێنرێت.

ج: أصابع

أن نمو ظفر إصبعك الوسطى هو أسرع، بينما نمو ظفر إبهامك هو الأبطأ.

گەشەكردنی نینۆكی پەنجەی ناوەڕاستت خێراترینەو هی پەنجەگەورەت خاوترینە.

[677] هەروەها بە سپێڵی (خِنْصِر)یش دەنوسرێت. كۆكەی (خَناصِر)ە.

بێگومان مەخسەوی شەریفم لە توتە، پەنجەتوتەیە.

إذا شعرت بألم في أصبعي البنصر والخنصر لليد اليسرى، فإن ذلك يدل على مشاكل بالعمود الفقري.

(مُضاعَفة)یە مانای لێکەوتە[678]

**.259** (زِفاف) چیە؟ هاوسەرگیری[679]

(سُمْك)و (سَماكة) هەردوو ئەستوری[680]

**.260** (غَزال)و (ظَبْي) هەردوو ئاسکە[681]

(نظّارة) عەینەك، واتە چاویلکە[682]

**.261** (قُضَاعَة) ڕێوی، بەڵام هی ئاوی[683]

---

گوێی شەیتان کەڕبێ و چاویشی کوێربێ ئەگەر هەستتکرد بە ئازار لەهەردوو پەنجەی برای توتەو پەنجەتوتەی دەستی چەپتدا، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە کێشە لەبڕبڕەی پشتدا هەیە.

[678]جمع مُضاعَفات

لمرض السُّكَّر مضاعفات كثيرة.

نەخۆشیی شەکرە چەندین لێکەوتەی هەیە.

[679] أرسل تهنئة بزفاف العروسين.

بەبۆنەی هاوسەرگیریی بوك و زاوا‌وە، پیرۆزبایی نارد.

[680]أن أكبر بيضة في العالم الآن هي بيضة النعامة، يصل وزنها الى كيلوجرامين تقريباً، وُسمك قشرتها يبلغ 1,5 ميليمتراً تقريباً.

گەورەترین هێلکە لەجیهانی ئێستادا هی حوشترملە، کێشی دەگاتە نزیکەی دوو کیلۆگرام و ئەستوریی توێکڵەکەی دەگاتە نزیکەی یەك میلیمەترو نیو.

أن الحلقات التي تدور حول زحل يبلغ طولها 80500 كم ، ولكنها ذات سماكة لا تتجاوز 30 سنتيمتراً.

ئەو ئەڵقانەی بە دەوری هەسارەی زوحەلدا دەسوڕێنەوە، درێژییەکەیان دەگاتە 80 هەزارو 500 کیلۆمەتر، بەڵام ئەستورییەکەیان لە 30 سانتیمەتر تێپەڕناکات.

[681]يستطيع صغير الغزال الوقوف على قدميه خلال 10 دقائق من ولادته والسير خلال 7 ساعات من ولادته .

بێچوی ئاسك دەتوانێت پاش 10 خولەك لە لەدایکبونی لەسەر پێی خۆی بووەستێت و پاش حەوت سەعاتیش لە لەدایکبونی دەتوانێت بڕوات.

الظبي لديه حاسة سمع قوية.

ئاسك هەستێکی بەهێزی بیستنی هەیە.

[682]جمع نظَّارات

نظّارتك طبيَّة أم حبّية؟!

چاویلکەکەت پزیشکییە یان هی خۆشەویستی؟!

[683]بەمانای ڕێویی ئاویی دێت. سەگی ئاویشیی پێدەووترێت. گیاندارێکی مەمکداری وشکاوەکییەو زیاتر ماسی و مەحار دەخوات.

يَصِلُ وَزْنُ القُضَاعَة الى 40 كيلوغراماً.

(وَزّ)و (إوَزّ) قاز[684]، (بَطّ)یش مراوی[685]

**262.** (ذِلال) رسواو کەم، بەڵام تاك نا، کۆ[686]

(فَحْم) خەڵوزە[687]، (جَمْرَة)یە پشکۆ[688]

**263.** (قُنْفُذ البحر) ژیژکی دەریا[689]

(مَوْسوعة) مانای ئینسایکلۆپیدیا[690]

---

کێشی رێویی ئاوی دەگاتە 40 کیلۆگرام.

[684]الوَزّ سبّاح ماهر.

قاز مەلەوانێکی کارامەیە.

یعیش الإوَزّ قرب المیاه العذبة أو قلیلة الملوحة.

قاز لەنزیك ئاوی شیرین یان کەمخوێ دەژی.

[685]مفرد بَطَّة

فراخ البطّ مستقلة تمامًا ومستعدة لترك أعشاشها منذ ولادتها.

بێچوی مراوی تەواو سەربەخۆیەو هەر لەکاتی لەدایکبونییەوە ئامادەیە بۆ جێهێشتنی هێلانەکەی.

[686]بەمانای رسواو کەم دێت، بەڵام وشەکە تاك نیە، بەڵکو کۆیە. تاکەکەی (ذَلیل)یە. هەروەها بە (أذِلاّء) و(أذِلّة)ش کۆدەکرێتەوە.

رسوا: خوێڕی

إنه شابّ ذلیل، لا یحترمه أحد.

گەنجێکی رسوایە، کەس رێزی لێناگرێت.

{وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ}

بەڕاستی خوای گەورە لەجەنگی بەدردا سەریخستن هەرچەندە کەم بوون. مەبەست لەوەیە کە هەرچەندە ژمارەی موسڵمانەکان کەم بوو.

[687]الفَحْم لونه أسود.

رەنگی خەڵوز رەشە.

[688]جمع جَمَرات وجَمْرات وجِمار وجَمْر.

هل تستطیع حمل تلك الجمرة.

ئایا دەتوانیت ئەو پشکۆیە هەڵبگریت؟

[689]جمع قَنافِذُ البحر.

یمکن ان یعیش قنفذ البحر لمدة 25 عاماً.

دەکرێ ژیژکی دەریا بۆ ماوەی 25 ساڵ بژی.

[690]ئینسایکلۆپیدیا= بازنەی زانیاری= دەریای زانیاری.

**.264** (ضُلوع) بەمانای بەشداریکردن[691]

(مُدَاهَنَة)یە مەراییکردن[692]

**.265** (ثَلْج) ساردو بەفر، هەروەها سەهۆڵ[693]

(لَيِّن) واتە نەرم[694]، (أَغْيَد) نەرمونۆڵ[695]

**.266** (جِهاز) کۆئەندام، دەزگا، هەم ئامێر[696]

---

هل قرأت مَوْسوعتي الجديدة؟

ئینسایکلۆپیدا تازەکەمت خوێندەوە؟

[691]تمّ القبضُ عليه لضلوعه في أحداث الشغب الأخيرة.

بەهۆی بەشداریکردنی لەکارە ئاژاوەگێڕییەکانی ئەمدواییە، دەستگیرکرا.

[692]چاوگی (داهنَ)یە. مەراییکردن= ماستاوکردن.

ليس من الصعب الوصول إلى الحكم، كل ما عليك القيام به هو مداهنة العائلات النبيلة. منسيوس

گەیشتن بە دەسەڵات قورس نیە، تەنها پێویستت بە مەراییکردنە بۆ بنەماڵە خانەدانەکان.

[693]جمع الجمع ثُلُوج،مفرد ثَلْجَة.

ضرر الماء الثَلْج أكثر من نفعه.

ئاوی سارد زیانەکەی لەسودەکەی زیاترە.

تساقط ثلج في المناطق الحارة، يفرح الناس.

بارینی بەفر لەناوچە گەرمەکان خەڵك دڵخۆشدەکات.

الحرّ وشحّ الكهرباء ينعشان أسواق الثلج في سوريا.

گەرماو کەمیی کارەبا بازاڕەکانی سەهۆڵ دەبوژێننەوە.

[694]جمع ليِّنون وأليناءُ (للعاقل)

وسادتك ليّنة جداً.

سەرینەکەت زۆر نەرمە.

[695]جمع غِيد، مؤ غَيْداءُ، جمع مؤ غَيْداوات وغِيد.

اشتريت خروفاً أغيداً لعيد الأضحى.

بەرخێکی نەرمونۆڵم کڕی بۆ جەژنی قوربان.

[696]الجمع : أَجْهِزة

وباء كورونا يضرب الجِهَاز التَّنَفُّسِيّ.

پەتای کۆرۆنا لەکۆئەندامی هەناسەدان دەدات.

كان جهاز مخابرات نظام صدام يقتل الناس بسهولة.

دەزگای هەواڵگریی ڕژێمی سەدام خەڵکی بەئاسانی دەکوشت.

(تأْمور) دڵ و خوێن، ئاوو لانە(ی شێر)[697]

**.267** (خُنْفَساء) چیە؟ مانای قالۆنچە[698]

(قَمْلَة) ئەسپێیە[699]، (بَرْغوث)یش کێچە[700]

**.268** (جَرّ) لەگەڵ (سَحْب) هەردوو راکێشان[701]

(رَفرفَ بـ)یە مانای راوەشان[702]

---

اِمْتَلأَتِ الأَسْوَاقُ بِالأَجْهِزَةِ الإِلِكْتِرُونِيَّةِ.

بازاڕەکان پڕبون لەئامێری ئەلیکترۆنی.

[697] الجمع : تآمِير. چوار لەماناکانی دڵ (قلب) و خوێن (دم) و ئاو (ماء)و لانەی شێر(عرين الأسد)ن.

اجعل هذا الأَمر في تأَمُورِكَ.

ئەم شتە بخەرە ناو دڵتەوە.

التأمور جزء أساسي في بنية الإنسان.

خوێن بەشێکی بنچینەییە لەپێکهاتەی مرۆڤدا.

ما في البئر تَأمورٌ.

بیرەکە ئاوی تێدا نیە.

الأسد نائم في تأموره.

شێرەکە لەلانەکەیدا خەوتووە.

[698] هەروەها بە سپێڵی (خُنْفُساء)یش دەنوسرێت.

جمع خُنْفساوات وخَنافِس

يرقات الخنفساء تشبه التماسيح الصغيرة.

کرمۆکەی قالۆنچە لەتیمساحی بچوك دەچێت.

[699] جمع قَمَلات وقَمْلات وقَمْل

القمل لا تقفز أو تطير من رأس شخص إلى آخر كما يعتقد الكثيرون.

بەپێچەوانەی بڕوای زۆرێك لەخەڵك، ئەسپێ لەسەری کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر بازنادات یان نافڕێت.

[700] بە سپێڵی (بُرْغوث)و (بِرْغوث)یش دەنوسرێت.

أن البرغوث يستطيع أن يقفز مسافة تعادل طوله 200 مرة.

کێچ دەتوانێت بە دووریی 200 ئەوەندەی درێژییەکەی خۆی، بازبدات.

[701] جرّ الحقيبةَ الكبيرة أسهل من حملها.

راکێشانی جانتای گەورە لەهەڵگرتنی ئاسانترە.

سحب الأشياء الثقيلة يضرّ بالعمود الفقري.

راکێشانی شتگەلی قورس زیان بە بڕبڕەی پشت دەگەیەنێت.

**.269** (ذِئْب) واته گورگ[703]، (رِئْبال) گورگ و شێر[704]

(جَهِيزَة) گورگ، ورچ، بەڵام مێ نەك نێر[705]

**.270** (لِماذا) بۆچی؟[706]، (لِمَ) مانای بۆ؟[707]

---

[702]رفرفَ بـ يُرفرف، رَفْرَفَةً ، فهو مُرَفرِف ، والمفعول مُرَفْرَف.

بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی (راوەشان)، (راوەشاند)ە، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە، پیتی (د)ەکەی بەر جادە کەوتووە!

رفرف الطَّائرُ بجناحيه.

باڵندەکە باڵەکانی راوەشاند.

[703]جمع أذؤُب وذِئاب وذُؤْبان، مؤ ذِئْبة.

{وَأَخَافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ}

دەترێم گورگ بیخوات.

[704]الجمع : رَآبيل ، و رآبِلة.

بەمانای گورگ و شێریش دێت. زیاتر بەمانای گورگێك دێت کە زۆر تاوانبار بێت نەك گورگ بەگشتی، هەروەها شێرێك کە ددانەکانی تەواو هاتبن نەك شێر بەگشتی.

هاجم الرِئْبال الراعي.

گورگەکە هێرشیکردە سەر شوانەکە.

الرئبال حيوان مفترس.

شێر ئاژەڵێکی دڕندەیە.

[705]بەمانای گورگ یان ورچی مێ دێت. گورگی مێ= دەڵەگورگ. ورچی مێ= دەڵەورچ.

طاردت الجَهيزة القطيع.

دەڵەگورگەکە مێگەلەکەی راونا.

الجهيزة الجائعة خطيرة، لذا لا تقترب منها.

دەڵەورچی برسی مەترسیدارە، بۆیە لێی نزیك مەبەرەوە.

[706] لماذا تأخَّرت عن الموعد؟

بۆچی لەمەوعیدەکە دواکەوتیت؟

الأول: لماذا أنت دائماً منشرح الصدر؟

الثاني: لإنني دائما أقول لمن يجادلني أنت محق وأتخلص منه .

الأول: ولكن هذا خطأ !

الثاني: أنت محق .

یەکەم: ئەرێ بۆچی تۆ هەمیشە ئاسودەیت؟

دووەم: لەبەرئەوەی هەمیشە بەو کەسانەی چەلەحانیم لەگەڵ دەکەن، دەڵێم قسەکەت تەواوە، بەو شێوەیە لەکۆڵ خۆمیان دەکەمەوە.

(مَضائِق) گەروو، بەڵام تاك نا، کۆ[708]

**.271** (ذَخيرة) تفاق، واتە ئازوقە[709]

(حَقّ) ماف و راستی، کۆکەی (حُقُوق)ە[710]

**.272** (تردُّد) چیە؟ مانای دودڵی[711]

(كَثيف) واتە چڕ[712]، (كَثافة) چڕی[713]

---

یەکەم: بەڵام ئەوە کارێکی هەڵەیە.

دووەم: قسەکەت تەواوە!

[707] لِمَ عصيتَه؟

بۆ لێی یاخی بویت؟

[708] تاکەکەی (مَضيق)ە. به (مَضايق)یش کۆدەکرێتەوە.

اجتاز مضيقَ جبل طارق.

گەرووی جەبەل تاریقی تێپەڕاند.

[709]جمع ذخيرات وذخائر.

بەمانای تفاق و ئازوقەی خواردنی خەزنکراو دێت.

نفدت ذخيرتنا، يجب عليّ الذهاب الى السوق.

ئازوقەکەمان تەواوبوو، پێویستە بڕۆم بۆ بازاڕ.

[710]هەروەها بە (حِقاق)یش کۆدەکرێتەوە.

أُعطي كُلَّ ذي حقّ حقَّه.

هەموو خاوەنمافێك مافەکەی پێدرا.

قول الحقِّ لم يدع لي صديقًا.

وتنی راستی هیچ هاوڕێیەکی بۆ نەهێشتمەوە.

[711]جمع تردُّدات

دودڵی= ڕاڕایی.

الترَدُّد أكبر عقبة في طريق النجاح.

ڕاڕایی گەورەترین کۆسپە لەبەردەم سەرکەوتندا.

التردد مقبرة الفرص.

دودڵی گۆڕستانی هەلە.

[712]جمع كِثاف، مؤ كثيفة، جمع مؤ كِثاف.

الغابة كثيفة جداً.

دارستانەکە زۆر چڕە.

273. (هُدْب) برژانگە[714]، (حاجِب)یش برۆ[715]

(قَدَم) پێ[716]، (فَخِذ) ران[717]، (رُكْبَة) ئەژنۆ[718]

274. (تَمييز) جياكارى، هەم جياكردنەوە[719]

(تدريس) بەمانای وانەوتنەوە[720]

275. (صَيْدليّ) چيە؟ واتە دەرمانساز[721]

---

[713]أن كثافة كوكب زحل قليلة جداً، بحيث انك لو جعلت هذا الكوكب يسقط في بحر وسيع لطفا على سطحه.

چڕيی هەسارەی زوحەل هێندە کەمە کە ئەگەر بیخەیتەخوارەوە بۆ ناو دەریایەکی فراوان، ئەوا دەکەوێتە سەر ئاو (نقوم نابێت).

[714]هەروەها بە (هُدُب)یش دەنوسرێت.

الجمع: أَهْداب، مفرد هُدْبة وهُدُبة.

أَهْدابها جذّابة جدّاً.

برژانگەکانی زۆر سەرنجڕاکێشن.

[715]جمع حواجب

ظهر الشَّيب في حاجبه الأيمن.

پیری لەبرۆی راستیدا دەرکەوت.

716 قَدَمك اليسرى عريضة.

پێی چەپت پانە.

[717]جمع أفخاذ.

يعاني من ألمٍ في فَخِذِه اليُمنى.

بەدەست ئازارێکەوە دەناڵێنێت لەڕانی راستیدا.

[718]جمع رُكُبات ورُكْبات ورُكَب.

أجريت له عملية جراحية في ركبته اليسرى.

نەشتەرگەرییەکی لەئەژنۆی چەپیدا بۆ ئەنجامدرا.

[719] التَّمييز العنصريّ عمل حرام.

جياكاريی رەگەزپەرستی کارێکی حەرامە.

تمييز الحق عن الباطل عمل غير صعب.

جياكردنەوەی حەق لەناحەق کارێکی قورس نیە.

[720]چاوگی (درَّسَ)یە.

التَّدريس مهنة عالية.

وانەوتنەوە پیشەیەکی باڵایە.

[721]جمع صَيادِلة

(لُغْز) مەتەڵە، جەمعەکەی (ألغاز)[722]

**.276** (بَسَطَ) ڕاخست[723]، (بِساط)یش بەڕە[724]

(مُحيط) هەم زەریا، هەم دەوروبەرە[725]

**.277** (عَقْد) گرێبەست، دەیە، کۆی (عُقودْ)[726]

(مُضِرّ) زیانبەخشە[727]، (مُفِيد)یش بەسود[728]

---

أعدَّ الصَّيدليُّ الدَّواءَ.

دەرمانسازەکە دەرمانەکەی ئامادەکرد.

[722]لغزك يَعب جداً.

مەتەڵەکەت زۆر قورسە.

[723]بسَطَ يَبسُط ، بَسْطًا ، فهو باسِط ، والمفعول مَبْسوط

بسَطَ الطفل السَّجَّادةَ لوالدتها.

منداڵەکە بەرماڵەکەی بۆ دایکی ڕاخست.

[724]جمع أَبْسِطَة وبُسُط

سحب البساطَ من تحت قدميه.

بەڕەکەی لەژێر پێی دەرهێنا. تەبعەن ئەم ڕستەیە وێڕای مانای حەقیقی، مانای مەجازیشی هەیە.

[725] جمع مُحيطات.

دەوروبەر: ژینگە.

هل تعلم كم هي مساحه المحيط الهاديّ؟

دەزانیت ڕوبەری زەریای ئارام چەندە؟

قطرة واحدة من الاكاذيب تفسد محيطا من الثقة.

یەك تنۆك درۆ زەریایەك متمانە پیسدەکات.

المرءُ نتاج محيطه الاجتماعيّ.

مرۆڤ بەرهەمی دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەکەیەتی.

[726]فُقدَ عقد زواجنا.

گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەمان ونبوو.

حصل على الدكتوراة وهو في العقد الرابع من عمره.

لەدەیەی چوارەمی تەمەنیدا، بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێنا.

[727]التدخين مُضِرّ للصحة والمال.

جگەرەکێشان زیانبەخشە بۆ تەندروستی و سامانیش.

[728] بەسود= سودبەخش.

278. (عِلمُ النّفس) واتای دەرونزانییە[729]

(تِجارة)ش مانای بازرگانییە[730]

279. (صالِح) شیاوە، هەروەها پیاوچاك[731]

(عَفيف) داوێنپاك[732]، (أمين)یش دەسپاك[733]

280. (خُطوبة) چیە؟ دەزگیرانداری[734]

(مَطِيَّة) وڵاخ، بەڵام هی سواری[735]

---

كن رجلاً مفيداً للمجتمع.

ببە بەپیاوێکی بەسود بۆ کۆمەڵگە.

[729]دەرونزانی= دەروونناسی: زانستی دەرون.

هل تعلم شيئاً عن علم النفس؟

ئایا هیچ شتێك سەبارەت بە دەرونزانی دەزانیت؟

[730]تجارة المخدرات عمل حرام.

بازرگانیی مادده هۆشبەرەکان کارێکی حەرامە.

[731]هل الماءُ صالحٌ للشّرب؟

ئایا ئاوەکە شیاوە بۆ خواردنەوە؟

الموت لا يفرّق بين الصالح والطالح.

مەرگ جیاوازی ناکات لەنێوان پیاوچاك و پیاوخراپدا.

[732]جمع أعفّاءُ وأعِفَّة، مؤ عفيفة، جمع مؤ عفيفات وعفائف.

أبحث عن شاب عفيف لأزوجه إبنتي.

بەدوای گەنجێکی داوێنپاکدا دەگەڕێم بۆ ئەوەی کچەکەمی پێبدەم.

[733]جمع أُمناء

دەسپاك= دەستپاك.

التاجر يبحث عن شاب أمين ليشتغل معه.

بازرگانەکە بەدوای گەنجێکی دەسپاکدا دەگەڕێت کە کاری لەگەڵدا بکات.

[734]طالت فترةُ خُطوبته.

ماوەی دەزگیرانداریيەکەی درێژەی کێشا.

[735]جمع مطيّات ومَطايَا ومَطِيّ.

بەمانای وڵاخی سواری دێت، وەك حوشترو ئەسپ و گوێدرێژو هتد...

حماره مطيّته.

**.281** (عِبارة) چیە؟ دەستەواژە[736]

(مُوظَّف) کارمەند[737]، (خِدْمَة)یە ڕاژە[738]

**.282** (بالضَّبط) چیە؟ واتە کتومت[739]

(ضبَطَ) میقاتکرد، دێش بەمانای گرت[740]

**.283** (ثَخین) واتە خەست[741]، (غَلیظ) ئەستورە[742]

---

وڵاخە سوارییەکەی کەرەکەیەتی.

[736]جمع عبارات

عبارات المجاملة لا تغريني.

دەستەواژەی پیاهەڵدا فریومنادات.

[737]کارمەند= فەرمانبەر.

للموظَّف مواعيد ثابتة للحضور والانصراف.

کارمەند وادەی جێگیری هەیە بۆ ئامادەبون و ڕۆیشتن.

[738]جمع خِدْمات

ڕاژە= خزمەت.

كم هي مدة خدمتك في وزارة الصحة؟

ماوەی ڕاژەکەت لەوەزارەتی تەندروستی چەندە؟

[739]کتومت= دەقاودەق: بێزیادو کەم.

يقع بيتي بالضبط إزاء المسجد.

ماڵەکەم کتومت دەکەوێتە بەرامبەر مزگەوتەکە.

[740]ضبَطَ يَضبُط ويَضبِط ، ضَبْطًا ، فهو ضابط ، والمفعول مَضْبوط.

ضبَط الطفل ساعتَه بنفسه.

منداڵەکە خۆی کاتژمێرەکەی میقاتکرد.

ضبَط الشرطيُّ المجرمَ.

پۆلیسەکە تاوانبارەکەی گرت.

[741]لا أحبّ الشاي الثخين.

حەزم لەچای خەست نیە.

[742]جمع غِلاظ

هل القضيب الغليظ يؤذي المرأة أم يمتّعها أكثر؟

ئایا چوکی ئەستور ژن ئازاردەدات یان زیاتر چێژی پێدەگەیەنێت.

(قَريب) نزيكه[743]، (بَعيد)يش دووره[744]

**284.** (مَشروب) خواردنەوە، لەگەڵ خوراوە[745]

(ساخِن) واته گەرم[746]، كوتەك (هِراوة)[747]

**285.** (مُضيف) خانەخوێ[748]، (ضَيْف) واته ميوان[749]

(كُسوف) خۆرگيران[750]، (خُسُوف) مانگگيران[751]

---

[743]جمع قريبون وأقْرباءُ وقَرَابَى، مؤ قريب وقريبة، جمع مؤ قريبات وقرائِب.

بيتنا قريب من المسجد.

ماڵمان لەمزگەوتەكەوە نزيكە.

[744]جمع بَعيدون (للعاقل) وبِعاد وبُعُد وبُعداءُ وبُعْدان وبعيد، مؤ بعيد وبعيدة، جمع مؤ بعيدات وبعيد.

البعيد عن العين، بعيد عن القلب.

دوور لەچاو، دوورە لەدڵ.

[745]لەماناى دووەمياندا ئيسمى مەفعولى (شَرِبَ)يە.

أن الكأس السميك معرض للكسر أكثر من الكأس الرقيق فيما إذا وضع به مشروب ساخن.

پەرداخى ئەستور ئەگەرى شكانى زياترە لە هى تەنك ئەگەر خواردنەوەى گەرمى تێبكرێت.

العصير المشروب لن تراه مجدداً.

شەربەتى خوراوە، جارێكى تر نايبينيتەوە.

[746]أن أنابيب الماء الساخن تتجمد أسرع من أنابيب المياه الباردة.

بۆريى ئاوى گەرم لە هى ئاوى سارد خێراتر دەيبەستێت.

[747]جمع هِراوات وهَراوَى وهُرِيّ.

ضرب الشرطي المتظاهر بالهراوة.

پۆليسەكە بە كوتەك لەخۆپيشاندەرەكەى دا.

[748]احترم المضيف الضيوف كثيراً.

خانەخوێيەكە زۆر رێزى لەميوانەكان گرت.

[749]جمع أضياف وضِيفان وضُيوف، مؤ ضَيْف وضَيْفة.

من كان يؤمن بـالله واليوم الآخر، فليكرم ضيفه.

هەر كەسێك برواى بە خوداو رۆژى دوايى هەيە، با رێز لەميوانەكەى بگرێت.

[750]الكسوف ظاهرة مخيفة.

خۆرگيران دياردەيەكى ترسناكە.

[751] هل تخاف من الخسوف ؟

ئايا لەمانگگيران دەترسيت؟

286. (فَلَك) خولگەیە[752]، (فَلَكيّ) گەردونناس[753]

(حاسَّة) واتە هەست، جەمعەکەی (حَواسّ)[754]

287. (صاعِقة) چیە؟ هەورەبروسکە[755]

(سَحاب)، (غَيْم) هەور[756]، (مِمْخَضة) مەشکە[757]

288. (طرَفَ) چیە؟ چاوی تروکاند[758]

---

سەبارەت بە (کسوف)و (خسوف) لەزمانی عەرەبیدا، دەتوانرێت هەردوو وشەی (شمس)و (قمر) لەبەردەمیاندا بەکاربهێنرێت بۆ نمونە بوترێت (کسوف الشمس) و(خسوف القمر) و بەبێ بەکارهێنانی ئەو دوو وشەیەش هەر راستن و هەمان مانا دەدەن.

752 جمع أفلاك وفُلْك وفُلُك

كل كوكب يدور في فَلَكه.

هەموو هەسارەیەك لەناو خولگەی خۆیدا دەسورێتەوە.

753 تمنَّى أن يكون فَلَكيًّا مُنْذ طفولته.

هەر لەکاتی منداڵییەوە، ئاواتی ئەوە بووە کە ببێتە گەردونناس.

754 أن حاسة الذوق لدى الفراش توجد في أرجلها الخلفية.

هەستی چەشتن لەپەپولە، دەکەوێتە قاچەکانی دوایەوەی.

755 جمع صاعقات وصَواعِق.

أن في اللحظة هنالك حوالي 2000 صاعقة تضرب سطح الأرض في أماكن مختلفة.

لەم ساتەی ئێستادا نزیکەی دوو هەزار هەورەبروسکە دەدات لەسەر رووی زەوی لەشوێنگەلی جیاوازدا.

756 سحاب: جمع الجمع سُحُب، مفرد سَحابة.

ئەم وشەیە دەتوانرێت وەك مێ و نێرو تاك و کۆش بەکاربهێنرێت.

انقشع السّحابُ.

هەورەکە رەوییەوە.

غَيْم: جمع الجمع غُيوم وغِيام،مفرد غَيْمة.

غطّى الغَيْم السماء.

هەور ئاسمانی داپۆشی.

757 جمع مَماخِض

اشتريت ممخضة جيدة لأمي.

مەشکەیەکی تازەم بۆ دایکم کڕی.

758 طرَفَ يَطرِف، طَرْفًا، فهو طارِف.

طرَف محمد كثيراً أثناء حديثه مع خطيبته.

محمد لەکاتی قسەکردنیدا لەگەڵ دەزگیرانەکەی چاوی زۆر تروکاند.

(مرَّرَ) تاڵكرد، لەگەڵ تێپەڕاند[759]

**289.** (طَرَفْ) لایەن و دەستەو بەش و سەر[760]

(دابَّة) وڵاخە، لەگەڵ زیندەوەر[761]

**290.** (لَبُؤَة)، (هُمام) شێر، كۆی دووەم (هِمام)[762]

---

[759] مرَّرَ يمرِّر ، تمريرًا ، فهو مُمرِّر ، والمفعول مُمرَّر.

مرّر اللاعبُ الكرةَ إلى زميله.

یاریزانەكە تۆپەكەی بۆ لای هاوكارەكەی تێپەڕاند.

مرَّر الدواءُ الشَّرابَ.

دەرمانەكە خواردنەوەكەی تاڵكرد.

[760] جمع أطراف

وصلت رسالة من طرَف الأسير.

نامەیەك لەلایەن دیلەكەوە گەیشت.

استقبل طرَفًا من السائحين.

پێشوازیكرد لەدەستەیەك لەگەشتیارەكان (نەك هەمویان).

قصّ عليه طرفًا من حياته.

بەشێك لەژیانی بۆ گێڕایەوە.

أمسَك بطرف الحبْل.

سەری گوریسەكەی گرت.

[761] جمع دوابّ

بەمانای وڵاخ و زیندەوەریش بەگشتی ( واتە بە مرۆڤیشەوە) دێت.

دابَّتي حمار هزيل.

وڵاخەكەم كەرێكی لاوازە.

(إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللهِ الَّذِينَ كَفَرُوا)

خراپترین زیندەوەر لەلای خودا ئەو كەسانەن كە بڕوایان نەهێنا (بە خوداو پێغەمبەرەكەی) .

[762] واتە ئەم دوو وشەیە بەمانای شێر دێن، كۆی وشەی دووەمیان (هِمام)ە. (هُمام) بەمانای شێر دێت بەگشتی، بەڵام (لَبُؤَة) بەدیاریكراوی بەمانای شێری مێ واتە دەڵەشێر دێت و كۆیەكەی (لَبُؤ) و(لَبُؤات)ە.

اللَبُؤَة تصطاد أكثر من زوجها.

دەڵەشێر زیاتر لەمێردەكەی ڕاودەكات.

ألا تخاف من الهمام؟

ئەرێ لەشێر ناترسیت؟

(دَؤوب)، (مُستَمِرّ)، (دائِم) بەردەوام[763]

**[291.](#)** (نَواة) واتە نێت، هەروەها ناوك[764]

(خفيف الظِّلّ)ە بەمانای رۆحسوك[765]

**[292.](#)** (كَسِل) تەممەڵە[766]، (ذَكِيّ)یە زیرەك[767]

(خِرْوَع) گەرچەكە[768]، (نَبات)ە رووەك[769]

---

[763] هو دَؤوبٌ عَلَى عَمَلِهِ.

ئەو بەردەوامە لەسەر كارەكەی.

العمليات العسكرية مُستَمِرّة.

پرۆسە سەربازییەكان بەردەوامن .

طوال فترة سجن زوجها، كَانَت عَلَى اِتِّصَالٍ دَائِمٍ بِهِ.

بەدرێژایی ماوەی زیندانیكردنی مێردەكەی، ژنەكە پەیوەندیی بەردەوامی لەگەڵدا هەبوو.

[764] جمع نَوَيات ونوًى

نێت= (ع: نِيَّة)= نیاز.

لم يكن في نواة المجرم أن يصل لدرجة القتل.

نێتی تاوانبارەكە ئەوەی تێدا نەبوو كە بگاتە ئاستی كوشتن.

نواة البلح غير صالحة للأكل.

ناوكی خورما بۆ خواردن ناشێت.

[765] رۆحسوك= خوێنشیرین.

زوجها غير وسيم ولكنه خفيف الظِّلّ.

مێردەكەی قۆز نیە بەڵام بەڕاستی رۆحسوكە.

[766] جمع كَسالَى وكُسالَى وكَسْلَى.

أنت تلميذ كسل.

تۆ قوتابییەكی تەممەڵیت.

[767] جمع أذكياء

الطالب الذكيّ له مستقبل مشرق.

خوێندكاری زیرەك داهاتویەكی پرشنگداری هەیە.

[768] مفرد خِرْوَعَة

يُستعمل زيت الخروع كعلاج.

رۆنی گەرچەك وەك چارەسەر بەكاردەهێنرێت.

[769] جمع الجمع نباتات،مفرد نبتة.

293. (سادِس) شەشەمە[770]، (سُدْس)یش شەشیەك[771]

(خَمْسَة) واتە پێنج[772]، (خُمْس) مانای پێنجیەك[773]

294. (دُلْفین) دۆلفینە، كۆی (دَلاَفِین)ە[774]

(جُرْثوم) میكرۆبە، لەگەڵ بنچینە[775]

295. (مُنطاد) باڵۆنە، وەك (عالي)ش بەرزە[776]

---

النبات المائي مفيد للصحّة.

رووەكی ئاوی بەسودە بۆ تەندروستی.

[770] (وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ)

و دەڵێن پێنج بون و شەشەمیان سەگەكەیانە.

ما هو إسم الرئيس السادس للولايات المتحدة الأمريكية؟

شەشەم سەرۆكی ئەمەریكا ناوی چیە؟ جۆن كوینسی ئادەمز

[771] هەروەها بە سپێڵی (سُدُس)یش دەنوسرێت. شەشیەك: یەك لەسەر شەش، یەك لە شەش.

أن سدس مساحة اليابسة على سطح الأرض تقع في الاتحاد السوفييتي.

شەشیەكی روبەری وشكانیی سەرزەوی دەكەوێتە یەكێتیی سۆڤیەتەوە.

[772] يتكوَّن هذا المبنى من خمسة طوابق.

ئەم باڵەخانەیە لەپێنج نهۆم پێكدێت.

[773] جمع أخماس

تذهب خُمْس ميزانيّة الدولة الى المسؤولين الكبار.

پێنجیەكی بودجەی وڵات دەڕوات بۆ گیرفانی بەرپرسە باڵاكان.

[774] لەزمانی عەرەبیدا (دُولْفين)و (درفيل)و (دارفيل)یشی پێدەووترێت.

هل تعلم أن الدلفين ينام بعين واحدة مغلقة والثانية مفتوحة؟!

ئایا دەزانیت كە دۆلفین كاتێك دەخەوێت چاوێكی داخراوەو چاوەكەی تری كراوەیە؟!

[775] جمع جراثيم.

لەمانای دووەمیاندا مورادیفی (أصل)ە.

جرثوم مضر قد يسبب موت إنسان.

دەكرێ میكرۆبێكی زیانبەخش ببێتەهۆی مردنی مرۆڤێك.

ما هو جرثوم هذه الكلمة؟

بنچینەی ئەم وشەیە چیە؟

[776] واتە وشەی (مُنطاد) بەمانای باڵۆن دێت. سەرباری ئەوەش بەمانای (بەرز)یش دێت و لەم مانایەدا مورادیفی وشەی (عالي)یە.

إرتفع المنطاد كثيراً.

(بَرْد) زوكام و خەو[777]، (بَرَدْ)یش تەرزە[778]

**296.** (فَصْل) وەرزو بەش، هەروەها پۆله[779]

(مَعِدَة) گەده[780]، (عِفْج) ریخۆڵە[781]

---

باڵۆنەكە زۆر بەرزبووەوە.

يعيش ولدي الكبير في مكان منطاد.

كوڕە گەورەكەم لەشوێنێكی بەرزدا دەژی.

لا أستطيع الركض على الجبل العالي.

ناتوانم لەسەر شاخی بەرز رابكەم.

[777] دوان لەماناكانی، زوكام و خەون. زوكام= (ع: زكام)= هەڵامەت. مەخسەوی شەریفم لەوشەی خەو لێرەدا خەوتن (نوم)ە.

البرد مزعج جدّاً.

هەڵامەت زۆر بێزاركەرە.

{لاَ يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلاَ شَرَابًا}

نە خەوی تێدا دەچێژن، نە خواردنەوە.

[778] مفرد بَرَدَة

تساقط البَرَد قد يؤذي الزراعة.

بارینی تەرزە رەنگە زیان بە كشتوكاڵ بگەیەنێت.

[779] جمع فُصول

هل تعلم أن وزن ليتر من الخل في الشتاء هو أكثر من وزنه في فصل الصيف؟!

ئایا دەزانیت كێشی لیترێك سركە لەزستاندا زیاترە لە كێشی هەمان قەبارە لەوەرزی هاویندا؟! (زۆر عەیبە لەدڵی خۆتا ئەڵێی عەگ لەو فشەیە!)

أهمّ ما في الكتاب فَصْلُه الأوّل.

گرنگترین شتی ناو كتێبەكە بەشی یەكەمیەتی.

كنتُ معه في فَصل واحد.

لەیەك پۆلدا بووم لەگەڵیدا.

[780] هەروەها بە (مِعْدَة)ش دەنوسرێت.

جمع مَعِد ومِعَد

التهاب المَعِدَة مرض غير خطير.

هەوكردنی گەده نەخۆشییەكی ترسناك نیە.

[781] ج: أَعْفَاج، عِفَجَة

العفج عضو مهم في الجهاز الهضمي.

**.297** (صُرْصُور) سيسركە، كۆكەی (صَراصِير)[782]

(مُتَغَيِّر) گۆڕاو[783]، (ثابِت)ە جێگیر[784]

**.298** (سِرْدَاب) و (قَبْو)، (بَدْروم) ژێرزەمین[785]

(وَلِيُّ عَهْد)ە مانای جێنشین[786]

**.299** (غُراب) قەلەڕەش، كۆكەی (غِرْبان)ە[787]

(سَماد) پەیینە[788]، (عُثَّة) مۆرانە[789]

---

ریخۆڵە ئەندامێکی گرنگە لەکۆئەندامی هەرسدا.

[782]الصراصير قادرة على العيش لأسابيع بعد قطع رأسها.

سيسرك دەتوانێت چەند هەفتەیەك پاش لێكردنەوەی سەری لەجەستەی، بژی.

[783]ج: متغيّرات

القناعة هي أحدى متغيّرات الحياة، تتغير حسب المجتمع والعصر.

قەناعەت یەکێکە لەگۆڕاوەکانی ژیان، بەگوێرەی کۆمەڵگاو سەردەم دەگۆڕێت.

[784]جمع ثوابت

جێگیر= نەگۆڕ

يجب احترام ثوابت المجتمع كالصدق والعفة.

پێویستە رێز لەجێگیرەکانی کۆمەڵگە بگیرێت، لەوانە راستگۆیی و داوێنپاکی.

[785]سرداب بيتكم خطير.

ژێرزەمینی ماڵەکەتان مەترسیدارە.

إنتحر هتلر داخل قبوه في مدينة برلين.

هیتلەر لەناو ژێرزەمینەکەی خۆی لەشاری بەرلین، خۆی کوشت.

يعيش الفقير فى بدروم قذر.

هەژارەکە لەژێرزەمینێکی پیس و چەپەڵدا دەژی.

[786]قُتل الملك و وَلِيُّ عَهْده في حادثة سيّارة.

پادشاو جێنشینەکەی لەڕوداوێکی ئۆتۆمبێلدا گیانیان لەدەستدا.

[787]هەروەها بە (أغرُب) و(أغرِبة)ش کۆدەکرێتەوە. جەمعی جەمعەکەشی (غرابين)ە.

الغراب المريض يُعزل ويُقتل من قبل أقرانه.

قەلەڕەشی نەخۆش لەلایەن هاوڕێکانییەوە وەلادەنرێت و دەکوژرێت. کافرصانیە!

[788] جمع أسمِدَة

السماد مفيد للزراعة.

**300.** (كَتْكوت) جوجكە، كۆكەی (كتاكيت)[790]

(حِرْفَة) پيشەيە[791]، (حَرْف) ئاڕاستە، پيت[792]

**301.** (هَدَّاف) گۆڵكەرە[793]، (هَدَف) ئامانج، گۆڵ[794]

(غَرَضْ)يش ئامانج[795]، (عُنقود) ماناى بۆڵ[796]

---

پەيين بەسودە بۆ كشتوكاڵ.

[789] جمع عُثّ وعُثَث، جمع الجمع عِثاث.

ليست العُثَّة فراشة.

مۆرانە پەپولە نيە.

[790] بەتايبەت بەماناى جوجكى مريش دێت.

يحبّ كثير من السيّدات تربية الكتاكيت.

زۆرێك لەخانمان حەز بە بەخێوكردنى جوجك دەكەن.

[791] جمع حِرْفات وحِرَف

حِرْفَة النَّجَّار خطيرة.

پيشەى دارتاش مەترسيدارە.

[792] جمع أحرف وحروف.

هذا مخالف للحرف الذي سرنا عليه.

ئەمە پێچەوانەى ئەو ئاڕاستەيە كە لەسەرى ڕۆشتين.

تتكوّن بعض الكلمات من خمسة أحرف.

هەندێك وشە لە پێنج پيت پێكدێن.

[793] من هو هَدَّاف الدورة؟

گۆڵكەرى خولەكە كێيە؟

[794] جمع أهداف

هَدَفُه مساعدة المحتاجين.

ئامانجى، يارمەتيدانى هەژارانە.

سجّل ميسي الهدف الأوّل في المباراة.

ميسى يەكەم گۆڵى يارييەكەى تۆماركرد.

كم العدد الكلي للأهداف التي سجلت طوال بطولات كأس العالم لكرة القدم لحد الآن؟

كۆژمارەى ئەو گۆڵانە چەندە كە لەسەرجەم مۆنديالەكاندا تۆماركراون؟ 2786

[795] جمع أغراض

أصاب غرضَه الخفي.

**.302** (لَقْمَة) وەك (لُقْمَة) بەمانای پاروو[797]

(فَقيد) و (مَفْقُود)، (راحِل) كۆچكردوو[798]

**.303** (تِلفاز) چيە؟ تەلەفزيۆن[799]

(عَتيق) رزگاربوو، وەك (قَديم)یش كۆن[800]

---

ئامانجە شاراوەكەی پێكا.

[796] جمع عناقيدُ.

هێشوو= بۆڵ.

أكلت عُنْقود عِنَب خلال أقلّ من دقيقة.

لەماوەی كەمتر لەخولەكێكدا هێشويەك ترێم خوارد.

[797] هەردوكيان بەمانای پاروو دێن، واتە دەتوانرێت لامەكە زەممە يان فەتحەی لەسەربێت. پاروو= تيكە.

لقمة واحدة من الطعام الحلال خير من كيلوغرام من الذهب الحرام.

يەك پاروو خواردنی حەڵاڵ لەكيلۆگرامێك ئاڵتونی حەرام باشترە.

لقمة زائدة قد تضر بصحتك.

پاروويەكی زيادە رەنگە زيان بە تەندروستيت بگەيەنێت.

[798] هەرسێكيان بەمانای كۆچكردوو دێن. كۆچكردوو بەمانای مردوو.

للفقيد سبعة أولاد.

كۆچكردوو حەوت كوڕی هەيە.

والدي عزيز مفقود.

باوكم ئازيزێكی كۆچكردووە.

كان الرئيس الراحل رجل المهمات الصعبة.

سەرۆكی كۆچكردوو پياوی ئەركە قورسەكان بوو.

[799] جمع تلفازات

أُلقي القبض على شاب بتهمة سرقة 12 شاشة تلفاز في السوق.

گەنجێك بەتۆمەتی دزينی 12 شاشەی تەلەفزيۆن لەبازاڕ، دەستگيركرا.

[800] واتە (عتيق) بەمانای رزگاربوو دێت، سەرباری ئەوەش موراديفی (قديم)یش كە بەمانای كۆن دێت.

العتيق من نار جهنم، سعيد.

رزگاربوو لەئاگری دۆزەخ، بەختەوەرە.

بعنا بيتنا العتيق.

خانووە كۆنەكەمان فرۆشت.

جوالك قديم، لماذا لا تبدلّه.

**.304** (نَحيف) و (نَحِيل)، (هَزيل) لاوازە[801]

(حَديث) فەرمودە، وەك (جَديد) تازە[802]

**.305** (أَصَمّ)، (أَطْرَش) كەڕ[803]، (أعمَى)، (كَفيف) كوێر[804]

---

مۆبایلەکەت کۆنە، بۆچی نایگۆڕیت؟

[801] هەرسێكیان بەمانای لاواز دێن. یەكەم و سێیەمیان بەمانای لاواز دێن بەگشتی، بەڵام دووەمیان واتە (نحیل) بەمانای لاوازێك دێت كە هۆكارەكەی نەخۆشی بێت.

زوجها نحيف الجسم.

مێردەكەی جەستەی لاوازە.

المرض جعله شخصاً نحيفاً.

نەخۆشییەكە كردی بە كەسێكی لاواز.

ذلك الولد الهزيل قريبي.

ئەو كوڕە لاوازە خزممە.

[802] واتە وشەی (حديث) بەمانای فەرمودە دێت، سەرباری ئەوەش موورادیفی وشەی (جدید)ە كە بەمانای تازە دێت.

هل هذا الحديث صحيح؟

ئایا ئەم فەرمودەیە سەحیحە؟ واتە راستەو بێگومان پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی؟

الجهاز حديث، لا أعلم كيفية إستخدامه.

ئامێرەكە تازەیە، چۆنیەتی بەكارهێنانی نازانم.

المستشفى جديد ولكنه غير متقدم.

نەخۆشخانەكە تازەیە بەڵام پێشكەوتوو نیە.

[803] كەڕ= نابیست.

جمع أَطْرَش: طُرْش وطُرْشان. مؤ: طَرْشاء. جمع مؤ: طرشاوات وطُرْش.

جمع أَصَمّ: صُمّ وصُمَّان. مؤ: صَمَّاءُ. جمع مؤ: صمّاوات وصُمّ وصُمَّان.

رجل أَصَمُّ جلب الخبر.

پیاوێكی نابیست هەواڵەكەی هێنا.

هو أطرش ولكنّ عينيه قويّتان للغاية.

ئەو نابیستە، بەڵام چاوەكانی زۆر بەهێزن.

[804] هەردوكیان بەمانای كوێر دێن. كوێر= كوێر= نابینا.

صحيح هو أعمَى ولكنّه ذكي جدّاَ.

راستە نابینایە، بەڵام زۆر زیرەكە.

المؤمن الكفيف يرى الأشياء بعقله.

(ضَرير) نابينا[805]، (نَوع)و (صِنف) جۆر[806]

**306.** (تَقدُّم) چيه؟ واته پێشكەوتن[807]

(بَذيء) زمانپيس[808]، (شَنيع) قێزەون[809]

**307.** (دَجاج) مريشكە[810]، (دِيك)يش كەڵەشێر[811]

---

بڕوادارى نابينا شتەكان بە عەقڵى دەبينێت.

[805]ج: ضريرون وأضِرّاء. مؤ: ضريرة. جمع مؤ: ضريرات وضَرَائِرُ.

كان طه حسين ضريرًا.

تەها حوسێن نابينا بوو.

[806] ما هو نوع التلفاز الذي إشتريته؟

ئەو تەلەفزيۆنەى كڕيوتە چ جۆرێكە.

من أفضل أنواع المَعرفة، معرفة حدودك" ـ مارك توين"

يەكێك لەباشترين زانيارييەكان، زانينى سنورى خۆتە.

ئەم فەرمايشتە جوانە هى مارك توينە كە يەكێكە لەكەڵەگانى ئەدەب لەسەر ئاستى جيهان و خەڵكى ئەو ئەمەريكايەى لاى خۆمانە.

من أرقي أنواع عزة النفس هو الصمت في الوقت الذي ينتظر فيه الناس ردة فعلك.

يەكێك لەڕاقيترين جۆرەكانى نەفسبەرزى بريتييە لەبێدەنگبون لەوكاتەى خەڵك چاوەڕێى كاردانەوەت لێدەكەن.

صِنف جهازك غير جيّد.

جۆرى ئامێرەكەت باش نيە.

[807]حدوث التقدّم ليس مرتبطاً بالثورة حتى ولو حدث بعدها.

روودانى پێشكەوتن پەيوەندى بە شۆڕشەوە نيە، تەنانەت ئەگەر پاش شۆڕشەكەش روبدات.

[808]جمع بَذيئون وأَبْذِيَاء، مؤ بذيئة، جمع مؤ بذيئات.

لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِبَذِيءٍ.

بڕوادار زمانپيس نيە.

[809]جمع شنائِعُ وشُنُع

سلكوك شنيع، حاول أن تغيّره.

رەفتارت قێزەونە، هەوڵبدە بيگۆڕيت.

[810] ج: دُجُج

أنا لا أرغب لحم الدجاج.

من حەزم لەگۆشتى مريشك نيە.

[811]جمع أدياك ودِيَكَة ودُيُوك.

صياح الديك أفزع الطفل.

(جائِع)و (جَوْعان) برسی[812]، (شَبعان) تێر[813]

**308.** (أُمّيّ) دایکانەو نەخوێندەوارە[814]

(نَصِیر) پشتیوان، کۆکەی (أنصار)ە[815]

**309.** (عصَرَ) گوشی[816]، (حُضْن) ئامێزە[817]

(قُوّة) هێز[818]، (عَزّ)و (قَوِيّ) بەهێزە[819]

---

قوقەی کەڵەشێرەکە مناڵەکەی تۆقاند.

[812]أنا جائع جداً.

زۆر برسیمە.

لا تأكل اللحم أمام الطفل الجوعان.

گۆشت لەبەردەم منداڵی برسیدا مەخۆ.

[813]جمع شِبَاع/ شَبْعانون وشَباعَى/ شَبْعانون، مؤ شبعَى/ شبْعانة، جمع مؤ شِبَاع/ شبعانات.

الرجل الشبعان لا يهمّه الاخرين.

پیاوی تێر گوێ بە کەسانی تر نادات.

[814]لم أشعر بالحنانٌ الأُمّيّ طوال حياتي لأنّ والدتي توفيت وأنا صغير جداً.

بەدرێژایی ژیانم هەستم بە سۆزی دایکانە نەکردووە، لەبەرئەوەی کاتێك زۆر بچوك بوم، دایکم کۆچی دوایی کرد.

والدي رجلٌ أمّيّ ولكنه ذكي للغاية.

باوکم نەخوێندەوارە، بەڵام ئەوپەڕی زیرەکە.

[815]هەروەها بە (نُصراء)یش کۆدەکرێتەوە.

أنصار الحكومة أكثر عدداً من أنصار الحق.

ژمارەی پشتیوانانی میری لە هی پشتیوانانی راستی، زیاترە.

[816]عصَرَ يعصُر ويَعصِر ، عَصْرًا ، فهو عاصِر ، والمفعول مَعْصور

لا تكن رطبًا فتُعْصَر ولا يابسًا فتكسر.

نەرم مەبە، دەگوشرێیت، وشکیش مەبە دەشکێنرێیت.

[817]هەروەها بە سپێڵی (حِضْن)یش دەنوسرێت. کۆکەی (أحضان)ە. ئامێز= باوەش.

ليس في العالم وسادة أنعم من حضن الأمّ.

هیچ سەرینێك نیە لەجیهاندا لەئامێزی دایك نەرمتر بێت.

[818] جمع قُوًى

هل تمتلك القوة الكافية لرفع الجهاز؟

ئەوەندە هێزت هەیە کە بتوانیت ئامێرەکە بەرزبکەیتەوە؟

310. (سَلِيم) راست و ساغ، هەم پاك و جوانە[820]

(قَطيع) مێگەلە، كۆكەی (قُطْعان)ە[821]

311. (دَعْوَى) سكاڵا، كۆی (دعاوي)یە[822]

(مُبادَرَة)یە دەسپێشخەرییە[823]

312. (فَريسة) نێچیر، كۆكەی (فَرَائس)[824]

(أخافَ) ترساند[825]، (خَوْف) ترسان و ترس[826]

---

[819]كان أبي رجلاً عزّاً.

باوكم پیاوێكی بەهێز بوو.

إنه عامل قَوِيّ.

بەڕاستی ئەو كرێكارێكی بەهێزە.

[820]جمع سُلَماءُ وسَلْمى

الطريق السليم يدخلك الجنة.

ڕێگای راست دەتخاتە بەهەشتەوە.

العقل السليم في الجسم السليم.

عەقڵی ساغ لەلەشی ساغدایە.

قلب سليم خير من وجه جميل للزواج.

دڵێكی پاك لەدەموچاوێكی جوان باشترە بۆ هاوسەرگیری.

أراك تستمع الى أغاني عدنان كريم، إذن ذوقك سليم.

دەبینم گوێ لەگۆرانییەكانی عەدنان كەریم دەگریت، كەواتە زەوقت جوانە.

[821]هەروەها بە (أقاطيع)یش كۆدەكرێتەوە.

يرعى قَطيعًا من الأغنام.

مێگەلێك مەڕو بزن دەلەوەڕێنێت.

[822]هەروەها بە (دعَاوَى)ش كۆدەكرێتەوە.

أقام دَعْوَى على زوجته بتهمة الخيانة.

سكاڵایەكی لەسەر ژنەكەی تۆماركرد بەتۆمەتی ناپاكی.

[823]تقدّم بمبادرة سلام.

دەسپێشخەرییەكی ئاشتی پێشكەشكرد.

[824]أكل الأسد فريسته بسرعة.

شێرەكە نێچیرەكەی بە خێرایی خوارد.

**.313** (دامِس) تاریکە، بەس ئەنگوستەچاو[827]

(حَریق) سوتێنەر[828]، (محروق) سوتێنراو[829]

**.314** (ربّ) پەروەردگار، وەك (مالِك) خاوەن[830]

(حفَرَ) هەڵکەند[831]، (حافِر) سم، هەڵکەن[832]

---

[825]أخافَ يُخيف ، أخِفْ ، إخافةً ، فهو مُخيف ، والمفعول مُخاف.

أخافه الثعبان.

مارەکە ترساندی.

[826]لەمانای یەکەمیاندا چاوگی (خاف)یە.

الخَوْف من الله مصدر أساسي لكل عمل حسن.

ترسان لەخوا سەرچاوەیەکی بنچینەییە بۆ هەموو کارێکی جوان.

خوفك كثير، عليك بزيارة طبيب نفسي.

ترسەکەت زۆرە، پێویستە سەردانی پزیشکێکی دەرونی بکەیت.

[827]جمع دوامِس.

بەمانای تاریك دێت بەڵام تاریکی ئەنگوستەچاو واتە تاریکیی زۆر نەك ناسکەتاریك!

قُتل الشاب في ليل دامِس.

گەنجەکە لەشەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاودا کوژرا.

[828]قُتل الشاب بسمّ حريق.

گەنجەکە بە ژەهرێکی سوتێنەر کوژرا.

[829]الرجل الحريق لم يبق كثيراً بعد الحادثة.

پاش روداوەکە، پیاوە سوتێنراوەکە زۆر لەژیاندا نەمایەوە.

لم ينجو أحد في البيت المحروق.

هیچ کەسێك لەماڵە سوتاوەکە رزگاری نەبوو.

[830]واتە وشەی (ربّ) بەمانای پەروەردگار دێت، سەرباری ئەوەش، هەروەك (مالِك)، بەمانای خاوەنیش دێت.

{ربّي أرني كيف تحي الموتى}

پەروەردگارم پیشانمبدە چۆن مردوو زیندوودەکەیتەوە.

إذا كان ربُّ البيت بالدُّفِّ ضاربًا ... فشيمة أهل البيت كُلِّهم الرَّقصُ.

ئەگەر خاوەنی ماڵ دەفلێدەر بێت، ئەوا تایبەتمەندیی سەرجەم ئەندامانی ماڵەکە سەماکردن دەبێت.

كان مالِكُ الدّار رجلاً غضباناً.

خاوەنی ماڵەکە پیاوێکی تورە بوو.

[831]حفَرَ يَحفِر، حَفْرًا، فهو حافر، والمفعول مَحْفور.

.315 (جَفْن) پێڵوی چاو، کۆی (جُفون)، (أجفان)[833]

(سِمْسار) دەڵاڵە[834]، (حَكَمْ) ناوبژیوان[835]

.316 (رائي) وەك (حالِم) بەواتای خەوبین[836]

(خفيف الدَّم)ە مانای خوێنشیرین[837]

.317 (حاضَ) چیە؟ کەوتە عادە[838]

---

من حفر بئراً بئراً لأخيه، وقع فيه.

ئەوەی چاڵ بۆ براکەی هەڵبکەنێت، خۆی تێدەکەوێت.

[832]بەمانای سم (ی وڵاخ)و هەڵکەنیش دێت. لەمانای دووەمیاندا بکەری (حفَرَ)یە.

آثار حافر الفرس على الطَّريق.

شوێنەواری سمی ماینەکە لەسەر ڕێگاکەدا هەیە.

حافر البئرشخص مغامر.

هەڵکەني بیر (بیر هەڵکەن) کەسێکی سەرکەشە.

[833]هەروەها بە (أجْفُن)یش کۆدەکرێتەوە.

فتَّح أجفانه على صوت أبيه.

بەهۆی دەنگی باوکییەوە، پێڵوی چاوەکانی کردەوە.

[834]جمع سَماسِرة

المكّار لا يحتاج إلى سمسار.

فێڵباز پێویستی بە دەڵاڵ نیە.

[835]جمع حُكَّام

لم يستطع الحكم حسم المشكلة.

ناوبژیوانەکە نەیتوانی کێشەکە یەکلایی بکاتەوە.

[836]خەوبین: ئەو کەسەی خەوی بینیوە.

خاف الرائي من رؤياه كثيراً.

خەوبینەکە زۆر لەخەوەکەی ترسا.

طلب الحالم من أن يفسر له حلمه.

خەوبینەکە داوای لەزانایەکە کرد کە خەوەکەی بۆ ڕاڤەبکات.

[837]ولده خفيف الدَّم جداً.

خوێنشیرین= ڕۆحسوك.

کوڕەکەی زۆر خوێنشیرینە.

(جَسَد) جەستەیە، کۆکەی (أجساد)ە[839]

**318.** (وَعْل) چیە؟ بزنەکێوی[840]

(بَدین) قەڵەوە[841]، (سِمْنة) قەڵەوی[842]

**319.** (ضعَّفَ) لاوازکرد[843]، (قوَّى) بەهێزکرد[844]

(هرَبَ)، (رکَضَ) هەردوکیان رایکرد[845]

---

838حاضَ تحِيض، حِيضيًا وحَيْضًا ، فهي حائِض.

کەوتە عادە= کەوتە سوڕی مانگانە: عادە بوو.

حاضتِ المَرْأةُ في رمضان.

ژنەکە لەڕەمەزاندا کەوتە سوڕی مانگانە.

839يستخدم دماغ الإنسان 20% من طاقة الجسد بينما يبلغ وزنه 2% فقط من وزنه.

دەماخی مرۆڤ لەسەدا 20ی وزەی جەستە بەکاردەهێنێت، لەکاتێکدا کێشەکەی تەنها لەسەدا دووی کێشی جەستە پێکدەهێنێت.

840هەروەها بە (وَعِل)یش دەنوسرێت.

جمع أوْعال ووُعُل ووُعول، مؤ وَعْلَة، جمع مؤ وَعْلات ووَعَلاَت ووعال.

يستهلك الوعل حوالي 18 إلى 35 رطلاً من الطعام بشكل يومي.

بزنەکێوی رۆژانە نزیکەی 18 تا 35 پاوەند (نزیکەی 16 کیلۆگرام) خۆراك دەخوات.

841جمع بُدُن، مؤ بدين، جمع مؤ بُدُن

أنت بدين جداً، حاول أن تقلل من أكل الدهنيات.

تۆ زۆر قەڵەویت، هەوڵبدە، خواردنی چەورەمەنی کەمبکەیتەوە.

842السمنة مرض شائع.

قەڵەوی نەخۆشییەکی باوە.

843ضعَّفَ يضعِّف ، تضعيفًا ، فهو مُضعِّف ، والمفعول مُضعَّف.

ضعَّفَه المرضُ.

نەخۆشییەکە لاوازیکرد.

844قوَّى يقوِّي ، قَوِّ ، تقويةً ، فهو مُقَوٍّ ، والمفعول مُقوًّى.

الجيش قوَّى قدراته العسكرية.

سوپا توانا سەربازییەکانی بەهێزکرد.

845هرَب السّارقُ بعد السرقة.

دزەکە پاش دزییەکە رایکرد.

ركَضت البقرة عند رؤيتها للذئب.

کاتێك گورگەکەی بینی، مانگاکە رایکرد.

320. (مُفترِس) چیه؟ واتە دڕندە[846]

(رَماد) خۆڵەمێش، کۆکەی (أَرْمِدة)[847]

321. (صَوْت) واتە دەنگ، جەمعەکەی (أصْوات)[848]

(مُکَسَّرات)ە مانای چەرەزات[849]

322. (شادِن) وەك (خُشف) بێچوی غەزالە[850]

(بَطَل) پاڵەوان، کۆکەی (أبْطال)ە[851]

323. (قُرادَة) گەنە، کۆکەی (قُراد)ە[852]

(حاضِر)، (مُستَعدّ)، (عَتید) ئامادە[853]

---

[846] الأسد حيوان مفترس.

شێر گیانداریکی دڕندەیە.

[847] خفظ رَماد جثةِ زوجته لمدة سنتين.

خۆڵەمێشی تەرمی ژنەکەی بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵگرت.

[848] {إِنَّ أَنْكَرَ الأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ}

بەڕاستی ناخۆشترین دەنگ، دەنگی کەرە.

حتى في الموسيقى صوت الطبل أعلى من صوت القانون.

تەنانەت لەمۆسیقاشدا دەنگی تەپڵ لەدەنگی قانون بەرزترە.

[849] المُکَسَّرات مفيدة للصحة.

چەرەزات بەسودە بۆ تەندروستی.

[850] هەردوکیان بەمانای بێچوی غەزال دێن، بەڵام دووەمیان بەمانای بێچویەك دێت کە تازە لەدایکبوبێت و یەکەمیان بەمانای بێچووەیەك دێت کە هێندەی لێهاتبێت پێویستی بە دایکی نەبێت. بێچوی غەزال= بێچوی ئاسك.

واجه الشادنُ الذئبَ بنفسه.

بێچووە ئاسکەکە، خودی خۆی ڕووبەڕوی گورکەکە بویەوە.

إستطاع الغزالُ الدفاعَ عن خشفه.

ئاسکەکە توانی بەرگری لەبێچووەکەی بکات.

[851] إستطاع شابٌّ بطلٌ أن يُنقذ الغريقَ.

گەنجێکی پاڵەوان توانی نقومبووەکە رزگاربکات.

[852] هەروەها بە (قرادات)یش کۆدەکرێتەوە.

رأيت قُرادة كبيرة على ظهر البقرة.

گەنەیەکی گەورەم لەسەر پشتی مانگاکە بینی.

324. (جيَّفَ) چيه؟ واته بۆنيكرد[854]

(صادَ) و (اِصطادَ)و (قنَصَ) راوكرد[855]

325. (بَحَّار) دەرياوان، كۆكەی (بَحَّارة)[856]

(مَسْعور) واته شێت، هەروەها هاره[857]

326. (لِنَذهَب) چيه؟ واته بابڕۆين[858]

---

[853]هل كنت حاضراً في الإجتماع؟

ئامادەبويت لەكۆبونەوەكەدا؟

أنا مستعدّ لكلّ الإحتمالات.

ئامادەم بۆ هەموو ئەگەرەكان.

الضمير رَقِيبٌ عَتِيدٌ.

ويژدان چاودێرێكی ئامادەيه.

[854] بۆنيكرد بەمانای بۆگەنيكرد.

جيَّفَتِ الجُثَّةُ.

تەرمەكە بۆنيكرد.

[855] صاد الطَّائرَ.

باڵندەكەی راوكرد.

اصطاد الولد سمكةً كبيرة.

منداڵەكە ماسييەكی گەورەی راوكرد.

استطاع الصياد أن يقنص الظَّبيَ بالبندقية.

راوچييەكە توانی ئاسكەكە بە تفەنگ راوبكات.

[856] هەروەها بە (بَحَّارون)يش كۆدەكرێتەوە.

البَحَّار الماهر لا يخاف من البحر.

دەرياوانی كارامە لەدەريا ناترسێت.

[857] جمع مسعورون ومساعِير.

زوجها رجل مسعور.

مێردەكەی پياوێكی شێتە.

لا تقترب من الكلب المسعور.

لەسەگی هار نزيك مەبەرەوە.

[858]لنذهب الى المدرسة سويّاً.

(تَعليق) راگرتن، لێدوان، هەڵواسین[859]

**.327** (لَقْلَق) چیە؟ حاجی لەقلەق[860]

(مَتن) ناوەرۆك[861]، (نَصّ) بەمانای دەق[862]

**.328** (مُفكِّر) بیریار، (فِكْرة) بیرۆكە[863]

(إنْس) و (مَرْء) مرۆڤ[864]، (جِنّ)یش جنۆكە[865]

**.329** (مِثال)، (نَموذَج) هەردوو نمونە[866]

---

باپێکەوە بڕۆین بۆ خوێندنگە.

[859] لەمانای یەکەم و سێیەمیاندا چاوگی (علَّقَ)یە.

تعليق حكم المحكمة لمصلحة المتهم.

راگرتنی بڕیاری دادگا لەبەرژەوەندیی تۆمەتبارەکەیە.

ما هو تعليقك على الإتهامات الموّجهة اليك؟

لێدوانت چیە لەسەر ئەو تۆمەتانەی ئاڕاستەت کراون؟

تعليق الثوب في مكان غير مناسب، يزعجني كثيراً.

هەڵواسینی جلوبەرگ لەشوێنێکی نەگونجاودا، زۆر بێزارم دەکات.

[860] اللقلق طائر كبير.

حاجی لەقلەق باڵندەیەکی گەورەیە.

[861] متن الكتاب مليء بالأخطاء.

ناوەرۆکی کتێبەکە پڕە لەهەڵە.

[862] هل عندك نصّ الاتفاقيَّة؟

دەقی رێکەوتننامەکەت لەلایە؟

[863] الغزالي مفكر اسلامي عظيم.

غەزالی بیریارێکی ئیسلامیی مەزنە.

فِكْرتك غير منطقية.

بیرۆکەکەت لۆژیکی نیە.

[864] خلق الله الجن و الإنس.

خودا جنۆکەو مرۆڤی دروستکردووە.

لا يستطيع المرءُ النّجاح بدون تعب.

مرۆڤ بەبێ ماندوبون سەرناکەوێت.

[865] عالم الجِنّ مخيف.

(خِنْزِير) بەرازە[867]، (قِرْد)یش مەیمونە[868]

**.330** (شَرَعَ) دەستپێکرد[869]، (مَشروع) پرۆژە[870]

(عَبَّادُ الشَّمس)ە گوڵەبەڕۆژە[871]

**.331** (ضَعْف) لاوازی، لەگەڵ لاوازبون[872]

---

جیهانی جنۆکە ترسناکە.

866 ج مِثال: أمثلة، مُثُل. ج نموذج: نَمُوذَجات، نماذج.

صَنع الباب على مثال اختاره المشتري.

دەرگاکەی لەسەر نمونەیەك دروستکرد کە کڕیارەکە هەڵیبژارد.

عرض التاجرُ نماذجَ من السِّلع على الزبائن.

بازرگانەکە چەند نمونەیەکی کاڵاکانی پیشان کڕیارەکان دا.

867ج: خنازير

لا يأكل المسلمون لحمَ الخِنْزِير.

موسڵمانان گۆشتی بەراز ناخۆن.

لحم الخنزير هو الشيء الوحيد الذي اتفق عليه أغلب الناس أنه حرام. أما الرشوة والربا والنميمة والغيبة وقطع الارحام وأكل مال اليتيم وسوء الاخلاق بالشوارع والتلاعب بميراث الاخوات فإن الله غفور رحيم!

زۆربەی خەڵك کۆکن لەسەر ئەوەی کە گۆشتی بەراز حەرامە. بەڵام بەرتیل و سوو و قسەهێنان و بردن و غەیبەت و سەرداننەکردنی خزم و خواردنیماڵی هەتیوو بەدڕەوشتی لەشەقام و فێڵکردن لەبەشەمیراتی خوشك، ئەمانە شتگەلێکن کە خودا بەرامبەریان بەخشندەو بەبەزییە!

868جمع: قِرَدة وقُرود. مؤ: قِرْدة. جمع مؤ: قِرَد.

القرد حيوان ذكي.

مەیمون گیاندارێکی زیرەکە.

869 شرَعَ في يَشرَع ، شروعًا ، فهو شارع ، والمفعول مشروع فيه.

شَرَعَ فِي عَمَلِه الجديد.

دەستیکرد بە کارە تازەکەی. کارە تازەکەی دەستپێکرد.

870 جمع مشروعات ومشاريع

رض المشروع على مجلس الإدارة.

پرۆژەکەی خستە بەردەم ئەنجومەنی کارگێڕی.

871 زيت عبَّاد الشَّمس مفيد للصحة.

رۆنی گوڵەبەڕۆژە بەسودە بۆ تەندروستی.

872 لەمانای دووەمیاندا چاوگی (ضعُفَ)یە.

(جَفَّ) وشكبوو[873]، (جَفاف) وشكبون[874]

332. (مُكْفَهِرّ)، (عَبُوس) روگرژ، واته مۆن[875]

(نَتِن) بۆگەنە[876]، (رِيح) هەم با، هەم بۆن[877]

333. (إنْدِلاع) چیە؟ واته هەڵگیرسان[878]

---

لضُعْف الرؤية عوامل عديدة.

لاوازی بینین چەندین کارکرد (هۆکار)ی هەیە.

ضَعْفك أمام الأعداء يفرح الحاقدين.

لاوازبونت لەبەردەم دوژمنان قینلەدڵان دڵخۆشدەکات.

873 جَفَّ جَفَفْتُ ، يَجِفّ ، اجْفِفْ / جِفَّ ، جَفافًا وجُفوفًا ، فهو جافّ

عندما تجفّ البئر نعرف قيمة الماء.

کاتێك بیر وشکدەبێت، نرخی ئاو دەزانین.

874 چاوگی (جَفَّ)یە.

ما هو سبب جفاف الأرض برأيك؟

بە بۆچونی تۆ هۆکاری وشکبونی زەوی چیە؟

875 مدير مدرستنا رجل مُكْفَهِرّ.

بەڕێوەبەری خوێندنگەکەمان پیاوێکی مۆنە.

لا تكن دائمًا عَبوسًا.

هەمیشە مۆن مەبە.

876 جمع نَتْنَى

أكل اللحم النتن عمل قاتل.

خواردنی گۆشتی بۆگەن کارێکی کوشندەیە.

877 جمع أَرْوَاح وأَرْياح ورِياح، جمع الجمع أَرَاويح وأراييح.

لەمانای دووەمیاندا مورادیفی (رائحة)یە.

هبَّت ريح باردة.

بایەکی سارد هەڵیکرد.

{إنّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ}

بەڕاستی هەست بە بۆنی یوسف دەکەم.

878 چاوگی (إندَلَعَ)یە.

كان اندلاع الحرب بين العراق وايران بداية سوداء للبلدين.

هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان عیراق و ئێران بووە سەرتایەکی رەش بۆ هەردوو وڵاتەکە.

(فقَدَ) لەدەستدا[879]، (فُقدان) لەدەستدان[880]

**.334** (اِعتداء) چیە؟ دەستدرێژی[881]

(امتصَّ)و (مصَّ) هەردوکیان مژی[882]

**.335** (قَرین) هاوتاو مێرد، لەگەڵ برادەر[883]

(قرَأَ) خوێندەوە[884]، (قارِئ)یش خوێنەر[885]

---

879 فقَدَ يَفقِد ، فَقْدًا وفِقْدانًا وفُقدانًا ، فهو فاقِد ، والمفعول مَفْقود وفَقيد.

فقد الممثل شهرته الجميلة بسبب مشهده الأخير.

بەهۆی دیمەنی کۆتاییەوە، ئەکتەرەکە ناوبانگە جوانەکەی لەدەستدا.

880 چاوگی (فقَدَ)یە.

فقدان السمعة أسرع من فقدان الثروة.

لەدەستدانی ناوبانگ لە لەدەستدانی سامان خێراترە.

881 جمع اعتداءات

أدان الرَّأي العامّ اعتداء أمريكا على العراق.

رای گشتی دەستدرێژیی ئەمەریکای بۆ سەر عیراق ئیدانەکرد.

882 امتصَّ الإسفنجُ الماءَ.

ئیسفنجەکە ئاوەکەی مژی.

مَصَّ الرَّضِيعُ ثَدْيَ أُمِّهِ.

شیرەخۆرەکە مەمکی دایکی مژی.

883 جمع قُرَناءُ، مؤ قرينة، جمع مؤ قرينات وقرائِنُ

إنّه قرين معلمه في الذكاء.

بەڕاستی هاوتای مامۆستاکەیەتی لەزیرەکیدا.

خرجت مع قرينها.

لەگەڵ مێردەکەیدا چووەدەرەوە.

إيّاك وقرين السوء.

وریای برادەری خراپ بە.

884 قرَأَ يَقرَأ ، قِراءةً وقُرْآنًا ، فهو قارئ ، والمفعول مَقْروء.

قرَأ الكتابَ خلال ساعتين فقط.

پەڕتوکەکەی لەماوەی تەنها دوو سەعاتدا خوێندەوە.

885 جمع قارئون وقَرأة وقُرّاء.

قارِئ الكتاب شخص مثقف.

**.336** (جَلاوزة) پۆلیس، تاك نیه، كۆیه[886]

(لهذا السبب)، (مِنْ ثَمَّ) بۆیه[887]

**.337** (قَناة) نۆكەندو جۆگه، هەم كەناڵ[888]

(ذَيْل) واته كلك، كۆی (ذُیول)، (أذیال)[889]

**.338** (خَطَّ) (هەڵكەند)ه، هەروەها نوسی[890]

(مَقْعَد)و (كُرْسِيّ) هەردوكیان كورسی[891]

---

خوێنەری كتێب كەسێكی رۆشنبیره.

886 بەمانای پۆلیس دێت، بەڵام كۆیه نەك تاك. تاكەكەی (جِلواز)ه. واته مورادیفی (شرطِيّ)یه.

قتل في الإشتباكات جِلوازاً واحداً.

لەپێكدادانەكاندا پۆلیسێك كوژرا.

887 هەردوكیان بەمانای "بۆیه" دێن. بۆیه= لەبەر ئەم هۆیه.

إنه مصاب بمرض السكري، لهذا السبب لا يستطيع أكل الحلويات.

ئەو توشبوی شەكرەیه، بۆی ناتوانێت شیرینی بخوات.

مات والده في العام الماضي، مِنْ ثَمَّ يعمل بإستمرار لإعانة أسرته.

ساڵی رابردوو باوكی مرد، لەبەر ئەم هۆیه بەردەوام كاردەكات بۆ یارمەتیدانی خێزانەكەی.

888 جمع قَنَوات

قناة السويس منطقة بحرية هامة.

نۆكەندی سوێس ناوچەیەكی دەریایی گرنگه.

يلعب الأطفال في القناة.

منداڵەكان لەجۆگەكەدا یاریدەكەن.

تعمل زوجته فی قناة فضائية.

ژنەكەی لەكەناڵێكی ئاسمانیدا كاردەكات.

889 الثعلب حيوان طويل الذيل.

رێوی گیاندارێكی كلكدرێژه.

890 خطَّ خَطَطْتُ، يَخُطّ ، اخْطُطْ/ خُطَّ ، خطًّا ، فهو خاطّ ، والمفعول مخطوط.

خطَّ قبراً لأخيه الشهيد.

گۆڕێكی هەڵكەند بۆ برا شەهیدەكەی.

خطَّ الكتابَ بنفسه.

خۆی نوسراوەكەی نوسی.

**.339** (نَحْو) رێگایە، (رووەو)، نزیکەی[892]

(أَمْس)، (البارِحة) دوێنێ[893]، (غَد) سبەی[894]

**.340** (تَصَرُّف) چیە؟ واتە دەسکاری[895]

(نَما) گەشەیکرد[896]، (نُمُوّ) مەسدەری[897]

---

891 لا تجلس على مَقْعَدك القديم.

لەسەر کورسییە کۆنەکەت دامەنیشە.

لا أحبّ الكرسيّ الدوّار.

حەزم لەکورسیی خولاو نیە.

892سیان لەماناکانی (رێگا)و (رووەو)و (نزیکەی)ن.

سارعلى هذا النحو الخاطئ.

لەسەر ئەم رێگا هەڵەیە رۆیشت.

ذهب نحو النافذة.

رووەو پەنجەرەکە چوو.

قتل في الحرب نحو ستّة آلاف رجل.

لەجەنگەکەدا نزیکەی شەش هەزار پیاو کوژران.

893جمع أمس: آمَاس وآمُس وأُمُوس.

وصل الوفدُ أمس وحضر المؤتمر اليوم.

وفدەکەی دوێنێ گەیشت و ئەمڕۆ ئامادەی کۆنگرەکە بوو.

سافرت البارِحة إلى قريتي.

دوێنێ گەشتمکرد بۆ گوندەکەم.

894سبەی= سبەینێ.

سيصل المسافرُ غدًا أو بعد غدٍ.

گەشتیارەکە سبەی یان دووسبەی دەگات.

895 جمع تصرُّفات

ترجم الكتاب بتصرّف.

کتێبەکەی بە دەسکارییەوە وەرگێڕا.

896 نما يَنمو ، انْمُ ، نماءً ونُمُوًّا ، فهو نامٍ.

نمَا الولدُ.

منداڵەکە گەشەیکرد.

897 واتە (نُمُوّ) مەسدەر"چاوگ"ی (نَما)یە. کەواتە (نُمُوّ) بەمانای گەشەکردن دێت.

**.341** (قِراءة) چيه؟ واته خوێندنەوە[898]

(غَفْوة) بەمانای كەروێشكەخەوە[899]

**.342** (اِستهلاك) چيه؟ بەكاربردنە[900]

(إنقاذ) وەك (تَخليص) رزگاركردنە[901]

**.343** (وَقود) چيه؟ سوتەمەنی[902]

(حاكَ) و (نسَجَ)و (حَبَكَ) چنی[903]

---

هل تعلم أن شعر الإنسان، يستمر في النموّ بعد وفاته لعدة أشهر؟!

ئايا دەزانيت كە قژی مرۆڤ بۆ ماوەی چەند مانگێك پاش مردنی مرۆڤەكە، لەگەشەكردن بەردەوام دەبێت؟!

[898] چاوگی (قرَأَ)يە.

قِراءة سلسلة كتب واليناميه أمر ضروري.

خوێندنەوەی زنجيرەكتێبی واليناميه كارێكی پێويستە.

قراءة سورة الطَّلَاق في المنام تدل على نزاع بَين الْقَارِئ وَبَين زَوجته.

خوێندەوەی سورەتی تەڵاق لەخەودا ئاماژەيە بۆ ناكۆكيی نێوان ئەو كەسەی سورەتەكە دەخوێنێتەوە لەگەڵ ژنەكەيدا.

[899] جمع غَفَوات وغَفْوات.

كەروێشكەخەو: سەرخەوشكاندن: خەوی سوك نەك قوڵ و درێژ.

للغفوة فوائد صحية عديدة.

كەروێشكەخەو چەندين سودی تەندروستی هەيە.

[900] چاوگی (استهلكَ)يە.

الكليتان، يليها الجلد، يليهما المخ، هم أكثر أجزاء الجسم حاجة إلى استهلاك الماء.

گورچيلەكان، پاشان پێست و بەدوای ئەميشدا مۆخ، ئەو بەشانەی جەستەن كە زۆرترين پێويستييان بە بەكاربردنی ئاو هەيە.

[901] إنقاذ الغريق من الموت عمل صعب.

رزگاركردنی نوقمبوو لەمردن كارێكی قورسە.

تخليص الشعب من المجاعة يحتاج الى حاكم عادل فقط.

رزگاركردنی گەل لەبرسێتی تەنها پێويستی بە فەرمانڕەوايەكی دادوەر هەيە.

[902] وَقود السَّيارة غالِ.

سوتەمەنيی ئۆتۆمبێل گرانە.

[903] هەرسێكيان بەمانای (چنی) دێن، بەڵام يەكەم و دووەميان بەمانای چنين بەگشتی دێن، بەڵام سێيەميان بە مانای چنينێك دێت كە لێهاتويی تێدا بێت.

حاكت ثوباً جميلاً لخطيبها.

**.344** (اِنفراج) چیە؟ مانای رزگاربون[904]

(تقاعُد) واتە خانەنشینبون[905]

**.345** (ساقْ) مانای لاقە، کۆی (سُوق) و(سیقان)[906]

(غفَا) بە واتای سەرخەوی شکان[907]

**.346** (ذَوَبان) مانای توانەوەیە[908]

(صِیانة)ش واتای سازدانەوەیە[909]

---

جلوبەرگێکی جوانی بۆ دەزگیرانەکەی چنی.

ویل لأمَّةٍ تأكُلُ ممّا لا تزرَعُ، وتشربُ مما لا تَعْصِر، وتلبس ما لا تنسُجُ.

واوەیلا بۆ نەتەوەیەك کە شتێك دەخوا کە خۆی نایچێنێت، شتێك لەبەردەکات کە خۆی نایچنێت.

حبكت الفتاة قبعة نادرة لأبيها.

کچەکە کڵاوێکی دەگمەنی بۆ باوکی چنی.

904 چاوگی (إنفَرَجَ)یە. موورادیفی (تخَلُّص)ە.

اِنْفَرَجَ مِنَ الحزن بعد رؤية والدته.

پاش بینینی دایکی، لەخەمەکە رزگاری بوو.

905 چاوگی (تقاعدَ)یە.

عمرك قريب من سنّ التقاعُد.

تەمەنت نزیکە لەتەمەنی خانەنشینبون.

906 هەروەها بە (أَسْوُق)یش کۆدەکرێتەوە.

الزرافة إذا انزلقت ووقعت على الأرض مع انفراج سيقانها، فهي لن تستطيع القيام مرة أخرى ويمكن أن تظل هكذا إلى أن تموت.

زەرافە ئەگەر لەسەر زەوی بخزێت و لەکاتی خزاندا لاقەکانی بکرێنەوە، ئەو ناتوانێت جارێکی تر هەستێتەوەو ئەگەری ئەوە هەیە بەو شێوەیە بمێنێتەوە تا دەمرێت.

907 غفَا يَغفُو ، اغْفُ ، غَفْوًا وغَفْوةً وغُفُوًّا ، فهو غافٍ.

سەرخەوی شکان= سەرخەوی شکاند: سوکەخەوێکی کرد نەك خەوی قوڵ و درێژ.

غفا والدي في الظهر.

باوکم نیوەڕۆ سەرخەوی شکاند.

908 چاوگی (ذابَ)یە.

ذوبانُ السكَّر في الماء عملية سهلة.

توانەوەی شەکر لەئاودا پرۆسەیەکی ئاسانە.

909 صِيانة الجهاز على عاتق الشركة.

**.347** (إِذابة) چیه؟ تواندنەوە[910]

(اِرتفاع) بەرزی و بەرزبونەوە[911]

**.348** (فِرْعَون) فیرعەونە، کۆی (فَراعِنة)[912]

(سِباحَة) مانای مەلەکردنە[913]

**.349** (طَیَران) فڕین[914]، (طَارَ) فیعلەکەی[915]

(قُرابة) و (زُهاء) هەردوو نزیکەی[916]

---

سازدانەوەی ئامێرەکە لەسەر شانی کۆمپانیایە.

910 چاوگی (أَذابَ)یە.

هل قمت بإذابة الثَّلج في الماء؟

ئایا هەستایت بە تواندنەوەی سەهۆڵەکە لەناو ئاوەکەدا؟

911 لەمانای دووەمیاندا چاوگی (ارتفعَ)یە.

قريتنا تقع على ارتفاع ألف مِتْر عن سَطْح البحر.

گوندەکەمان دەکەوێتە سەر بەرزیی هەزار مەتر لەڕووی دەریاوە.

ارتفاع درجة حرارة الجسم حالة شائعة.

بەرزبونەوەی پلەی گەرمای جەستە، حاڵەتێکی بەربڵاوە.

912 فیرعەون: نازناوی پادشاکانی میسر بووە لەمێژووی دێریندا.

حكم فرعون طاغٍ مصر لمدة طويلة.

فیرعەونێکی ستەمکار بۆ ماوەیەکی زۆر حوکمی میسری کرد.

913 چاوگی (سبَحَ)یە.

السِباحَة مفيدة للصحة.

مەلەکردن بەسودە بۆ تەندروستی.

914 چاوگی (طَارَ)یە.

الدجاج غير قادرة على الطيران.

مریشك توانای فڕینی نیە.

915 طارَ يَطير، طِرْ، طَيْرًا وطَيَرانًا، فهو طَائِر.

ئەم وشەیە فیعلی (طَیَران)ە، واتە بەمانای (فڕی) دێت.

طار العُصْفُور.

چۆلەکەکە فڕی.

916عندي قُرابة ألف كتاب.

**.350** (خَطِير) وەك (خَطِر) مەترسیدارە[917]

(شَفْرة) گوێزان و جفرەو لێوارە[918]

**.351** (ذِراع) دەست ئاژەڵ، هەم گەزو بازوو[919]

(حُلْقُوم) مانای قوڕگ[920]، (بُلْعوم)یش گەروو[921]

---

نزیکەی هەزار پەڕتوکم هەیە.

هم زُهاء ألف شخص.

ئەوان نزیکەی هەزار کەسن.

[917] تَمُرُّ الأُمَّة الكرديّة الان بمرحلة سياسيّة خطيرة.

نەتەوەی کورد لەئێستادا بە قۆناغێکی سیاسیی مەترسیداردا تێپەڕدەبێت.

المريض في حالة خطرة.

نەخۆشەکە لەبارێکی مەترسیداردایە.

[918] جمع شَفَرات وشَفْرات وشِفار وشَفْر

الشفرة قطعت ذقني.

گوێزانەکە چەناگەمی بڕی.

إستطاع أن يَكشِف شفرة الاتِّصالات اللاّسلكيّة بين الجنود.

توانی جفرەی پەیوەندییە بێتەلەکانی نێوان سەربازەکان ئاشکرابکات.

شفرة السكِّين حادّة.

لێواری چەقۆکە تیژە.

[919] جمع أَذْرُع وذُرْعان.

بەمانای دەست ئاژەڵ و گەزو بازوو دێت. بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "دەست ئاژەڵ"، دەستی ئاژەڵە، بەڵام لەبەر زەروراتی شیعرەوە پیتی "ی"ەکە بە جادە کەوتووە.

گەز: پێودانگێکی درێژییە، نزیکەی 55 تا 80 سانتیمەتر دەبێت بەگوێرەی وڵاتەکان.

أصيب البعير في ذراعِه.

دەستی حوشترەکە برینداربوو.

سقطت القذيفة على بعد عشرين ذراعًا من الهدف.

هاوەنەکە لەدووریی بیست گەز لەئامانجەکەوە، کەوتەخوارەوە.

[920] جمع حلاقِمُ وحلاقيمُ

التهاب الحُلْقوم مرض مزعج.

هەوکردنی قوڕگ نەخۆشییەکی بێزارکەرە.

[921] جمع بَلاعيمُ

352. (بَطاطِس) چیه؟ مانای پەتاتە[922]

(طَماطِم) مەعلوم، واتای تەماتە[923]

353. (دَوْر) رۆڵ و (سەرە)، هەم خول و (قات)ە[924]

(خَلیط) (تێکەڵە)، کۆکەی (أخلاط)ە[925]

354. (صَنَوْبَر) وەك خۆی، واتە سنۆبەر[926]

(شَمَنْدَر) مەعلوم، مانای چەوەندەر[927]

---

يمرّ الطعام بالبلعوم قبل وصوله الى المعدة.

خواردن بە گەروودا تێپەڕدەبێت پێش گەیشتنی بە گەدە.

922 للبَطاطِس فوائد صحّية كثيرة.

پەتاتە زۆر سودی تەندروستی هەیە.

923 هل تحب الطَماطِم؟

حەزت لەتەماتە هەیە؟

924 جمع أَدوار

چوار لەدیارترین ماناکانی رۆڵ و سەرەو خول و قات (نهۆم)ن.

حفظ الممثِّلُ دوره جيّدًا.

ئەکتەرەکە رۆڵەکەی خۆی باش لەبەرکرد.

جاء دورُك الان.

ئێستا سەرەت هات.

لم ينجح الطالب في الدَّور الأوّل.

فێرخوازەکە لەخولی یەکەمدا دەرنەچوو.

تُقام الحفلة في الدور الأخير للفندق.

ئاهەنگەکە لەنهۆمی کۆتایی هۆتێلەکە سازدەکرێت.

925 أضافت السكر والماء إلى الفاكهة فصار الخليط عصيرًا.

شەکرو ئاوی کردە ناو میوەکەوە، ئینجا تێکەڵەکە بوو بە شەربەت.

926 مفرد صَنَوْبَرَة.

غالبًا ما يتم استخدام أشجار الصنوبر كأشجار لعيد الميلاد ويتم تزيينها في الحدائق.

زۆرجار درەختی سنۆبەر وەك درەختی جەژنی لەدایکبونی مەسیح بەکاردەهێنرێت و لەباخچەکاندا دەڕازێنرێتەوە.

927 يساعد تناولُ الشمندر الأحمر يومياً على تقليل تراكم الدهون في الكبد.

خواردنی چەوەندەری سور بەشێوەیەکی رۆژانە یارمەتیی کەمکردنەوەی کەڵەکەبونی چەوریی سەر جگەر دەدات.

355. (ذَكَر) چوك و نێر، كۆی دووەم (ذِكار)[928]

(شَفير) و (حافَة) هەردوكیان لێوار[929]

356. (مُسِنّ) چیە؟ بەساڵاچوو[930]

وشەی (مُسْتَلْقي) مانای پاڵكەوتوو[931]

357. (سَقْف) بنمیچە[932]، (طابَق) مانای قات[933]

(نَسَمَة) واتە كەس، كۆكەی (نسَمات)[934]

---

928 واتە ئەم وشەیە بەمانای چوك (كێر)و نێر دێت. لەمانای دووەمیاندا، واتە كاتێك بەمانای نێر دێت جەمعەكەی (ذِكار)ە.

الطول الطبيعي لذكر الإنسان في الحالة الطبيعية هو 6 إلى 10 سنتيمترات، بينما يصل إلى 12 أو 15 سنتيمتراً في حالة الانتصاب.

درێژیی چوكی مرۆڤ لەباری ئاساییدا شەش بۆ 10 سانتیمەترە، بەڵام لەباری رەپبوندا دەگاتە 12 یان 15 سانتیمەتر.

لدىّ ولد ذَكَر.

منداڵێكی نێرم هەیە.

929 لا تقف على شفير الوادي.

لەسەر لێواری شیوەكە مەوەستە.

حافةُ السيف حادّة.

لێواری شمشێرەكە تیژە.

930 جمع مُسِنّون ومَسَانٌ، مؤ مُسِنّة، جمع مؤ مُسِنّات ومَسَانٌ

يعيش والدي في دار المسنِّين.

باوكم لەخانەی بەساڵاچوواندا دەژی.

931 تستطيع الأبقار النومَ وهي واقفة على قدميها، ولكنّها لا تستطيع أنْ تحلم إلّا إذا نامت وهي مستلقية.

مانگا دەتوانێت بەپێوە بخەوێت، بەڵام كاتێك پاڵكەوتوو نەبێت، ناتوانێت خەو ببینێت.

932 جمع أسْقُف وسُقُف وسُقوف.

سقف غرفتي منخفضة.

بنمیچی ژورەكەم نزمە.

933 الجمع : طوابقُ و طوابيقُ

قات= نهۆم.

يسكن شقيقي في الطابَق الثالث من البناية.

براكەم لەنهۆمی سێیەمی باڵەخانەكەدا دەژی.

934 يبلغ تعدادُ السكّان في مصر مئة مليون نَسَمة.

ژمارەی دانیشتوانی میسر دەگاتە 100 ملیۆن كەس.

**.358** (زُبْد) کەرەیە[935]، (جُبْن) پەنیرە[936]

(قَهْوَة) قاوەیە[937]، (حَلیب)یش شیرە[938]

**.359** (خَلِیَّة) خانە[939]، (نَسیج)ە شانە[940]

(سَبّابة) پەنجە، هی شایەتومانە[941]

**.360** (إجّاص) هەرمێیە[942]، (رُمَّانْ) هەنارە[943]

---

[935] الجمع : زُبَدٌ. مفرد زُبْدَة.

الزبد مضرّ للمصابين بمرض إرتفاع ضغط الدّم.

کەرە زیانبەخشە بۆ توشبوانی بەرزەفشاری خوێن.

[936] جمع الجمع أجبان وجُبَن، مفرد جُبْنَة.

أكل الجُبْن مع الخبز اليابس له طعم خاصّ.

خواردني پەنیر بە نانی وشکەوە، تامێکی تایبەتی هەیە.

[937] جمع قَهَوات وقهاوٍ

في القهوة مادّة منبِّهة.

قاوە ماددەی وریاکەرەوەی تێدایە.

[938] حَليب البقر أكثر فائدة للصحة من اللحم.

شیری مانگا لەگۆشت بەسودترە بۆ تەندروستی.

[939] جمع خَليّات وخلايا

يتألف جسم الإنسان من مجموعة خلايا.

جەستەی مرۆڤ لەکۆمەڵێك خانە پێکدێت.

[940] جمع أَنْسِجَة

كم عدد أَنْسِجَة الجسم؟

ژمارەی شانەکانی جەستە چەندە؟

[941] بەمانای پەنجەی شایەتومان دێت، واتە ئەو پەنجەیەی دەکەوێتە نێوان پەنجەگەورەو پەنجەی ناوەڕاستەوە.

أشار بالسبّابة.

بە پەنجەی شایەتومان ئاماژەیکرد.

[942] مفرد إجّاصة.

الإجّاص فاكهة لذيذة.

هەرمێ میوەیەکی بەچێژە.

[943] مفرد رُمَّانة.

في حيدقتي شجرة رُمَّانْ كبيرة.

(قِثّاء) ترۆزی[944]، (خِیَار) خەیارە[945]

**.361** (مُقاتِل) شەڕڤان، واتە جەنگاوەر[946]

(جَیْش) سوپایە[947]، (مِتْراس)یش سەنگەر[948]

**.362** (قمَعَ) داپڵۆسی[949]، (قامِع) داپڵۆسەر[950]

(ساحِر) دڵڕفێن[951]، (فاتِن)ە دولبەر[952]

---

باخچەکەم درەختێکی گەورەی هەناری تێدایە.

[944]مفرد: قِثّاءة

القِثّاء يخفف الالتهابات.

ترۆزی هەوکرد سوکدەکات.

[945]مفرد: خِيارة

يتم استخدام قشور الخِيار في علاج حروق الشمس.

توێکڵی خەیار بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی سوتاويي بەرخۆر.

[946]جمع مقاتلون ومقاتلة

كان الشيخ محمود مقاتلاً شجاعاً.

شێخ مەحمود جەنگاوەرێکی ئازا بوو.

[947] ج: جُيُوش

قتل جيش تشاد الف مسلح من حركة بوكو حرام.

سوپای چاد هەزار چەکداری بزوتنەوەی بۆکۆ حەرامی کوشت.

[948] جمع مَتاريس

استشهد عمي أمام المتراس.

مامم لەبەردەم سەنگەرەکەدا شەهیدبوو.

[949]قمَعَ يَقْمَع، قَمْعًا، فهو قامِع، والمفعول مَقْموع

قمع النظام الوحشي الثّوارَ بالأسلحة الثقيلة.

رژێمە دڕندەکە شۆڕشگێڕەکانی بە چەکی قورس، داپڵۆسی.

[950]لا يستيطع النظام القامع قتل الناس باستمرار.

رژێمی داپڵۆسەر ناتوانێت بەردەوام خەڵك بکوژێت.

[951] جمع ساحِرون (للعاقل) وسُحّار (للعاقل) وسَحَرَة (للعاقل)، مؤ ساحرة، جمع مؤ ساحرات وسواحرُ.

في الجنة أنهار ساحرة.

بەهەشت روبارگەلی دڵڕفێنی تێدایە.

[952] دولبەر= دڵبەر.

**.363** (طحَنَ) هاڕی[953]، (رَحى)یە بەرداش[954]

(طَاحُون)، (طاحُونة) هەردوو واتە ئاش[955]

**.364** (حَرْب)و (قِتال)و(مَعْرَكة) جەنگە[956]

(بُنْدُقِيَّة)یە ماناى تفەنگە[957]

**.365** (شَرِكة) كۆمپانیا[958]، (مَعْمَل)یش كارگە[959]

---

قد تجنّن فتاة فاتنة واحدة فقط مئة حيكم.

ڕەنگە تەنها یەك كچی دولبەر سەد دانا شێتبكات.

[953]طحَنَ يَطحَن ، طَحْنًا ، فهو طاحِن ، والمفعول مَطْحون وطحين.

طحَن القمحَ بسرعة.

بەخێرایی گەنمەكەی هاڕی.

[954] الجمع : أرحاء و أرْحٍ و أَرْحِيَة و رُحِيّ ، مثنى رَحَيان

هل تستطيع حمل الرحيان؟

ئایا دەتوانیت دوو بەرداشەكە هەڵبگریت؟

[955]هەردوكیان بە (طواحِين) كۆدەكرێتەوە.

يعمل باستمرارٍ كالطّاحون.

هەمیشە كاردەكات وەك ئاش.

وضعَت الفلاحة القمح في الطاحونة.

ژنەجوتیارەكە گەنمەكەی كردە ناو ئاشەكەوە.

[956]إذا أردت السِّلْمَ فاستعدّ للحرب.

ئەگەر ئاشتیت دەوێ، خۆت بۆ جەنگ ئامادەبكە.

في 7-12-1941 هاجمت اليابان ميناء بيرل هاربر في الولايات المتحدة، مما أدى إلى دخول الولايات المتحدة حرب العالمية الثانية.

لە 7-12-1941 ژاپۆنە ئیشقۆڕ هێرشیكردە سەر بەندەری پێرڵ هاربەر لەویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا، ئەمەش بووەهۆی ئەوەی ئەمەریكا بچێتەناو جەنگی دووەمی جیهانییەوە.

قتل زوجها فی جبهة القتال.

مێردەكەی لەبەرەی جەنگدا كوژرا.

انسحَب العدو من المَعْرَكة.

دوژمن لەجەنگەكە كشایەوە.

[957]جمع بُنْدُقيّات وبنادِق

هل تجيد استخدام البُنْدُقِيَّة؟

ئایا دەزانیت تفەنگ بەباشی بەكاربهێنیت؟

(مُعْجَم) وەك (قامُوس) مانای فەرهەنگە[960]

**.366** (مَهْيَع) هەم رێگا، هەم فراوانە[961]

(بَلَد) وڵاتە، کۆکەی (بُلْدان)ە[962]

**.367** (بَزَّاز) بەواتای قوماشفرۆشە[963]

(لا فُضَّ فوكَ) مانای (دەمخۆش!)ە[964]

---

[958]جمع شَرِكات وشِرْكات

القرار الأخير يعود لمجلس إدارة الشركة.

بڕیاری کۆتایی بۆ ئەنجومەنی کارگێڕیی کۆمپانیا دەگەڕێتەوە.

أنا متواضع جداً رغم الشركات والأموال والسيارات التي لا أملكها.

من زۆر خاکیم، سەرباری ئەو هەموو کۆمپانیاو سامان و ئۆتۆمبێلانەی کە هیچیانم نیە.

[959]جمع مَعَامِل

زوجته تعمل في مَعْمل نسيج.

ژنەکەی لەکارگەیەکی چنین کاردەکات.

[960]برأيك ما هو أفضل معجم في اللغة العربية؟

بە بۆچونی تۆ باشترین فەرهەنگی زمانی عەرەبی کامەیە؟

اشتريت اليوم قاموساً جديداً.

ئەمڕۆ فەرهەنگێکی نوێم کڕی.

[961]جمع مَهايع

هذا المهْيَع خطير للغاية.

ئەم رێگایە ئەوپەڕی مەترسیدارە.

العراق بلد مَهْيَع.

عیراق وڵاتێکی فراوانە.

[962]العراق بلد متخلّف.

عیراق وڵاتێکی دواکەوتووە.

هل سافرت الى البلدان الأوروبية ؟

ئایا گەشتت کردووە بۆ وڵاتە ئەوروپییەکان؟

[963]قوماشفرۆش= کوتاڵفرۆش.

البزَّاز ليست لديه أقمشة جديدة.

قوماشفرۆشەکە قوماشی تازەی لا نیە.

**368.** (مُثلَّث) چیه؟ مانای سێگۆشه[965]

(مُرَبَّع) دوجا لەگەڵ چوارگۆشه[966]

**369.** (نَثْر) پەخشانه[967]، (مَلْحَمَة) داستان[968]

(كاتِب) نوسەره[969]، (شاعِر) هۆزانڤان[970]

**370.** (اِنهیار) چیه؟ واته داڕمان[971]

---

[964] ئەم رستەیە بۆ پەسەندكردن و سەرسامبون پێخۆشبون بەكاردەهێنرێت.

قلت له الكذب أكبر الكبائر، فقال لي: لا فُضَّ فوك!

پێموت درۆ گەورەترینی تاوانە گەورەكانە، ئەویش وتی: دەمخۆش!

[965]هل تستطيع تمييز المثلَّث من المُربَّع؟ بالطبع أستطيع.

ئایا دەتوانیت سێگۆشە لەچوارگۆشە جیابكەیتەوە؟ بێگومان دەتوانم.

[966]مساحة بيتي تتكون من مئة متر مربع.

روبەری خانووەكەم لە 100 مەتر دووجا پێكهاتووە.

هل تستطيع إيجاد مساحة المربع خلال أقل من دقيقة واحدة؟

دەتوانیت لەماوەی كەمتر لەیەك خولەكدا روبەری چوارگۆشەكە بدۆزیتەوە؟

[967]طه حسين من روّاد النثر العربيّ في العصر الحديث.

تەها حوسێن یەكێكە لەپێشەنگەكانی پەخشانی عەرەبی لەسەردەمی نوێدا.

[968]جمع مَلْحَمات ومَلاحِم

هل قرأت ملحمة حمدوك؟

داستانی حەمەدۆكت خوێندووەتەوە؟

[969]جمع كاتبون وكتّاب

أنيس منصور كاتب شهير.

ئەنیس مەنسور نوسەرێكی بەناوبانگە.

[970] جمع شُعراءُ، مؤ شاعرة، جمع مؤ شاعرات وشَواعِرُ.

هۆزانڤان= شاعیر.

كان نالي شاعراً عبقريّاً.

نالی شاعیرێكی بلیمەت بوو.

971چاوگی (اِنْهَارَ)ەیە.

نشر اِنْهِيَارُ البناية رعباً في المنطقة.

داڕمانی باڵەخانەكە تۆقینی لەناوچەكە بڵاوكردەوە.

(مُفاوَضة)یه مانای دانوستان[972]

**371.** (ثَمَن) و (قِیمَة) وەك (سِعْر) نرخە[973]

(ثَمین) هەم گران، هەمیش بەنرخە[974]

**372.** (اِستعمال) چیه؟ بەكارهێنانە[975]

(قُرص) بەمانای حەب، (عَقّار) دەرمانە[976]

**373.** (تعِبَ) ماندوبوو[977]، (تَعِبْ) ماندووە[978]

---

972 فشلت المفاوضات.

دانوستانەکان شکستیان هێنا.

[973] هەرسێکیان بەمانای نرخ دێن. نرخ= بەها.

اشتريت قميصي هذا بثمن قليل.

ئەم کراسەم بە نرخێکی کەم کڕی.

ما هي قيمة هذه السيارة الجديدة؟

نرخی ئەم ئۆتۆمبێلە تازەیە چەندە؟

ارتفع سعر البيت فی الآونة الأخيرة.

بەمدواییانە نرخی خانووەکە بەرزبووەوە.

[974] أشياءك ثمينة جداً، لا تُشترى.

شتەکانت زۆر گرانن، ناکڕدرێن.

کتابك الجديد ثمين جداً.

کتێبە نوێیەکەت زۆر بەنرخە.

[975]استعمال المال فی غير مكانه خطير.

بەکارهێنانی سامان لەشوێنی نەگونجاو مەترسیدارە.

[976]يجب عليك ابتلاع القرص مع الماء.

پێویستە حەبەکە بە لەگەڵ ئاودا قوتبدەیت.

العقار له تأثيرات جانبية.

دەرمان کاریگەریی لاوەکی هەیە.

[977] تعِبَ يَتعَب ، تَعَبًا ، فهو تَعِب

تعِب العامل.

کرێکارەکە ماندوبوو.

[978] الوالد تَعِبٌ جداً من أجل أولاده.

(دَوام) دەوامە[979]، (عُطْلة) پشووە[980]

**374.** (رَصاصة) گوللـە[981]، (رَصاص) قوڕقوشم[982]

(حَديد) ئاسنە[983]، (عُنْصُر)ە توخم[984]

**375.** (علَّقَ) هەڵواسی[985]، (عَلَق)یش زەروو[986]

(فُطْر) قارچکە، هەروەها کەڕوو[987]

---

باوکەکە زۆر ماندووە لەپێناو منداڵەکانیدا.

979 يجب أن يلتزم الجميع بمواعيد الدَّوام الرسميّة.

پێویستە هەموان بە وادە رەسمییەکانی دەوام پابەندبن.

980 جمع عُطُلات وعُطْلات وعُطَل.

قضى عُطْلَته في مدينة السليمانية.

پشووەکەی لەشاری سلێمانی بەسەربرد.

981 جمع رَصاصات ورَصاص

قُتل الطفل برصاصة طائشة.

منداڵەکە بە گوللـەیەکی وێڵ کوژرا.

982 هەروەها بە (رُصاص)یش دەنوسرێت.

يستخدم الرصاص لصُنْع أقطاب بطَّاريات السَّيارات.

قوڕقوشم بۆ دروستکردنی جەمسەری باتریی ئۆتۆمبێل بەکاردەهێنرێت.

983 ج: حدائِد

قلة الحديد في الجسم تسبب المرض.

کەمیی ئاسن لەخوێندا دەبێتەهۆی نەخۆشی.

984 جمع عناصِر

الهيدروجين والأكسجين عنصران يتكوَّن منهما الماء.

هایدرۆجین و ئۆکسجین دوو توخمن کە ئاویان لێدروستدەبێت.

985 علَّقَ يعلِّق، تعليقًا ، فهو مُعلِّق ، والمفعول مُعلَّق.

علَّق إعلانًا على حائط.

ئاگادارییەکی بە دیوارەکەدا هەڵواسی.

986 العَلَق دود مزعج.

زەروو کرمێکی بێزارکەرە.

987 جمع الجمع أفطار وفُطُور، مفرد فُطْرة.

376. (صَيْدلِيَّة) چيه؟ دەرمانخانەيە[988]

(مَشفى) و (مُسْتَشْفى) نەخۆشخانەيە[989]

377. (كَوكَب) هەسارە[990]، (نَجْم) ئەستێرە[991]

(ذهَبَ) ڕۆيشت[992]، (ذَهَبْ)يش زێڕە[993]

378. (دِيمة) بارانە، لەگەڵ بەردەوام[994]

---

الفُطْر طعام شهي.

قارچك خواردەمەنييەكى بەچێژە.

الفُطر الجلديّ حالة صحية مزعجة.

كەڕوى پێست حاڵەتێكى تەندروستى بێزاركەرە.

[988]سەربارى ئەو مانايە، موئەنەسى (صَيْدليّ)شە كە بەماناى (دەرمانساز) دێت.

بيتنا قريب من الصَيْدلِيَّة.

ماڵمان لەدەرمانخانەكەوە نزيكە.

[989]هەردوكيان بەماناى نەخۆشخانە دێن، بەڵام (مستشفى) لە (مشفى) گەورەترە.

ج مشفى: مَشافٍ

ج مستشفى: مُسْتشفَيَات، مَشافٍ.

بقيت سبعة أيام في المستشفى.

حەوت ڕۆژ لەنەخۆشخانە مامەوە.

[990] جمع كواكِبُ

هل تعلم ما هو أكبر كوكب في المجموعة الشمسية.

ئايا دەزانيت گەورەترين هەسارە لەكۆمەڵەى خۆر كامەيە؟

[991]جمع أنْجُم ونُجُم ونُجوم

هل تستطيع رؤية النجم في النهار؟

ئايا دەتوانيت لەڕۆژدا ئەستێرە ببينيت؟

[992]ذهَبَ يذهَب، ذَهابًا وذُهُوبًا.

ذهب المقاتل ولم يَعُد.

جەنگاوەرەكە ڕۆيشت و نەگەڕايەوە.

[993]جمع الجمع أذهاب وذُهُوب، مفرد ذَهَبة.

الذهب أغلى من الفضة.

زێڕ لەزيو گرانترە.

[994]جمع دِيمات ودِيَم.

(وَرَم) واتە لوو، جەمعەکەی (أَورام)[995]

**379.** (مَوقِع) پێگەو شوێن، هەروەها ماڵپەڕ[996]

(ربَطَ) واتە بەست[997]، (رابِط)یش بەستەر[998]

**380.** (مِرْوَحَة) پانکە، لەگەڵ باوەشێن[999]

---

بەمانای باران (بارانێك کە زۆر بخایەنێت بەڵام بە هێمنی و بێ هەورەگرمەو هەورەبروسکە)و بەردەوامیش دێت.

أفرحت الديمة الفلّاحين.

بارانەکە جوتیارەکانی دڵخۆشکرد.

كان عمله ديمةً.

کارەکەی بەردەوام بوو.

[995] الورم الخبيث قاتل.

لووی پیس کوشندەیە.

[996] جمع مَواقِعُ

له مَوْقِع خاصّ عند رئيس الإقليم.

پێگەیەکی تایبەتی هەیە لەلای سەرۆکی هەرێم.

الشرطة أغلقت موقع الحدث.

پۆلیس شوێنی روداوەکەی داخست.

ينشر الحزب بياناته على موقعها الرسمي.

حزب بەیاننامەکانی لەسەر ماڵپەڕی رەسمی خۆی بڵاودەکاتەوە.

[997] ربَطَ يَربُط، رَبْطًا، فهو رابط ، والمفعول مَرْبوط

ربَط الدَّابَّةَ بالعمود.

وڵاخەکەی بەست بە ستونەکەوە.

[998] بەستەر = لینك

المزيد من التفاصيل في الرابط التالي.

وردەکاریی زیاتر لەبەستەرەکەی خوارەوەدایە.

[999] جمع مَراوِحُ

المرْوَحَة غير كافية لتبريد البيت في الصيف.

پانکە بەس نیە بۆ ساردکردنی ماڵ لەهاویندا.

اشتريت مِرْوَحَة صغيرة لولدي.

باوەشێنێکی بچوکم بۆ کوڕەکەم کڕی.

(وِعاء دَمَويّ) ماناى بۆریى خوێن[1000]

**381.** (حَصَّادَة) چیه؟ ماناى دەڕاسە[1001]

(حصَدَ) دورییەوە[1002]، (مِنْجَل)یش داسە[1003]

**382.** (باذِنجان) چیه؟ باینجانە[1004]

(يَقْطِين) کولەکە[1005]، (رَيحان) ڕێحانە[1006]

**383.** (فِتنة) هەم ئاشوب، هەم ئیمتیحانە[1007]

---

[1000]جەمعەکەى (أوعية دموية)يە.

إرتفاع ظغط الدم يؤثر على الأوعية الدموية.

بەرزیى فشارى خوێن، کاردەکاتە سەر بۆرییەکانى خوێن.

[1001] هل تجيد سياقة الحَصَّادَة؟

ئایا دەتوانیت بە باشى دەڕاسە لێبخوڕیت؟

[1002] حصَدَ يَحصُد ويَحصِد ، حَصْدًا وحَصادًا ، فهو حَاصِد ، والمفعول مَحْصود وحَصِيد.

حصَد القمح كله خلال ساعة فقط.

گەنمەکەى لەماوەى تەنها سەعاتێکدا دورییەوە.

[1003]جمع مَنَاجِل

إذا رأيت منجلاً في الحلم فهذا ينبئ بأن حادثاً أو مرضاً سيمنعك من الاعتناء بأمورك أو الذهاب في رحلات.

ئەگەر لەخەودا داست بینى، ئەوە پێشبینییە بۆ ئەوەى کە روداوێك یان نەخۆشییەك دەبێتە رێگر لەبەردەمت بۆ گرنگیدان بە کاروبارەکانت یان گەشتکردنت.

[1004]يحتوى الباذنجان الأسود على نسبة عالية من الحديد والفيتامينات التى تعمل على تعزيز صحة الجسم وعلاج فقر الدم.

باینجانى رەش رێژەیەکى زۆر ئاسن و ئەو ڤیتامینانەى تێدایە کە کار لەسەر بەهێزکردنى تەندروستیى جەستەو چارەسەرى کەمخوێنى دەکەن.

[1005] مفرد يقطينة

توجد في اليقطين نسبة عالية من الحديد لذلك يحمي جسم الانسان من الإصابة بـالأنيميا.

کولەکە رێژەیەکى زۆر ئاسنى تێدایە، بۆیە جەستەى مرۆڤ لەتوشبون بە ئەنیمیا (کەمخوێنى) دەپارێزێت.

[1006] من يرى الريحان في المنام و رائحته طيبة، فهذا يشير إلى زوال الهموم و الأحزان التي يعاني منها الرائي.

هەر کەسێك لەخەودا رێحانەى بینى و بۆنى خۆش بوو، ئەوە ئاماژەیە بۆ نەمانى ئەو خەم و خەفەتانەى خەوبینەکە گیرۆدەبووە بەدەستیانەوە.

[1007]جمع فِتْنات وفِتَن

ئاشوب= ئاژاوەگێرى. ئیمتیحان= (ع: امتحان)= تاقیکردنەوە.

(ضَغْط) فشاره، واته پەستانه[1008]

**.384** (سِتّونَ) واته شەست[1009]، (خَمسونَ) پەنجایه[1010]

(ثَمانون) هەشتا[1011]، (سَبعون) حەفتایه[1012]

**.385** (عِنَب) ترێیه[1013]، (كَرْم) مانای مێو[1014]

(مَوْز) مۆزه[1015]، (تُفّاح) دێت بەمانای سێو[1016]

---

أخمدت الحكومة الفتنةَ بالقوّة.

میری ئاشوبەکەی به هێز، کپکرد.

{وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ}

و بزانن که سامان و منداڵەکانتان تاقیکردنەوەیەکن (بۆتان).

[1008] رئيس الحكومة تحت ضغط الرَّأي العامّ.

سەرۆکی حکومەت لەژێر فشاری رای گشتیدایه.

1009 وَصَلَ سِتُّونَ رَجُلاً الى القرية.

شەست پیاو گەیستنه گوندەکه.

1010 مات خَمْسُونَ شخصاً في الحادثة.

پەنجا کەس لەڕوداوەکەدا گیانیان لەدەستدا.

[1011] في الساحة ثمانون طالباً.

گۆڕەپانەکه هەشتا خوێندکاری تێدایه.

[1012] قتل فى الحرب الأخيرة سبعون جندياً أوكرانياً.

لەم جەنگەی دواییدا حەفتا سەربازی ئۆکرانی کوژران.

[1013] جمع الجمع أعناب.

لا أحب العنب.

حەزم لەترێ نیه.

[1014] جمع الجمع كُروم،مفرد كَرْمَة

مێو: درەختی ترێ

الكرم شجرة مفيدة.

مێو درەختێکی بەسوده.

[1015] مفرد مَوْزَة

الموز مفيد لتخفيض ضغط الدم.

مۆز بۆ دابەزاندنی فشاری خوێن بەسوده.

[1016] مفرد تُفّاحَة

**386.** (مَتْحَف) چیه؟ مۆزەخانە[1017]

(بُوق) واتە زوڕنا، کۆکەی (بیقان)ە[1018]

**387.** (حِصان) واتە ئەسپ[1019]، (فَرَسْ) ئەسپ، مایین[1020]

(دَقیق) ئاردو ورد[1021]، (مُدَقِّق) وردبین[1022]

**388.** (ناقَة) حوشتر(ی مێ)[1023]، (جَمَلْ) هی نێر[1024]

---

التفاح فاكهة لذيذة.

سێو میوەیەکی بەچێژە.

[1017] هەروەها بە (مُتْحَف)یش دەنوسرێت.

جمع مَتاحِفُ

لا يوجد أي متحف شهير في العراق.

عیراق هیچ مۆزەخانەیەکی بەناوبانگی لێ نیە.

[1018] هەروەها بە (بوقات) و(أبواق)یش کۆدەکرێتەوە.

البوق الة موسيقية شهيرة.

زوڕنا ئامێرێکی بەناوبانگی مۆسیقایە.

[1019]جمع أَحصِنة وحُصُن.

يستطيع الحصان أن ينام وهو واقف.

ئەسپ دەتوانێت بەپێوە بخەوێت.

[1020]جمع أفراس، مؤ فَرَس وفَرَسة.

بەمانای ئەسپ و مایینیش دێت.

سرعة ركض الفرس البالغ تصل إلى 88 كيلومتراً في الساعة.

خێرایی راکردنی ئەسپی پێگەیشتوو دەگاتە 88 کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا.

الفرس يستطيع أن يظل شهراً كاملاً واقفاً على أقدامه.

مایین دەتوانێت یەك مانگی تەواو لەسەر پێیەکانی بووەستێت.

[1021]جمع دقيقون وأدِقَّاء وأدقَّة ودقائقُ (لغير العاقل) ودقاق، مؤ دقيقة، جمع مؤ دقيقات ودقائقُ (لغير العاقل).

دقيق القمح أرخص من نظيره الشعيري.

ئاردی گەنم لەهاوتا جۆییەکەی هەرزانترە. واتە لەئاردی جۆ هەرزانترە.

المدرّس دقيق جداً في ملاحظاته.

مامۆستاکە زۆر وردە لەسەرنجەکانیدا.

[1022]يعمل كمُدَقِّق فى قسم حسابات المستشفى.

وەك وردبین لەبەشی ژمێریاریی نەخۆشخانەکە کاردەکات.

(ناقِد) رەخنەگر[1025]، (مُترجِم) وەرگێڕ[1026]

**[389.](#)** (بَعير) حوشترە[1027]، (سَنام) کۆپارە[1028]

(فَرَسُ النَّهر) ماینی روبارە[1029]

**[390.](#)** (عَشْرة) مانای دە[1030]، (مِئَة) واتە سەد[1031]

---

[1023] جمع أيْنُق وناق ونُوق ونِيَاق.

هل ركبت النّاقَةَ؟

ئایا سوار حوشتی مێ بویت؟

[1024] جمع أجمال وأجْمُل وجِمال وجَمَالة وجُمَالة وجِمالة وجُمْل، جمع الجمع جِمالات وجُمَالات وجَمالات وجمائلُ.

بەمانای حوشتری نێر دێت.

الجَمَل سفينة الصَّحراء.

حوشتر (ی نێر) کەشتی بیابانە.

[1025] جمع ناقِدون ونَقَدَة ونُقّاد

زوجها ناقد سينمائي شهير.

مێردەکەی رەخنەگرێکی سینەمایی بەناوبانگە.

[1026] أعتقد أنّ عمل المترجم أصعب من عمل الكاتب.

لەو بڕوایەدام کە کاری وەرگێڕ لە هی نوسەر قورسترە.

[1027] جمع أباعِرُ وأباعيرُ وأَبْعِرَة وبُعْران

من يرى في المنام أنه يقوم بتوزيع لحم البعير يدلّ ذلك علي حصوله على ميراث كبير عن قريب.

هەرکەسێك لەخەودا بینی گۆشتی حوشتر دابەشدەکات، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە بەمزوانە میراتێکی زۆری بۆ دەمێنێتەوە.

[1028] جمع أسْنِمة

ركوب على سنام الجمل فى المنام شيء سيء.

سواربونی کۆپارەی حوشتر لەخەودا شتێکی خراپە.

[1029] ج: أفراس النهر

ماینی روبار: گیاندارێکی وشکاوەکیی مەمکداری زەبەلاجە. زۆربەی کاتەکانی لەبنی روبار یان دەریاچەدا بەسەردەبات و جارجارەش دێتەدەرەوە بەمەبەستی هەواهەڵمژین. لەسەر گژوگیا دەژی.

تعيش أفراس النهر في مجموعات يبلغ عدد أفرادها حوالي 40 رأساً.

ماینی روبار بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ دەژین و ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکە دەگاتە نزیکەی 40 سەر.

[1030] جمع عشَرات.

شارك في الحملة عَشْرةُ رجال.

لەهەڵمەتەکەدا 10 پیاو بەشداربون.

(أَرْبَعون) چلە[1032]، (تِسْعون)یش نەوەد[1033]

**391.** (قَرْنْ) مانای شاخە، هەروەها (سەدە)[1034]

(غُدَّة) رژێنە، كۆكەی (غُدَد)ە[1035]

**392.** (بَطْن) واتە سك[1036]، (سُرَّة) ناوكە[1037]

(حبل شوكيّ)یە دڕكەپەتكە[1038]

**393.** (شَرْيان) خوێنبەرە[1039]، (وَريد) خوێنهێنەر[1040]

---

[1031] جمع مِئُون ومِئات.

قتل في الانفجار مِائة رجل.

لەتەقینەوەكەدا سەد پیاو كوژران.

[1032] قرأتُ أربعين كتابًا في السياسة.

چل كتێبم لەسەر سیاسەت خوێندووەتەوە.

[1033] تضم مكتبته تسعين كتابًا لتسعين مؤلِّفًا.

كتێبخانەكەی 90 كتێبی 90 نوسەری تێدایە.

[1034] جمع قرون.

بمناسبة مرور قرن كامل على تأسيس الحزب، أقيم إحتفال كبير.

بەبۆنەی تێپەڕبونی سەدەیەكی تەواو بەسەر دامەزراندنی حزبەكە، ئاهەنگێكی گەورە سازكرا.

البقرة لها قرنان طويلان.

مانگاكە دوو شاخی درێژی هەیە.

[1035] بە (غدائِد)یش كۆدەكرێتەوە.

تضخم الغدة الدرقية مرض شائع.

هەڵاوسانی رژێنی دەرەقی نەخۆشییەكی باوە.

[1036] جمع أَبْطُن وبُطْنان وبُطون.

عندي ألم خفيف في بطني.

سكم ئازارێكی سوكی تێدایە.

[1037] جمع سُرّات وسُرَر

تحتوي السرّة على حوالي 72000 عصب.

ناوك نزیكەی 72 هەزار دەماری تێدایە.

[1038] الحبل الشوكي جزء لا يتجزأ من الجهاز العصبي.

دڕكەپەتك بەشێكی دانەبڕاوە لەكۆئەندامی دەمار.

(فَشَل كَبَدي) سستبونی جگەر[1041]

**394.** (دِراسة) چیە، مانای خوێندنە[1042]

(مُذَاكَرة)یە سەعیکردنە[1043]

**395.** (مُخَيْخ) چیە؟ مێشکی بچوك[1044]

(عَجيزَة) سمتە[1045]، (عُسَيْلة) زێ، چوك[1046]

**396.** (إنتاج) چیە؟ بەرهەمهێنان[1047]

---

[1039] هەروەها بە (شِرْيان)یش دەنوسرێت.

جمع شِرْيانات وشرايينُ

أحيانًا يؤثِّر تصلُّب الشَّرايين على المُخ.

هەندێجار رەقبونی خوێنبەرەکان کاردەکاتە سەر مۆخ.

[1040] جمع أَوْرِدة ووُرُد ووُرود

تتكون الأوعية الدموية من الشرايين و الأوردة.

بۆرییەکانی خوێن لەخوێنبەرو خوێنهێنەر پێکدێن.

[1041] الفشل الكبدي مرض خطير.

سستبونی جگەر نەخۆشییەکی ترسناکە.

[1042] أكملت الدِراسة الثانويَّة في مجمع النصر.

خوێندنی دواناوەندیم لەکۆمەڵگەی نەسر تەواوکرد.

[1043] هل إنتهيت من مذاكرتك؟

لەسەعیکردنەکەت تەواو بویت؟

[1044] مێشکی بچوك= مێشکۆڵە: بەشێکە لەدەماخ و دەکەوێتە پشتی مۆخەوەو بە چەقی هاوسەنگیی لەش دادەنرێت.

لا توازن للجسم بغير مُخَيْخ.

بەبێ مێشکۆڵە لەش هاوسەنگ نابێت.

[1045] تكبير العجيزة لدى نساء كردستان شيء غير غريب.

گەورەکردنی سمت لەلایەن ژنانی کوردستانەوە شتێکی نامۆ نیە.

[1046] بەمانای زێ و چوکیش دێت. زێ= قوز. چوك= کێر.

لعسيلة المرأة عده أشكال.

زێی ژن چەند شێوەیەکی هەیە.

لا تفتخر بكبر عسيلتك.

شانازی مەکە بە گەورەیی چوکتەوە.

[1047] چاوگی (أنتجَ)یە.

(كُحْل) واته كل[1048]، (مُكْحُلة) كلدان[1049]

**.397** (جِرِّيث)و (جِرِّيّ) هەردوو مارماسی[1050]

(عِلمُ التُرْبة)یە مانای خاكناسی[1051]

**.398** (هُنا) ئێرەیە[1052]، (هُنَاكَ) ئەوێ[1053]

(عَنْزة) ئاسك، بزن، بەڵام هینی مێ[1054]

---

تعاني الشركة من قِلّة الإنتاج.

كۆمپانیاكە بەدەست كەمیی بەرهەمهێنانەوە دەناڵێنێت.

[1048]جمع أكْحال

وضعتِ المرأةُ الكُحْلَ في عَيْنَيْها.

ژنەكە كلی كردە چاوەكانی.

[1049]جمع مكحلات ومَكاحِل

كلدان: ئەو دەفرەی كلی تێدا دادەنرێت.

ضاعت مكحلتها، لذا غضبت.

كلدانەكەی ونبوو، بۆیە توڕەبوو.

[1050] هل الجِرِّيث صالح للأكل؟

ئایا مارماسی بۆ خواردن دەشێت؟

يبلغ طول الجرّيّ حوالي نصف متر.

درێژیی مارماسی دەگاتە نزیكەی نیو مەتر.

[1051] خاكناسی= زانستی خاك: ئەو زانستەی لێكۆڵینەوە لەسەر خاك و گڵ و هاوشێوەكانی دەكات و گرنگییان پێدەدات.

علم التربة قريب من الجغرافيا.

خاكناسی نزیكە لەجوگرافیاوە.

[1052] سألتك أين أجلس؟ فقلت: هنا.

لێم پرسیت لەكوێ دانیشم؟ وتت: ئێرە.

[1053]إنظر الى هناك.

سەیری ئەوێ بكە.

[1054] جمع عَنْزات، عنز

بەمانای بزن و ئاسكیش دێت، بزن و ئاسكی مێ نەك نێر.

اشتريت عنزة سمينة لعيد الأضحى.

بزنێكی قەڵەوم كڕی بۆ جەژنی قوربان.

إصطاد الصياد عنزة.

**.399** (بَلْشون)و (مَالِك الحَزِين) شاوه[1055]

(صَيْد) لەگەڵ (قَنْص) هەردوكيان راوه[1056]

**.400** (كِتابْ) پەڕتوكه[1057]، (دَفتَرْ)يش تيانوس[1058]

(مِبْرَاة) قەڵەمتاش[1059]، (قَلَم)ه پێنوس[1060]

---

راوكەرەكه ئاسكێكی راوكرد.

[1055] هەردوكيان بەمانای شاوه دێن. شاوه= شينەشاهۆ: باڵندەيەكه لەخێزانی لەقلەقەكان، گەردن و ملی درێژه.

البلشون طائر جميل.

شاوه باڵندەيەكی جوانه.

هل رأيت مالك الحزين في حياتك؟

ئايا لەژيانتدا شاوەت بينيوه؟

[1056]راو= شكار

صيد السمك ممنوع في المنطقة.

راوی ماسی لەناوچەكەدا قەدەغەيه.

هل تحب القنص الليلي؟

حەزت لەڕاوی شەوانه هەيه؟

[1057]جمع كُتُب

پەڕتوك= كتێب

كتاب واحد غيّر حياتي.

يەك كتێب ژيانی گۆڕيم.

[1058]جمع دفاتِر

تيانوس= دەفتەر.

صححَ المدرس دفاتر التّلاميذ.

مامۆستاكه تيانوسی قوتابييەكانی سەحكرد.

[1059]جمع مَبارٍ.

قەڵەمتاش= قەڵەمدادەر.

نسى التلميذ مبراته في المدرسة.

قوتابييەكه قەڵەمدادەرەكەی لەخوێندنگەكه بيرچوو.

[1060]جمع أقْلام.

پێنوس= قەڵەم.

أين قلمي الذي وضعته على منضدتك؟

**.401** (وُجْهَة) ئاڕاسته[1061]، (وَجْه) دەموچاو[1062]

(حَدَث)و (حادِث)، (حادِثة) روداو[1063]

**.402** (بَقِيَّة) چیه؟ واته پاشماوه[1064]

(مُسَجَّل) مانای تۆمارکراوه[1065]

**.403** (لَجْنَة) لیژنەیه، کۆی (لَجْنات)، (لِجان)[1066]

(عُمْلَة)، (نَقْد) دراو[1067]، (جَيْب) واته گیرفان[1068]

---

کوا ئەو قەڵەمەم کە لەسەر مێزەکەت دامنا؟

[1061] هەروەها (وِجْهَة)شی پێدەووترێت واته دەکرێت (و)ەکه زەممەی لەسەر بێت یان کەسرەی لەژێر بێت.

هرب في وجهة الحدود.

به ئاڕاستەی سنورەکان هەڵات.

[1062] جمع أوجُه ووُجُوه.

وجهها جميل ولكنّ طبيعتها غير مقبولة.

دەموچاوی جوانه، بەڵام بەڕاستی سروشتی (تەبیعەتی) پەسەندکراو نیه.

[1063] كان حدث الشهر الماضي مؤثراً جداً.

روداوەکەی مانگی رابردوو زۆر کاریگەر بوو.

الحادث الطارئ خلّف ثلاثة قتلى.

روداوه کتوپڕەکه سێ کوژراوی لێکەوتەوه.

مات زوجها في حادثة سيّارة.

مێردەکەی لەڕوداوێکی ئۆتۆمبێلدا گیانی لەدەستدا.

[1064] جمع بَقايا

وزّعت بقيّة الثروة على الفقراء.

پاشماوەی سامانەکه بەسەر هەژاراندا دابەشکرا.

[1065] صوتك مُسَجَّل، لذا لا تستطيع إنكار ما قلته.

دەنگت تۆمارکراوه، بۆیه ناتوانیت ئینکاری ئەوه بکەیت که وتوته.

[1066] هەروەها به (لَجَنات)یش کۆدەکرێتەوه. لیژنه= کۆمیته.

شُكّلت لَجْنَة تحقيق بهدف معرفة سبب موت المريض.

بەمەبەستی زانینی هۆکاری مردنی نەخۆشەکه، لیژنەیەکی لێکۆڵینەوه پێکهێنرا.

[1067] جمع عملة: عُمُلات وعُمْلات.

جمع نقد: نُقُود.

**.404** (مُمتاز) ئاوەڵناو، بەمانای نایاب[1069]

(صاحِبْ) خاوەن و هاوەڵ، کۆی (أصحابْ)[1070]

**.405** (قدَّرَ) خەملاّند[1071]، (تَقدیر) خەملاّندن[1072]

(رسَّخَ) چەسپاند[1073]، (تَرسیخ) چەسپاندن[1074]

---

العُمْلة المَعدِنيَّة غير شائعة في هذا العصر.

لەم سەردەمەدا دراوی کانزایی باو نیە.

صندوق النقد الدوليّ منظمة عالمية.

سندوقی دراوی نێودەوڵەتی رێکخراوێکی جیهانییە.

1068جمع أجياب وجُيوب وجِيُوب.

سُرِقت نقودُه من جيب بنطلونه.

پارەکانی لەگیرفانی پانتۆڵەکەیەوە دزران.

1069نال درجة علميَّةً ممتازة.

پلەیەکی زانستیی نایابی بەدەستهێنا.

1070هەروەها بە (صَحابة) و(صِحاب) و (صَحْب) و (صُحْبَة)ش کۆدەکرێتەوە.

من هو صاحب هذه السيارة؟

خاوەنی ئەم ئۆتۆمبێلە کێیە؟

صاحبك رجل شجاع وذكي.

هاوەڵەکەت پیاوێکی ئازاو زیرەکە.

1071 قدَّرَ يقدِّر ، تقديرًا ، فهو مُقدِّر ، والمفعول مُقدَّر

قدّر قيمة الأضرار بحوالي مليون دولار.

بەهای زیانەکانی بە نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار خەملاّند.

1072 چاوگی (قدَّرَ)یە.

تقديرك غير دقيق.

خەملاّندنەکەت ورد نیە.

1073 رسَّخَ يُرسِّخ ، ترسيخًا ، فهو مُرسِّخ ، والمفعول مُرسَّخ

چەسپاند= جێگیرکرد.

رسَّخ العمودَ أمام البيت.

ستونەکەی لەبەردەم ماڵەکەدا چەساند.

1074 چاوگی (رسَّخَ)یە.

چەسپاندن= جێگیرکردن.

**.406** (هَلاك)و (وَفاة) هەردوكيان مردن[1075]

(ثَيِّب)، (أَرْمَلَة) ماناى بێوەژن[1076]

**.407** (يابِس) واتە وشك[1077]، (يبِسَ) وشكبوو[1078]

(طرِشَ) كەڕبوو، هەم گوێى گرانبوو[1079]

**.408** (سَلَطة) زەڵاتە[1080]، (سُلْطَة) دەسەڵات[1081]

---

ترسيخ علامات المرور واجب من واجبات الحكومة.

چەسپاندنى نيشانەكانى هاتوچۆ ئەركێكە لەئەركەكانى ميرى.

[1075] كان هلاكه مفاجئاً للجيمع.

مردنەكەى شتێكى سەيرو كتوپڕ بوو بۆ هەموان.

كانت وفاته سنة 2013.

مردنەكەى لەساڵى 2013دا بوو.

[1076] هەردوكيان بەماناى بێوەژن دێن.

الثَّيِّبُ تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا.

بێوەژن قسە لەسەر خۆى دەكات.

في زقاقنا أرملة فقيرة.

كۆڵانەكەمان بێوەژنێكى هەژارى تێدايە.

[1077] جمع يُبَّس ويَبْس

لا تكن يابسًا فتكسر.

وشك مەبە دەشكێنرێيت.

[1078] يبِسَ ييبَس وييَبِس ، يُبْسًا ويُبوسةً ، فهو يابِس وييَبِس ويَبْس وييبيس

يبِست الأزهارُ.

گوڵەكان وشكبون.

[1079] طرِشَ يَطرَش ، طَرَشًا ، فهو أطرَشُ.

بەماناى "كەڕبوو" و "گوێى گرانبوو"ش دێت.

طرِش الرجلُ بسبب إنفجار عظيم.

پياوەكە بەهۆى تەقينەوەيەكى گەورەوە كەڕبوو.

طرِش وهو في التسعين من عمره.

لەتەمەنى 90 ساڵيدا گوێى گرانبوو.

[1080] أحضرت السلطة؟

زەڵاتەكەت ئامادەكرد؟

(دَقيقة) خولەك[1082]، (ساعة) كات، سەعات[1083]

**[.409](#)** (حَظيرة) گەوڕ، واتە تەویلە[1084]

(أُمْثولة) پەندە، كۆی (أماثيل)ە[1085]

**[.410](#)** (حلَّلَ) حەڵاڵكرد، هەم شیكردەوە[1086]

(ضَجَعَ) پاڵكەوت[1087]، (مَضْجَع) جێی خەوە[1088]

---

[1081] في بعض الدول سلطة الحزب أكبر من سلطة الحكومة.

لەهەندێك لەوڵاتان، دەسەڵاتی حزب لە هی حكومەت گەورەترە.

[1082] ساعة واحدة تتكون من 60 دقيقة.

یەك سەعات لە 60 خولەك پێكهاتووە.

[1083]جمع ساعات

بەمانای كات و سەعاتیش دێت. سەعات بەمانای ئامێری كاتژماردن و بەمانای ئەو ماوەیەش كە لە 60 خولەك پێكدێت.

سلَّمت عليه ساعة قدومه.

كاتی هاتنی سەلامم لێكرد.

أنتظرك ساعة فقط، بعدها أذهب.

تەنها سەعاتێك چاوەڕێت دەكەم، دواتر دەڕۆم.

اشتريت ساعة جذابة لخطيبتي.

سەعاتێكی سەرنجڕاكێشم بۆ دەزگیرانەكەم كڕی.

[1084]جمع حظيرات وحظائر و حِظار

يعمل كمنظف لحظيرة المواشي.

وەك پاككەرەوەی تەویلەی مەڕوماڵات كاردەكات.

[1085] هەروەها بە (أمثولات)یش كۆدەكرێتەوە. موورادیفی (عِبْرة)یە.

جعله أُمثولة للجميع.

كردی بە پەند بۆ هەموان.

[1086] حلَّلَ يحلِّل ، تحليلاً وتَحِلَّةً ، فهو مُحلِّل ، والمفعول مُحلَّل.

بەمانای حەڵاڵكردو شیكردەوەش دێت.

حلَّل اللهُ الزَّواجَ وحرَّم الزِّنا.

خودا هاوسەرگیری حەڵاڵكردو زینای حەرامكرد.

حلَّل الناقدُ القصيدةَ تحليلاً دقيقًا.

رەخنەگرەكە چامەكەی بەوردی شیكردەوە.

**.411** (عزَا)و (نسَبَ) واته دایەپاڵ[1089]

(مَسَلَّة) سوژن، جەمعەکەی (مَسالّ)[1090]

**.412** (جُذِمَ) گولبوو[1091]، (جذَمَ) بڕی[1092]

(مسَحَ) پێوا، چاككردۆ، سڕی[1093]

---

1087 ضجَعَ یَضجَع ، ضَجْعًا وضُجوعًا ، فهو ضاجِع

ضجَع في ظلّ شجرة.

لەسێبەری درەختەکەدا پاڵکەوت.

1088 جمع مَضاجِع

جێی خەو= جێی خەوتن= شوێنی خەوتن= خەوگە.

مضجعك غير نظيف.

خەوگەکەت پاك نیە.

1089 هەردوکیان بەمانای "دایەپاڵ" دێن. دایەپاڵ= گێڕایەوە بۆ

عَزا فشلَه إلى سوء الحَظِّ.

شکستەکەی دایەپاڵ بەدبەختی. واتە وتی هۆکاری شکستەکەی بەدبەختییە.

نسَب الخبرَ إلى مصدر موثوق.

هەواڵەکەی دایەپاڵ سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو.

1090 هەروەها بە (مَسَلاّت) کۆدەکرێتەوە.

خاط القماشَ الغليظ بالمَسَلَّة.

قوماشە ئەستورەکەی بە سوژن دوری.

1091 جُذِمَ يُجذَم ، جَذْمًا ، والمفعول مَجْذوم

گولبوو: توشی نەخۆشی گولی بوو

جُذِم الرجل في عمر الأربعين.

پیاوەکە لەتەمەنی 40 ساڵیدا توشی گولی بوو.

1092 جذَمَ يَجذِم ، جَذْمًا ، فهو جاذِم ، والمفعول مَجْذوم وجذيم

جذَم الشَّجرةَ بالفأس.

درەختەکەی بە تەور بڕی.

1093 سیان لەدیاترین ماناکانی پێوا و چاككردۆو سڕین. چاككردۆ= چاككردەوە.

مسَحَ المهندس الأرضَ.

ئەندازیارەکە زەوییەکەی پێوا.

مسَحَ الله المريض.

**.413** (عِلَّة) نەخۆشی، هەروەها بیانوو[1094]

(سُقْم)یش نەخۆشی[1095]، (تَأْریخ)ە مێژوو[1096]

**.414** (سَمَاعِ)، (اِسمَعْ) هەردوو (گوێگرە لە)[1097]

(سائِل) پرسیارکەر، سواڵکەرو شلە[1098]

**.415** (قِطار) چیە؟ شەمەندۆفێرە[1099]

---

خودا نەخۆشەکەی چاککردەوە.

مسَحَ المقعد قبل الجلوس علیه.

پێش ئەوەی لەسەری دابنیشێت، کورسییەکەی سڕی.

[1094] جمع عِلاّت و عِلَل

شفاه اللهُ من عِلَّتِه.

خودا لەنەخۆشییەکەی چاکیکردەوە.

لا تصطنع العِلل وأنت مُخطئ.

لەکاتێکدا هەڵەیت، بیانوو دروستمەکە.

[1095] جمع أَسْقام

أنقذه الله من سَقَمه.

خودا لەنەخۆشییەکەی رزگاریکرد.

[1096] التأریخ یکتبه المنتصرون.

مێژوو، سەرکەوتوان دەینوسنەوە.

[1097] هەردوکیان بەمانای "گوێگرە لە" دێن. یەکەمیان ناوی فەرمانی داخوازییەو دووەمیان فەرمانی داخوازییە.

سماعِ النَّصیحة، وإلاَّ ندمتَ.

گوێبگرە لەئامۆژگارییەکە، ئەگینا پەشیمان دەبیتەوە.

اسمع کلامه کلّه، ولکن لا تطع الّا ما أحله الله.

گوێ لەهەموو قسەکانی بگرە، بەڵام تەنها گوێڕایەڵی ئەوە بە کە خودا حەڵاڵی کردووە.

[1098] أعتقد بأنك لم تجب على سؤال السائل الثاني.

پێموایە وەڵامی پرسیاری دووەمی پرسیارکەرەکەت نەدایەوە.

لا تعط المال للسائل الزائف.

پارە مەدە بە سواڵکەری ساختە.

الماء سائل بلا لون.

ئاو شلەیەکی بێڕەنگە.

(رِعْدِيد) ترسنۆك[1100]، (صِنْدِيد) دلێره[1101]

**.416** (سرَّجَ) جوانكرد، دوری، هەم زینكرد[1102]

(خلَّصَ) بژارد، لەگەڵ رزگاركرد[1103]

**.417** (قُفَّاز) دەسكێشە، كۆكەی (قفافیز)[1104]

---

[1099]جمع قِطارات وقُطُر، جمع الجمع قُطُرات

زادت حوادث القِطارات في الآونة الأخيرة.

رووداوەكانی شەمەندۆفێر لەم دواییانەدا زیادیان كردووە.

[1100] جمع رَعادیدُ

بەمانای ترسنۆكێك دێت كە لەشی لەترساندا بلەرزێت و تێكیچێت.

لا تعتمد على الرجل الرِعْدِيد لمواجة العدو.

بۆ روبەڕوبونەوەی پیاوی ترسنۆك پشت بە پیاوی ترسنۆك مەبەستە.

[1101]الجمع : صَنادِيد

دلێر= ئازا= بەجەرگ

إنّه رَجُلٌ صِنْدِيدٌ، لا يخاف الموت.

بەڕاستی پیاوێكی ئازایە، لەمردن ناترسێت.

[1102] سرَّجَ يُسرِّج ، تسريجًا ، فهو مُسَرِّج ، والمفعول مُسَرَّج

سیان لەدیاترین ماناكانی جوانكردو دوری و زینكردە.

سرَّج اللهُ وجهَه.

خودا دەموچاوی جوانكرد.

سرَّج الخيَّاطُ الثَّوبَ.

بەرگدرووەكە پۆشاكەكەی دوری.

سرَّج الفلاح الفرسَ.

جوتیارەكە مایینەكەی زینكرد. واتە زینەكەی لێبەست.

[1103] بژارد: پاڵاوت.

خلّص الحبَّ من الحصَى.

دانەوێڵەكەی لەوردەبەرد بژارد. واتە وردەبەردەكەی لێجیاكردەوە.

خلّص الرئيس الجديد الشعب من المجاعة.

سەرۆكە تازەكە گەلی لەبرسێتی رزگاركرد.

دانەوێڵەكەی

[1104] بە (قُفَّازات)یش كۆدەكرێتەوە.

(قَطُّ)، (قَطْعًا)و (بَتاتًا) هەرگیز[1105]

**418.** وەرە مانای (جِئْ)، هەروەها (تَعال)[1106]

(بَتات) هەڵکەندن، وەك (أَثاث) ناوماڵ[1107]

**419.** (قَدِمَ)و (أَتَى)، (جاءَ) هەر سێ هات[1108]

---

رؤية القفاز في المنام تدل على الحظ السعيد والفرح والسرور للرائي.

بینینی دەسکێش لەخەودا ئاماژەیە بۆ بەختی باش و دڵخۆشی بۆ خەوبینەکە.

[1105] هەرسێکیان بەمانای هەرگیز دێن. وشەی یەکەمیان مەبنییە لەسەر زەممە.

هەرگیز: بەهیچ شێوەیەك.

ما رأيته قطُّ.

هەرگیز نەمبینیوە.

لن أسمح له التطاول عليّ قَطْعًا.

هەرگیز رێگەی پێنادەم دەمدرێژی بەرامبەرم ئەنجامبدات.

لا أتكلم عنه بتاتًا.

هەرگیز قسەی لەسەرناکەم.

[1106] واتە هەردوکیان بەمانای وەرە دێن.

جِئْ الى المدرسة قبل الظهر.

پێش نیوەڕۆ وەرە بۆ قوتابخانە.

تَعال و تحدّث مع المدير نفسه.

وەرەو قسە لەگەڵ خودی بەڕێوەبەردا بکە.

[1107] واتە وشەی (بتات) بەمانای هەڵکەندن دێت، هەروەها موراديفی (أَثاث)یشە کە بەمانای ناوماڵ دێت.

ناوماڵ: کەلوپەلی ناو ماڵ و ئۆفیس وەك قەنەفەو فەڕش و هتد...

بتات الوتد الحديدي عمل صعب.

هەڵکەندنی مێخی ئاسنین کارێکی قورسە.

اشترى أثاثًا جديدًا لزوجته الثانية.

ناوماڵێکی تازەی کڕی بۆ هاوسەری دووەمی.

[1108] هەرسێکیان بەمانای "هات" دێن.

قَدِمَ رئيس الحكومة إلى مدينة السليمانية.

سەرۆکی حکومەت هات بۆ شاری سلێمانی.

أتَى الطبيب المسعف فور حدوث الحادثة.

راستەوخۆ لەگەڵ روودانی روداوەکە، پزیشکی فریاگوزار هات.

(مِهْنَة) پیشەیە، کۆی (مِهَن)، (مِهْنات)[1109]

**.420** (قدَّمَ) پێشخست[1110]، (أخَّرَ) دواخست[1111]

(اِنتهازيّ)یە مانای هەلپەرست[1112]

**.421** (ناشدَ)، (حلَّفَ)، (أحْلَفَ) سوێنددا[1113]

(بالی) بەمانای گرنگیپێدا[1114]

---

جاء الضيف مع طلوع الشمس.

میوانەکە لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا هات.

1109 واتە بەو دوو شێوازە کۆدەکرێتەوە.

المحاماة مِهْنة حُرَّة.

پارێزەری پیشەیەکی ئازادە.

1110 قدَّمَ يقدِّم، تقديمًا وتقدمةً، فهو مُقدِّم ، والمفعول مُقدَّم

قدَّم السّاعة عشرين دقيقة.

کاتژمێرەکەی بیست خولەك پێشخست.

1111 أخَّرَ يؤخِّر ، تأخيرًا ، فهو مُؤخِّر ، والمفعول مُؤخَّر

لا تؤخِّر عمل اليوم إلى الغد ولكن أخرّه الى بعد رمضان!

ئیشی ئەمڕۆ بۆ سبەینێ دوامەخە، بەڵکو دوایبخە بۆ پاش رەمەزان!

1112 دونالد ترمب سياسيّ انتهازيّ.

دۆناڵد ترەمپ سیاسەتمەدارێکی هەلپەرستە.

1113 هەرسێکیان بەمانای "سوێنددا" دێن و لەم مانایەدا موراديفن.

ناشد صاحبه بالله أن يقول الصدق.

هاوەڵەکەی بە خودا سوێنددا کە راست بڵێت.

حلّف القاضي الشَّاهَد.

دادوەرکە شایەتحاڵەکەی سوێنددا.

أحلف الوالد إبنه أن لا يكذب مرة أخرى.

باوکەکە کوڕەکەی سوێنددا کە جارێکی تر درۆنەکات.

1114 بالى يبالي، بالِ، مُبالاةً ، فهو مُبالٍ ، والمفعول مُبالًى

ئەم کارە زیاتر لەکاتی نەرێدا بەکاردەهێنرێت.

گرنگیپێدا= گوێپێدا.

لا يُبالي كثير من النَّاس قيمةَ الوقت.

زۆرێك لەخەڵك گرنگینادەن بە بەهای کات.

422. (ذَريع) فراوان، هەم کتوپڕە[1115]

(فَقْرة) بڕگەیە[1116]، (فَقَرة) بڕبڕە[1117]

423. (مَحْرُور) کەسێکە تای لێ هاتبێ[1118]

(عُسَيْلة) چوکە، دێش بەمانای زێ[1119]

424. (نشِطَ) چالاکبوو[1120]، (نشَّطَ) چالاککرد[1121]

(ضَعَّفَ) لاوازکرد، دوو ئەوەندەکرد[1122]

---

[1115] شقيقي ذريعُ الخُطى.

براکەم هەنگاوفراوانە. واتە هەنگاوەکانی فراوان و گەورەن.

خطف موت ذريع والدي منا.

مردنێکی کتوپڕ باوکمی لێڕفاندین.

[1116]جمع فَقْرات وفَقَرات وفِقَر وفَقَار

قرأت الفقرة الأولى من المقالة فقط.

تەنها یەکەم بڕگەی وتارەکەم خوێندەوە.

[1117]جمع فَقَرات

كل إنسان له ثلاث وثلاثون فقرة.

هەموو مرۆڤێك 33 بڕبڕەی هەیە.

[1118] ئاوەڵناوەو بۆ وەسفی کەسێك بەکاردەهێنرێت کە تای لێهاتبێت. لە کاری (حَرَّ)ەوە وەرگیراوە.

جلبنا الوَلَد المَحْرُور الى مستشفى شار التعليمي.

منداڵە تالێهاتووەکەمان هێنا بۆ نەخۆشخانەی فێرکاریی شار.

[1119] بەمانای چوك و زێی مرۆڤ دێت. چوك= کێر. زێ= قوز.

لعُسَيْلة المرأة عدة أشكال.

زێی ژن چەند شێوەیەکی هەیە.

لا تفتخر بكبر عسيلتك يا رجل!

ئەی پیاو شانازی بە گەورەیی چوکتەوە مەکە!

[1120] نشِطَ يَنشَط، نشاطًا ، فهو ناشط ونشيط ونَشِط

نشط الطالبُ في دراسته.

خوێندکارەکە لەخوێندنەکەی چالاکبوو.

[1121] نشَّط العقار عضوه الذكري.

دەرمانەکە ئەندامی نێرینەی چالاککرد.

[1122] دووئەوەندەکرد= کرد بە دووئەوەندە

**425.** (حُمَّى) واته تا[1123]، سپڵیش (طِحَال)[1124]

کۆڵنجکردنە (تَشَنُّج)، (عُقَّال)[1125]

**426.** (صَدَى) چیە؟ دەنگدانەوە[1126]

(نزَحَ) خاڵیکرد، هەم دورخستەوە[1127]

**427.** (رَهْط)و (مَلأْ) و (جَماعة) کۆمەڵ[1128]

---

ضعَّفَه المرضُ.

نەخۆشییەکە لاوازیکرد.

ضعَّف المدير أجرَ العُمَّال.

بەڕێوەبەرەکە کرێی کرێکارەکانی دووئەوەندەکرد.

[1123] زالت عنه الحُمَّى بعد أن فعل الدواءُ فعلَه.

پاش ئەوەی دەرمانەکە کاری خۆی کرد، تایەکەی لەکۆڵبووەوە.

[1124] جمع طحالات وأطْحِلة وطُحُل

قد يعيش الشخص حياة طبيعية من دون طحال، ولكن استئصاله يقلّل من قوة جهاز المناعة ويجعل المصاب أكثر عرضة للأمراض.

دەکرێ مرۆڤ بەبێ سپڵ ژیانێکی سروشتی بەڕێبکات، بەڵام دەرهێنانی، کۆئەندامی بەرگری لاوازدەکات و ئەگەری توشبونی بە نەخۆشی زیاتردەکات.

[1125] هەردوکیان بەمانای کۆڵنجکردن دێن. کۆڵنجکردن= جەمامبون.

التشنُّج لا يحتاج الى المستشفى.

کۆڵنجکردن پێویستی بە نەخۆشخانە نیە.

قد يسبب البرد العُقَّال.

دەکرێ سەرما کۆڵنجکردن دروستبکات.

[1126] جمع أَصْداء

لم يُحدث الكتابُ أيَّ صَدًى في نفوس النّاس.

کتێبەکە هیچ دەنگدانەوەیەکی لەناخی خەڵکدا دروستنەکرد.

[1127] نزَحَ يَنزَح ويَنزِح ، نَزْحًا ونُزوحًا ، فهو نازِح ، والمفعول مَنْزوح

دوان لەدیارترین ماناکانی خاڵیکردو دورخستەوەیە.

نزَح البئرَ.

بیرەکەی خاڵیکرد. واتە ئاوەکەی لێدەرهێنا.

نزَحت الحكومة المعارض عن وطنه.

میری، نەیارەکەی لەنیشتمانەکەی دورخستەوە.

(ضُجَعَة)و (كَسلان)، (كَسِلْ)يش تەممەڵ[1129]

**428.** (ضِعْف) چیە؟ دوو ئەوەندە[1130]

(هرَشَ) و (حَكَّ) مانای (خوراند)ە[1131]

**429.** (أَخْضَر) واتە سەوز[1132]، (خُضار)ە سەوزە[1133]

---

[1128] هەرسێکیان بەمانای کۆمەڵ دێن. (جماعة)و (ملأ) بەمانای کۆمەڵ دێن بەگشتی، بەڵام (رهط) بەمانای کۆمەڵێك دێت کە لە سێ کەس تا حەوت یان نزیکەی 10 کەس پێکدێت و ژنیشیان تێدا نیە.

هاجم الفتاة رهط من الشبّان.

کۆمەڵێك گەنج هێرشیانکردە سەر کچەکە.

خطب في ملأ من النّاس.

لەناو کۆمەڵێك خەڵکدا وتاریدا.

يد الله مع الجماعة.

دەستی خودا لەگەڵ کۆمەڵدایە.

[1129] لا أحب الرجل الضُجَعَة.

پیاوی تەممەڵم خۆشناوێت.

الشاب الكسلان لا يصل مدينة النجاح.

گەنجی تەممەڵ ناگاتە شاری سەرکەوتن.

لا يريد صاحب العمل العامل الكسل.

خاوەنکار کرێکاری تەممەڵی ناوێت.

[1130] جمع أضعاف

ضِعْف الواحد اثنان.

دوو ئەوەندەی یەك دووە.

[1131] هەردوکیان بەمانای "خوراند" دێن.

هرَش الولد رأسَهُ.

منداڵەکە سەری خوراند.

حكَّ جسمَه بيَدِه.

جەستەی بەدەستی خوراند.

[1132] جمع خُضْر، مؤ خضراء، جمع مؤ خَضْرَاوات وخُضْر.

أحبّ اللون الأخضر كثيراً.

زۆر حەزم لەڕەنگی سەوزە.

[1133] سوق الخضار مزدحم.

(فاكِهة) میوە[1134]، (طُحلَب)ە قەوزە[1135]

**430.** (كُلّ) هەموو[1136]، (قِسْم) و (جُزْء) مانای بەش[1137]

(أكْحَل)و (أَسْود) دێن بە مانای رەش[1138]

**431.** (أَبْقَى)، (أَبَاتَ)، (بَقَّى) هێشتەوە[1139]

---

بازاڕی سەوزە قەرەباڵغە.

[1134] جمع فَواكِه

يحبّ الأطفال أكل الفاكهة.

منداڵ حەزی لەخواردنی میوەیە.

[1135] جمع الجمع طَحَالب

البركة مليئة بالطَّحالب.

گۆمەکە پڕە لەقەوزە.

[1136] (كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ)

هەموو کەسێك مردن دەچێژێت.

لا تنتظرْ من غيرِكَ ما تُريدُهُ

فكلّ ما قدْ تحتاجُهُ فيكَ موجودُ

جگە لەخۆت چاوەڕێی هیچ پێویستییەك مەکە لەکەسی تر

هەموو ئەو شتانەی کە رەنگە پێویستت بێت، لەخۆتدا هەیە

[1137] جمع قسم: أقْسام. جمع جزء: أجزاء.

قِسْم اللُّغة العربيّة في الجامعة يحتاج ثلاثة أساتذة.

بەشی زمانی عەرەبیی زانکۆکە پێویستی بە سێ مامۆستا هەیە.

قرأت الجزء الرئيسي من الكتاب.

بەشی سەرەکیی کتێبەکەم خوێندەوە.

[1138] جمع أكحل: كُحْل، مؤ كَحْلاءُ، جمع مؤ كَحْلاوات وكُحْل.

جمع أسود: سُود وسُودان، مؤ سوداءُ، جمع مؤ سَوْداوات وسُود.

هەردوکیان بەمانای رەش دێن.

لون جوّالي أكحل.

رەنگی مۆبایلەکەم رەشە.

إرتداء اللباس الأسود يدلّ على الحزن.

لەبەرکردنی پۆشاکی رەش بەڵگەی خەفەتە.

[1139] یەکەم و سێیەمیان بە مانای هێشتنەوە بەگشتی دێن، بەڵام دووەمیان زیاتر بەمانای هێشتەوەی میوان لەماڵی خۆت دێت.

(عجَمَ) مانای تاقیکردەوە[1140]

**432.** (عَجْماء)، (بَهیمة) هەردوکیان ئاژەڵ[1141]

(ابْن آوى)یە بەمانای چەقەڵ[1142]

**433.** (جرَفَ) راماڵی[1143]، (جارِف) راماڵەر[1144]

(أعْسَر) واتە سەخت، وەك (أیسَر) چەپلەر[1145]

---

رغم وجود خلاف شدید أبقى على صداقته معه.

سەرباری بونی ناکۆکییەکی توند، هاوڕێیەتییەکەی لەگەڵدا هێشتەوە.

أبَاتَ الضَّیْفَ فی منزله.

میوانەکەی لەماڵەکەی خۆیدا هێشتەوە.

بقَّى الجهاز المکسور فی مکانه.

ئامێرە شکاوەکەی لەشوێنی خۆیدا هێشتەوە.

1140 واتە موورادیفی (اختبر)یە.

عجَمَ یَعجُم ، عَجْمًا ، فهو عاجِم ، والمفعول مَعْجوم

عجم الجهاز بنفسه.

خودی خۆی ئامێرەکەی تاقیکردەوە.

1141 جمع عجماء: عَجْمَاوَات. جمع بهیمة: جمع بهائم

لا تؤذي العجماء.

ئازاری ئاژەڵ مەدە.

كان الإقطاعیون یعاملون الفلاحین معاملة البهائم.

دەرەبەگەکان وەك ئاژەڵ رەفتاریان لەگەڵ جوتیارەکاندا دەکرد.

1142 ج: بَنَاتُ آوى

ابن آوى في المنام رجل یمنع الحقوق عن أربابها.

چەقەڵ لەخەودا پیاوێکە کە ماف نادات بە خاوەنەکانی.

1143 جرَفَ یَجرُف ، جَرْفًا ، فهو جارِف ، والمفعول مَجْروف.

جرَف الثُّلوج عن طریق المارّة.

بەفرەکەی لەسەر رێگای رێبواران راماڵی.

1144 بکەری (جرفَ)یە.

قتله سیلٌ جارف.

لافاوێکی راماڵەر کوشتی.

1145 واتە وشەی (أعْسَر) بەمانای سەخت دێت، هەروەها موورادیفی (أیسَر)یشە کە بەمانای چەپلەر دێت.

434. (كالَ) دەپێوێ[1146]، (مِكيال)یش پێوەر[1147]

(نَقّار) وەك (قَرّاع) مانای داركونكەر[1148]

435. (حَفْنَة) واتە مشت، هەم مانای كۆمەڵ[1149]

(واقعَ)و (جامعَ) جوتبوو لەگەڵ[1150]

---

أمضيت يوماً أعْسَراً.

رۆژێكی سەختم بەڕێكرد.

ولدي أعسر.

كوڕەكەم چەپلەرە.

خطّ الأيسر أجمل من نظيره الأيمن.

نوسینی چەپلەر لە هی راستلەر جوانترە.

1146 كالَ يَكِيل ، كِلْ ، كَيْلاً ، فهو كائِل ، والمفعول مَكيل

كال الحُبُوبَ.

دانەوێڵەكەی پێوا. واتە بۆ ئەوەی بزانێت چەند كیلۆگرامە یان چەند تەنەكەیەو هتد...

1147 جمع مَكاييل

مِكيالك لا يعمل بشكل جيّد.

پێوەرەكەت بە باشی كارناكات.

1148 مەبەستم لەوشەی (داركونكەر) لێرەدا (داركونكەرە)یە كە باڵندەیەكی بەناوبانگە، بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر بزوێنی كۆتاییەكەم لابردووە.

عندما يقوم النقّار الأخضر بحفر عشّه فإن سرعة عمله تصل إلى 100 كيلومتر في الساعة.

كاتێك داركونكەرەی سەوز هەڵكەندنی هێلانەكەی ئەنجامدەدات، خێرایی كارەكەی دەگاتە 100 كیلۆمەتر لەكاژێرێكدا.

القرَّاع طائر عجيب.

داركونكەرە باڵندەیەكی سەیرە.

1149 جمع حَفَنات وحَفْنات

احتفظ في غربته بحفنة من تراب بلده.

لە غەریبایەتییەكەیدا مشتێك خۆڵی وڵاتەكەی پێبوو.

قُتل بعد هجوم من قبل حُفنة من المشاغبين.

پاش هێرشێكی كۆمەڵێك گێرەشێوێن، كوژرا.

1150 جوتبوو لەگەڵ: سێكسی كرد لەگەڵ.

واقع الرَّجلُ زوجتَه.

**.436** (عطَّار) بۆنفرۆش، هەم هی بەهارات[1151]

(لِقاء) دیدارە، کۆکەی (لِقاءات)[1152]

**.437** (حِزام) و (زُنّار) هەردوو پشتێنە[1153]

(مِطفأَة) مانای (ئاگرکوژێن)ە[1154]

**.438** (صَعید) واتە ئاست، وەك (تُراب)یش خۆڵ[1155]

---

پیاوەکە جوتبوو لەگەڵ ژنەکەیدا.

لا تجامع زوجتك فی النهار.

لەڕۆژدا لەگەڵ ژنەکەت جوت مەبە.

1151 بەمانای بۆنفرۆش و بەهاراتفرۆشیش دێت. بۆنفرۆش= عەترفرۆش.

نشتري البُخورَ من عند العطَّار.

بوخورد لەلای بۆنفرۆش دەکڕین.

کان العطَّار رجلاً متبسماً.

بەهاراتفرۆشەکە پیاوێکی دەم بەخەندە بوو.

1152 کشف سرّاً عظیماً في لِقاء صحفيّ.

لەدیدارێکی رۆژنامەوانیدا نهێنییەکەی گەورەی ئاشکراکرد.

1153 هەردوکیان بەمانای پشتێن دێن.

شدَّ المقاتلُ حِزامه.

جەنگاوەرەکە پشتێنەکەی تونکرد.

زُنّارك جمیل.

پشتێنەکەت جوانە.

1154 جمع مطافِئُ

ئاگرکوژێن: ئامێری ئاگرکوژاندنەوە.

هل عندك مِطفأَة في البیت؟

ئایا لەماڵەوە ئاگرکوژێنت هەیە؟

1155 واتە وشەی (صعید) بەمانای ئاست دێت، هەروەها وەك (تراب)یش بەمانای خۆڵ دێت. بەڵام جیاوازییەکەی بچوك هەیە. (تراب) بەمانای خۆڵ دێت بەگشتی، بەڵام (صعید) بەمانای خۆڵێك دێت کە پاك بێت.

أدینت الجریمة علی الصَّعید المحليّ والعالميّ.

تاوانەکە لەسەر ئاستی ناوخۆیی و جیهانی، ئیدانەکرا.

تَیَمَّمُوا بالصَعِید.

(نَغيل)و (نَغِل) هەردوو مانای زۆڵ[1156]

**439.** (خادِم) خزمەتکار، جەمعەکەی (خُدّام)[1157]

(لَكِنْ)، (لَكِنَّ)، (إِنَّمَا) بەڵام[1158]

**440.** (وَقِحْ) چیە؟ چەقاوەسوو[1159]

(باتَ و (أصبحَ) هەردوو واتە بوو[1160]

---

بە خۆڵ تەیەموم بکە.

لا يملأ عينه إلا الترابُ.

جگە لەخۆڵ هیچ شتێك چاوی پڕناکات.

1156 هو وَلَدٌ نَغِلٌ، لا يعرف أحد أباه.

ئەو کوڕێکی زۆڵە، هیچ کەسێك باوکی ناناسێت.

الطفل النغيل غير مذنب.

منداڵی زۆڵ بێگوناهە.

1157 جگە لە (خُدّام) بە (خادمون) و (خَدَم) و(خَدَمة)ش کۆدەکرێتەوە.

مؤ خادم وخادمة.

المال خادم جيد، وسيد رديء.

سامان خزمەتکارێکی باش و گەورەیەکی خراپە.

1158 هەرسێکیان بەمانای بەڵام دێن.

تلبّدت الغيوم لكن الجوُّ معتدل.

هەورەکان ڕەوینەوە، بەڵام کەشوهەوا مامناوەندە.

الفتاة جميلة جداً، لَكِنَّ خطيبها غير وسيم.

کچەکە زۆر جوانە، بەڵام دەزگیرانەکەی قۆز نیە.

عملك جيد، إنّما دافعك غير واضح.

کارەکەت باشە، بەڵام پاڵنەرەکەت ڕون نیە.

1159 جمع وقِحون ووُقْح ووُقُح.

هو شخصٌ وقِحٌ، لا يحترم الشيوخ.

ئەو کەسێکی چەقاوەسووە، ڕێز لەپیر ناگرێت.

1160 لەم مانایەدا موورادیفن.

بات الأمرُ معلومًا.

کارەکە بووە کارێکی زانراو. واتە کارەکە زانرا.

أصبح الحقُّ واضحًا.

441. (وَرَقْ) گەڵایە[1161]، (بُرْعُم)یش چرۆ[1162]

(مِخَخَة) مۆخە، بەڵام تاك نا كۆ[1163]

442. (مِصْداق) بەڵگەیە، وەك (صَدوق) راستگۆ[1164]

(كَذّاب) درۆزن[1165]، (كِذْبة)یە درۆ[1166]

443. (مَثَلاً) چیە؟ بۆ نمونە[1167]

---

راستی بووە شتێكی روون. واتە راستی رونبووەوە.

[1161] الجمع : أَوراقٌ و وراقٌ. مفرد وَرَقَة.

سقوط ورق الشجر يذّكرنا الموت.

وەرینی گەڵای دار مردنمان بیردەخاتەوە.

[1162] جمع بَراعِمُ وبراعيم

قلبه رقيق كالبُرْعُم.

دڵی وەك چرۆ ناسكە.

[1163] تاكەكەی (مُخّ)ە. بە (أمخاخ) و(مخاخ)یش كۆدەكرێتەوە.

المخّ هو الجزء الأكبر من الدماغ.

مۆخ گەورەترین بەشی دەماخە.

[1164] واتە (مِصْداق) بەمانای بەڵگە دێت، هەروەها موراديفی (صَدوق)یشە كە بەمانای راستگۆ دێت.

هذا مِصْداق قوله.

ئەمە بەڵگەی قسەكەیەتی.

لا تخف من الصاحب الصَدوق.

لەهاوڕێی راستگۆ مەترسە.

زوجها مؤمن تقِيٌّ مِصْداق.

مێردەكەی بڕواداریێكی لەخواترسی راستگۆیە.

[1165] {وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ}

بێباوەڕەكان وتیان ئەمە جادوگەرێكی درۆزنە.

[1166] جمع كِذْبات

كِذْبة إبريل الماضي أخافت الكثير من الناس.

درۆكەی نیسانی رابردوو زۆر كەسی ترساند.

[1167] ماذا سيكون ردك لو بصق أحد بوجهك مَثَلاً.

كاردانەوەت چی دەبێت ئەگەر بۆ نمونە یەكێك تف لەدەموچاوت بكات.

(تَوْه)و (تَوَهَان) ڕێلێتێكچونه[1168]

**444.** (داهِية) زيرەك[1169]، (باقِعَة) زۆرزان[1170]

(شَجَر) درەخته[1171]، (غابَة) دارستان[1172]

**445.** (ضَيْر) و (ضَرَر) زيان، كۆی دووەم (أضرار)[1173]

(ثَعْلَب) ڕێوییه[1174]، (سَمسَم) ڕێوی، ژار[1175]

---

[1168] هەردوكيان چاوگی (تاهَ)ن.

قد يكون التوه عقوبة من عند الله.

دەكرێ ڕێلێتێكچون سزايەك بێت لەلايەن خوداوە.

للتَوَهَان علاقة بالذاكرة.

ڕێلێتێكچون پەيوەندی بە يادگاوە هەيە.

[1169] جمع أدهياء ودواهٍ (لغير العاقل)

ئەم وشەيە بۆ نێرو مێش بەكاردەهێنرێت.

يرأس المجموعة رجل داهية.

پياوێكی زيرەك سەرۆكايەتيی گروپەكە دەكات.

[1170] الجمع : بواقع

لا تصدّق الرجل الباقعة.

بڕوا بە پياوی زۆرزان مەكە.

[1171] جمع الجمع أشجار،مفرد شجرَة

لا أحب شجَر التفّاح.

حەزم لەدرەختی سێو نيە.

[1172] جمع غابات وغاب

تعيش الحيوانات المفترسة في الغابة.

گياندارە دڕندەكان لەدارستاندا دەژين.

[1173]واتە ئەم دوو وشەيە بەمانای زيان دێن، كۆی وشەی دووەميشيان كە (ضَرَر)ە، (أضرار)ە.

أَصَابَهُ ضَيْرٌ مِنْهُ.

لەلايەن ئەوەوە زيانێكی پێگەيشت.

أحدثت الحرائقُ أضرارًا جسيمة في البيوت.

ئاگرەكان زيانگەلێكی گەورەيان بە ماڵەكە گەياند.

[1174]جمع ثَعالِبُ، مؤ ثعْلبة.

الثعلب حيوان ماكر.

446. (خلِقَ)و (رَثَّ) هەردوكيان كۆنبوو[1176]

(تاهَ) بەماناى رێگەى لێتێكچوو[1177]

447. (أجنبيّ) چيە؟ واتە بێگانە[1178]

(نشَدَ) گەڕابۆ، مەسدەر (نِشْدان)ە[1179]

448. (جنُبَ) چيە؟ لەشى پيسبوو[1180]

---

رێوى گياندارێكى فێڵبازە.

سأل المعلم طلابه: هل الثعلب يبيض أم يلد؟

فقال طالب: الثعلب مكار يا أستاذ، يتوقع منه كل شيء!

خوێندكارێك لەوەڵامدا دەڵێت: مامۆستا رێوى سەگە، هەموو شتێكى لێ چاوەڕواندەكرێت!

[1175] دوان لەماناكانى رێوى و ژارن. ژار= ژەهر. واتە لەم دوو مانايەدا موراديفى (ثعلب)و (سمّ)ە.

السَّمْسَمُ يأكل الدجاج.

رێوى مريشك دەخوات.

لا تلمس السَّمْسَم.

دەست مەدە لەژەهرەكە.

[1176] خلِقَ الثَّوبُ.

جلوبەرگەكە كۆنبوو.

رَثَّ قميصه بعد يومين فقط من إرتداءه بسبب عمله المرهق.

تەنها دوو رۆژ پاش لەبەركردنى، كراسەكەى بەهۆى كارە شەتەككەرەكەيەوە، كۆنبوو.

[1177] تاهَ يَتُوه، تُهْ، تَوْهًا وتَوَهَانًا ، فهو تائِه.

تاه الرجل في الجبل.

پياوەكە لەشاخەكەدا رێگەى لێتێكچوو.

[1178] جمع أجانبُ، مؤ أجنبيّة، جمع مؤ أجنبيّات وأجانبُ.

لا أستخدم العملات الأجنبيّة.

دراوى بێگانە بەكارناهێنم.

[1179] واتە مەسدەرى كارى (نشَدَ)، (نِشْدان)ە. هەروەها (نَشْد)يش مەسدەرى هەمان كارە. مەسدەر= (ع: مصدر)= چاوگ.

ضاعت سيارة الرجل فنشدها في مراكز الشرطة.

ئۆتۆمبێلى پياوەكە ونبوو، بۆيە لەبنكەكانى پۆليس بۆيگەڕا.

[1180] جنُبَ يَجنُب ، جَنَابةً ، فهو جُنُب.

جنُب الرجل أثناء النوم.

پياوەكە لەكاتى نوستندا لەشى پيسبوو.

(غُلَّ)، (ظمِئَ)، (عطِشَ) تینوییبوو[1181]

**449.** (أعْجَم)و (أَبْكَم)، (أخْرَس) مانای لاڵ[1182]

(غُلّ) کەلەپچەیە، جەمعەکەی (أَغْلال)[1183]

**450.** (أتحفَ)، (أهْدَى)، (قَدَّمَ) پێشکەشکرد[1184]

(خلَّقَ) هەڵبەست، لەگەڵ دروستکرد[1185]

---

[1181] هەرسێکیان بەمانای "تینوی بوو" دێن، بەڵام ئاستی تینوێتیی (غُلَّ)و (ظمِئَ) لەوانی تر زیاترە.

غُلَّ الصائم.

ڕۆژووەوانەکە تینوی بوو.

ظمِئَ الجنديُّ أثناء التدريب.

سەربازەکە لەکاتی ڕاهێناندا تینوی بوو.

عطِش من الحرِّ الشَّديد.

بەهۆی گەرمای زۆرەوە تینوی بوو.

[1182] هەرسێکیان بەمانای لاڵ دێن. لاڵ= ناگۆ.

الحيوان مخلوقٌ أعجم.

ئاژەڵ دروستکراوێکی لاڵە.

شقيقي أبكم.

براکەم لاڵە.

الإنسان الأخرس محفوظ من آفات اللسان.

مرۆڤی لاڵ لەنەخۆشییەکانی زمان پارێزراوە.

[1183] أزعج الغلّ السجين.

کەلەپچەکە زیندانییەکەی بێزارکرد.

[1184] هەرسێکیان لەم مانایەدا موڕادیفن.

أتحف خطيبته هديَّةً.

دیارییەکی پێشکەش کرد بە دەزگیرانەکەی.

الهديَّة لا تُهدى الى العدو.

دیاری پێشکەش بە دوژمن ناکرێت.

قدَّم الطعامَ إلى ضيوفه.

خواردنەکەی پێشکەش بە میوانەکانی کرد.

[1185] خلَّق الله الكون.

**451.** (كمَّلَ)، (أكملَ)، (أتمَّ) تەواوكرد[1186]

(مرَّنَ) راهێنا، لەگەڵ نەرمكرد[1187]

**452.** (جنَّبَ) چیە؟ دورخستەوە[1188]

(جرَدَ) پاككرد، هەم روتكردەوە[1189]

**453.** (محاشِم) ئەندام، بەس هی زاووزێ[1190]

(أوَّل البارِحة) بەمانای پێرێ[1191]

---

خودا گەردونی دروستكرد.

خلَّق المجرم التهمة ضد البريء.

تاوانبارەكە تۆمەتەكەی لەدژی بێتاوانەكە هەڵبەست.

1186 هەرسێكیان بەمانای (تەواوكرد) دێن.

كمَّل عملَهُ بسرعة عجيبة.

كارەكەی بەخێراییەكی سەیر تەواوكرد.

{الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ}

ئەمڕۆ ئاینەكەم بۆ تەواوكردن.

أتمّ قراءة الكتاب خلال يوم واحد.

لەماوەی یەك رۆژدا خوێندنەوەی كتێبەكەی تەواوكرد.

1187 كوڕەكەی لەسەر مەلەكردن راهێنا. واتە راهێنانی پێكرد لەسەر مەلەكردن.

مرَّن الجهاز الكهربائي الحديدَ بسرعة.

ئامێرە كارەباییەكە ئاسنەكەی بەخێرایی نەرمكرد.

1188 جنَّبت الشرطة المشاغبين عن المدرسة.

پۆلیس ئاژاوەگێڕەكانی لەخوێندنگەكە دورخستەوە.

1189 جرَدَ يَجرُد ، جَرْدًا ، فهو جارِد ، والمفعول مَجْرود

جرَد البطاطسَ.

پەتاتەكەی پاككرد. واتە توێكڵەكەی لێكردەوە.

جرَده من ثوبه.

لەجلوبەرگەكەی روتكردەوە. واتە جلوبەرگەكەی لەبەرداكەند.

1190 بەمانای ئەندامی زاووزێ دێت. وشەكە كۆیە نەك تاك.

لا تظهر محاشمك الا لزوجتك.

ئەندامی زاووزێت بۆ هاوسەرەكەت نەبێت، پیشانی كەسی تری مەدە.

454. (سيِّد) گەورەیە، لەگەڵ (بەڕێز)ە[1192]

(مُتزمِّت) مانای کۆنەپارێزە[1193]

455. (شَهادة) زانین، لەگەڵ شەهیدبون[1194]

(انْبِهار) مانای هەناسەسواربون[1195]

456. (تمرَّغَ) چیە؟ مانای خۆی گەوزان[1196]

(طَحَّان) ئاشڤانە، واتە ئاشەوان[1197]

---

[1191] زارت والدتها المریضة أوَّل البارِحة.

پێرێ سەردانی دایکە نەخۆشەکەی کرد.

[1192] جمع أسْیاد وسادَة، مؤ سیِّدة

محمد سیِّد عشیرته.

محەمەد گەورەی هۆزەکەیەتی.

أرسلت رسالة الی السیِّد عبدالله.

نامەیەکم نارد بۆ بەڕێز عەبدوڵڵا.

[1193] واتە کەسێك توند بێت و دژی تازەکردنەوەو گۆڕانکاری بێت.

إنه رجل مُتزمِّت، لا یسمح لبناته الدراسة.

پیاوێکی کۆنەپارێزە، رێگەنادات کچەکانی بخوێنن.

[1194] لەمانای یەکەمیاندا مورادیفی (شهِد)یەو لەمانای دووەمیاندا مورادیفی (استشهاد)ە.

یشهد الله أنا لم أره من قبل.

خوا دەزانێت کە من پێشتر ئەوم نەبینیوە.

مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ.

هەرکەسێك بەڕاستی داوای شەهیدبون لەخودا بکات، ئەوە خودا دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدان ئەگەرچی لەسەر جێگەی خەوتنیش بمرێت.

[1195] چاوگی (انبهر)یە.

الانبهار حالة مزعجة.

هەناسەسواربون حاڵەتێکی بێزارکەرە.

[1196] خۆی گەوزان= خۆی گەوزاند.

تمرَّغ علی التُّراب.

لەسەر خۆڵەکە خۆی گەوزاند.

[1197] کان الطَحَّان رجلاً سمیناً.

457. (حَلَمَ) چیە؟ خەوی بینی[1198]

(صادفَ) واتە بەرێکەوت بینی[1199]

458. (تَصادَفَ) مانای بەرێکەوت بینی[1200]

(فَقْر) وەك (فاقة) واتە نەبونی[1201]

459. (اِحتقبَ) چیە؟ واتە ئەنجامدا[1202]

(مَیْسور)و (ثَريّ) هەردوکیان دارا[1203]

460. (عُلْوِيّ) ئاسمانی، هەروەها بەرزە[1204]

---

ئاشەوانەکە پیاوێکی قەڵەو بوو.

1198 حلَمَ، يَحلُم، حُلْمًا، فهو حالم

حلَم الرجل فذهب مسرعاً الى عالم المدينة.

پیاوەکە خەوی بینی، بۆیە بەپەلە چوو بۆ لای زانای شارەکە.

1199 صادف صديقَه في الطَّريق.

لەرێگادا هاورێکەی بەرێکەوت بینی.

1200 تَصَادَفَ الصَّدِيقَانِ في السوق.

دوو هاورێکە بەرێکەوت لەبازاڕ یەکتریان بینی.

1201 نەبونی= هەژاری.

دفعه الفقْر إلى السفر للخارج.

هەژاری پاڵیپێوەنا کە سەفەربکات بۆ دەرەوە.

الفاقة مرض إقتصادي.

هەژاری نەخۆشییەکی ئابورییە.

1202 احتقب الإثمَ أمام الناس.

لەبەردەم خەڵکدا گوناهی ئەنجامدا.

1203 دارا= دەوڵەمەند.

طلب يدها رجل مَيْسور.

پیاوێکی دەوڵەمەند داوایکرد.

هل أنت ثَريّ؟

ئایا تۆ دەوڵەمەندیت؟

1204 لەمانای یەکەمیاندا مورادیفی (سماويّ)یە.

رأيت في المنام نوراً عُلْوِيّاً دخل بيتي.

(حَراميّ)، (سارِق)، هەروەك (لِصّ) دزە[1205]

**461.** (بَهاء) گەورەیی، جوانبون و جوانی[1206]

(طُول) درێژییە[1207]، (عَرْض) مانای پانی[1208]

**462.** (رغِبَ) چیە؟ حەزیلێکرد[1209]

(تشمَّر لـ) خۆی لەبۆ هینکرد[1210]

---

لەخەودا بینیم روناکییەکی ئاسمانی هاتەناو ماڵەکەمەوە.

قفز من مبنى عُلْويّ بلا خوف.

بەبێ تر لەبینایەکی بەرزەوە بازیدا.

[1205]قبض الشرطيّ على الحراميّ.

پۆلیسەکە دزەکەی گرت.

عقاب السارق في الإسلام قطع اليد.

سزای دز لەئیسلامدا دەستبڕینە.

إذا تخاصم اللّصّان ظهر المسروق.

ئەگەر دوو دز ناکۆکییان کەوتە نێوان، دزراوەکە ئاشکرادەبێت.

[1206] لەمانای دووەمیاندا چاوگی (بَها)یە.

بهاء الله فوق كلّ شيء.

گەورەیی خودا لەسەروو هەموو شتێکەوەیە.

بها وجهُه حين رأى أمه.

کاتێك دایکی بینی دەموچاوی جوان بوو.

جذب بهاء العروس إنتباه الحاضرين.

جوانیی بوکەکە سەرنجی ئامادەبوانی ڕاکێشا.

[1207] هل قست طول النافذة؟

درێژیی پەنجەرەکەت پێوا؟

[1208]عَرْضُ القطعة الأرضية قليل.

پانیی پارچە زەوییەکە کەمە.

[1209] رغِبَ، يَرغَب، رَغْبًا ورَغَبًا ورَغْبةً ورُغْبةً، فهو راغِب، والمفعول مَرْغوب.

رغِب الزواجَ وهو طالب.

کاتێك فێرخواز بوو، حەزی لەهاوسەرگیری کرد.

[1210] مەخسەوی شەریفم لە "خۆی لەبۆ هینکرد"، "خۆی لەبۆئامادەکرد"ە.

تشمّر للعمل بإخلاص.

**.463** (رَضيع) منداڵ و برای شیرییه[1211]

(باسور) ماناکەی مایەسیرییە[1212]

**.464** (سَکِرَ) سەرخۆشبوو[1213]، (سَکْر) چاوگەکەی[1214]

(مُعْظَم)، (جُلّ)، (أَکثر)، وەك (أغْلب) زۆربەی[1215]

---

بەدڵسۆزییەوە خۆی لەبۆ کارەکە ئامادەکرد.

[1211] بەمانای منداڵ (ی خوار تەمەن دوو ساڵ، شیرەخۆرە)و برای شیریش دێت.

تدل رؤية الرضيع في الحلم على الأخبار أو تدل على البداية الجديدة.

بینینی منداڵ (ی شیرەخۆرە) لەخەودا ئاماژەیە بۆ هەواڵ یان سەرەتایەکی نوێ.

هو رضيعي.

ئەو برای شیریمە.

[1212] جمع بَواسير.

إن الحلم بالبواسير وإجراء عملية جراحية هو مؤشر على مشكلة كبيرة يعاني منها صاحب الرؤية خلال تلك الفترة.

بینینی خەو بە مایەسیری و ئەنجامدانی نەشتەرگەری، ئاماژەیە بۆ کێشەیەکی گەورە کە خەوبینەکە لەو ماوەیەدا پێوەی دەناڵێنێت.

[1213] سكِرَ، يَسكَر، سَكْرًا وسُكْرًا، فهو سَكْران وسَكِر.

شرب الخمرَ حتى سِكر.

شەرابی خواردەوە تا سەرخۆش بوو.

[1214] واتە (سَکْر) چاوگی کاری (سَکِرَ)یە.

السكرد يقلل قيمة الإنسان.

سەرخۆشبون بەهای مرۆڤ کەمدەکاتەوە.

[1215] هەر چواریان بەمانای (زۆربەی) دێن.

ضاع مُعْظَمُ ماله.

زۆربەی سامانەکەی فەوتا.

باع الفلاحُ جُلَّ نتاجه.

جوتیارەکە زۆربەی بەرهەمەکەی فرۆشت.

{وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ}

بەڵام بێگومان زۆربەی خەڵك نازانن.

أغلبُ الناس هنا فقراء.

زۆربەی خەڵکی ئێرە هەژارن.

أغلب أحلامنا حقوق في بلاد أخرى.

زۆربەی خەونەکانمان لەوڵاتانی تردا مافن نەك خەون.

**.465** (خَلَقَ) دروستکرد، هەروەها هەڵبەست[1216]

(سَدَّ)و (سكَّرَ)و (غلَقَ) داخست[1217]

**.466** (عَرِقَ) مانای عارەقیکردۆ[1218]

(كُفوف) لەپی دەست، بەڵام تاك نا، كۆ[1219]

**.467** (مُنَظَّمة)، (تَنظيمْ)، هەردوو ڕێکخراو[1220]

---

[1216] خلَقَ يَخلُق ، خَلْقًا ، فهو خالِق و خُلُوقٌ، والمفعول مَخْلوق

خَلَقَ اللهُ الإنْسَانَ.

خودا مرۆڤی دروستکرد.

خلَق الكلامَ لزوجته.

قسەی بۆ ژنەکەی هەڵبەست.

[1217] هەرسێکیان بەمانای (داخست) دێن.

سدَّ الباب بقوة.

دەرگاکەی بەتوندی داخست.

سكَّر النافذة خوفاً من الرياح.

پەنجەرەکەی لەترسی با داخست.

غلَق الدولابَ.

دۆلابەکەی داخست.

[1218] عرِقَ يَعرَق ، عَرَقًا ، فهو عَرْقان.

عرەقیکردۆ= عارەقیکردەوە.

كان الجوُّ حارًّا فعَرِق.

کەشوهەوا گەرم بوو، بۆیە عارەقیکردەوە.

[1219] هەروەها بە (أكُف)یش کۆدەکرێتەوە.

انبساط الكفِّ في المنام شيء محمود.

کردنەوەی لەپی دەست لەخەودا شتێکی باشە.

[1220]هەردوکیان بەمانای ڕێکخراو دێن.

منظَّمة الأمم المتحدة مؤسسة دولية كبيرة.

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتی گەورەیە.

الحزب تنظيم سياسي وله أهداف متنوعة.

حزب ڕێکخراوێکی سیاسییەو چەندین ئامانجی جۆراوجۆری هەیە.

(اِسم) واتە ناو[1221]، (لَقَبْ)یش نازناو[1222]

**468.** (ساءَ)، (رَدُؤَ) هەردوو خراپبوو[1223]

(نحُلَ) (هزَلَ)، (ضعُفَ) لاوازبوو[1224]

**469.** (مُلْحِد) بێباوەڕ[1225]، (مُؤمِن) باوەڕدار[1226]

(دُبّ) مانای ورچە[1227]، (ضَبْع) بنقۆڵ، کەمتیار[1228]

---

[1221] جمع أسماء، جمع الجمع أساميٌّ وأسامٍ.

في الجملة (مات الرجل)، كلمة (الرجل) اسم.

لەڕستەی (پیاوەکە مرد)، وشەی (پیاوەکە) ناوە.

[1222] جمع ألقاب

لقبُ عمر بن الخطاب الفاروقُ.

نازناوی عومەری کوڕی خەتاب فاروقە.

[1223] ساءت أحوالُه.

بارودۆخی خراپبوو.

رَدُؤ الطَّقسُ.

کەشوهەوا خراپبوو.

[1224] نَحُلتِ الفتاةُ بعد الزواج.

کچەکە پاش هاوسەرگری لاوازبوو.

قلَّت المراعي فهزَلت الأبقار.

لەوەڕگاکان کەمیانکردووە، بۆیە مانگاکان لاوازبوون.

ضعُف الرَّجلُ بسبب المرض.

پیاوەکە بەهۆی نەخۆشییەکەوە لاوازبوو.

[1225]جمع مُلحدون ومَلاحِدة، مؤ مُلْحِدَة، جمع مؤ مُلْحِدات ومَلاحِدة.

مەخسەوی شەریفم لەوشەی بێباوەڕ لێرەدا: کەسێك کە باوەڕی نە بەخودا هەیە نە بە هیچ ئایینێکی ئاسمانی.

لا أحبّ الجدال مع الملحدين.

حەزم لەمشتومڕ نیە لەگەڵ بێباوەڕ.

[1226]المؤمن أخ المؤمن، لا يظلمه.

باوەڕدار برای باوەڕدارە، ستەمی لێناکات.

[1227]جمع دِباب ودِبَبَة، مؤ دُبَّة، جمع مؤ دُبَّات ودُبَب.

هل تستطيع مواجهة الدُّبّ؟

**.470** (فَظّ) ماناى رەقه، كۆى (أَفظاظ)، (فِظاظ)[1229]

(ناحِل)، (مُعَرَّق) هەردوكيان لاواز[1230]

**.471** (مَئُونة) چيه؟ واته ئازوقه[1231]

(بَرْق) بروسكه، كۆكەى (بُروق)ه[1232]

**.472** (اِجترَّ)، (أعادَ) دوبارەكردۆ[1233]

---

دەتوانيت روبەڕوى ورچ ببيتەوه؟

[1228] جمع أَضبُع وضِباع وضُبْع وضُبُع.

حمل الكتاب في ضبعه.

پەڕتوكەكەى لەبنقۆڵيدا هەڵگرت.

الضبع أكبر من الكلب وأقوى منه.

كەمتيار لەسەگ گەورەترو بەهێزتره.

[1229] كان فَظًّا مع زوجه.

لەگەڵ ژنەكەيدا رەق بوو.

[1230] كان ابن مسعود رجلاً رجلاً ناحلاً.

ئيبن مەسعود پياوێكى لاواز بوو.

المُعَرَّق لا يستطيع حمل الأشياء الثقيلة.

لاواز ناتوانێت شتى قورس هەڵبگرێت.

[1231] جمع مَئُونات ومُؤَن

أعطاه مئونة من الحبوب تكفيه شهرًا.

ئازوقەى دانەوێڵەى بەشى مانگێك پێدا.

[1232] لَمَع البَرْق قبيل سقوط الأمطار.

پێش بارانبارينەكە بروسكەكە درەوشايەوه.

[1233] اجترَّ يجتَرّ ، اجْتَرِرْ / اجْتَرَّ ، اجترارًا ، فهو مُجْتَرّ ، والمفعول مُجتَرّ.

أعادَ يُعيد ، أَعِدْ ، إعادةً ، فهو مُعيد ، والمفعول مُعاد.

اجترَّ الكلامَ مراراً.

چەندين جار قسەكەى دوبارەكردەوه.

أعاد السؤال لمدرسه.

دوبارەكردۆ= دوبارەكردەوه.

پرسيارەكەى بۆ مامۆستاكەى دوبارەكردەوه.

(هوانِم) خاتون، بەڵام تاك نا، كۆ[1234]

**.473** (اِجترَّ) چيە؟ كاوێژيكرد[1235]

(أَرْغَمَ)، (أَجْبَرَ)، (جبَرَ) ناچاركرد[1236]

**.474** (زَوْبَعَة)و (إعصار) گێژەڵوكە[1237]

(دُون)، (دَنِيء)، (حَقير)، وەك (وَضيع) سوكە[1238]

---

1234 تاكەكەی (هانِم)ە.

لهوانم القصر صلاحيات كثيرة.

خاتونەكانی كۆشك دەسەڵاتی زۆريان هەيە.

1235 اجترَّ يجتَرّ، اجْتَرِرْ / اجْتَرَّ ، اجترارًا ، فهو مُجْتَرّ ، والمفعول مُجتَرّ

اجترَّ البعيرُ.

حوشترەكە كاوێژيكرد.

1236 أرغمه على الاستسلام.

ناچاريكرد خۆی رادەستبكات.

أجبره على الموافقة.

ناچاريكرد رازی ببێت.

لم يستجب إلى طلب أمِّه فجبره أبوه عليه.

وەڵامی داواكارييەكەی دايكی نەدايەوە، بۆيە باوكی ناچاريكرد كە بيكات.

أن تحبني أنت مخير، أن تحترمني أنت مجبر لا مخير. محمد علي كلاي

ئازادی لەوەی خۆشتدەوێم يان نا، بەڵام ناچاريت رێزم بگريت!

1237 جمع زَوْبَعَة: زَوْبَعات وزَوابِعُ

جمع إعصار: أعاصرُ وأعاصيرُ.

اقتلعت الزَّوْبَعة الأشجار من أصولها.

گێژەڵوكەكە درەختەكانی لەبنەڕەتەوە هەڵكێشا.

إعصار شديد هزّ المنطقة.

گێژەڵوكەيەكی توند ناوچەكەی هەژاند.

1238 هەرچواريان بەمانای سوك دێن. سوك بەمانای خوێری و هيچ و پوچ، حاشا حازری!!!

جمع دنیء: أدْناء وأَدْنِياء ودُنئاءُ ودنيئون (للعاقل)، مؤ دنيئة، جمع مؤ دنيئات (للعاقل) ودَنايا.

جمع حقير: حِقار وحُقَراء

جمع وضيع: وُضعاء

**475.** (حفَّ)و (قصَّرَ) کورتکردەوە[1239]

(مِن کَثَبْ) واتە لەنزیکەوە[1240]

**476.** (سیَّبَ)، (ترَكَ) وازیلێهێنا[1241]

(کَمِهَ) کوێربوو[1242]، (أكْمَه) نابینا[1243]

---

زوجها رجل دون، طلب العلاقة من نساء کثیرات.

مێردەکەی پیاوێکی سوکە، داوای پەیوەندی لەزۆر ژن کردووە.

لا تصاحب الأدناء.

هاوڕێیەتی سوکەکان مەکە.

لا تطلب المساعدة من الرجل الحقیر.

داوای یارمەتی لەپیاوی سوك مەکە.

الانسان الوضیع لیست له قیمة داخل المجتمع.

مرۆڤی سوك لەناو کۆمەڵگادا نرخی نیە.

[1239] حفَّ شاربَه قبیل حفلة الزفاف.

ماوەیەکی کەم پێش ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکە، سمێڵی کورتکردەوە.

الحدیث الحلو یقصِّرالليالي.

قسەی شیرین شەوگار کورتدەکاتەوە.

[1240]فحص مادّةَ السِّلعة من کَثَب.

ماددەی کاڵاکەی لەنزیکەوە پشکنی.

[1241] هەردوکیان بەمانای (وازیلێهێنا) دێن.

فتح الولدُ القفصَ وسیّب الطَّائرَ.

منداڵەکە قەفەزەکەی کردەوەو وازی لەباڵندەکە هێنا.

ترَك عملَه القدیم وبحث عن عمل آخر.

کارە کۆنەکەی وازلێهێناو گەڕا بەدوای کارێکی تردا.

[1242] کمِهَ یَکمَه ، کَمَهًا ، فهو أكمَهُ

کمِهَ زوجها في الحادثة.

مێردەکەی لەڕوداوەکەدا کوێربوو.

[1243] جمع کُمْه، مؤ کَمْهاءُ، جمع مؤ کَمْهاوات وکُمْه.

زیاتر بەمانای نابینایەك دێت کە لەزگماکەوە نابینا بوبێت.

الرجل الأکمه أذکی من نظیره البصیر.

پیاوی نابینا لەهاوتا چاوساخەکەی زیرەکترە.

**.477** (رَصَدَ) تۆماركرد، هەم چاودێریكرد[1244]

(زَلَمَ) هەڵەیكرد، وەك (مَلأَ) پڕكرد[1245]

**.478** (مُمرِّض) چیە؟ واتە پەرستار[1246]

(وَجَعْ) و (أَلَمْ)، هەم (رَدْح) ئازار[1247]

**.479** (أَشَدَّ) چیە؟ واتە باڵقبوو[1248]

---

[1244]رصَدَ يَرصُد ، رَصْدًا ورَصَدًا ، فهو راصد ، والمفعول مَرْصود.

رصَد الكاتب الأحداثَ بدقّة.

نوسەر روداوەكانی بەوردی تۆماركرد.

رصَد الجاسوس العَدُوَّ لمدّة طويلة.

سیخوڕەكە بۆ ماوەیەكی زۆر چاودێری دوژمنی كرد.

[1245] واتە وشەی (زَلَمَ) بەمانای هەڵیكرد دێت، سەرباری ئەوەش موردایفی وشەی (مَلأَ)یە كە بەمانای پڕكرد دێت.

زَلَمَ التِّلْميذُ.

قوتابییەكە هەڵەیكرد.

زَلَمَ الإناءَ الماء.

دەفرەكەی پڕكرد لەئاو.

العدو مَلأَ المنطقة الخوف و الرّعب.

دوژمن ناوچەكەی پڕكرد لەترس و تۆقین.

[1246]زوجها ممرِّض ماهِر.

مێردەكەی پەرستارێكی لێهاتووە.

[1247](وَجَعْ) بەمانای ئازار دێت بەگشتی، (أَلَمْ) بەمانای ئازارێك دێت كە توند بێت. (رَدْح)یش بەمانای ئازارێك دێت كە سوك بێت.

وَجَع الأسنان مزعج جداً.

ئازاری ددان زۆر بێزاركەرە.

هل عانيت من أَلَم الولادة؟

ئایا ئازاری منداڵبونت چەشتووە؟

لا تخف من ردح المرض.

لەئازاری نەخۆشییەكە مەترسە.

[1248] أشدَّ يُشدّ ، أشْدِدْ / أشِدَّ ، إشدادًا ، فهو مُشِدّ

أشدَّ الصبيّ.

منداڵەكە باڵقبوو.

(راحَ وَجاءَ) ماناى دودڵبوو[1249]

**480.** (حَريم) پيرۆزە، كۆكەى (أحْرام)ە[1250]

جڕوجانەوەر ماناكەى (هامَّة)[1251]

**481.** (رُتْبة) پلەيە[1252]، (رَتيب) پلەدار[1253]

(عائِل) خێزاندار، هەروەها هەژار[1254]

**482.** (حاشَ) واتە گرت[1255]، (حَوْش)و (مَسْك) گرتن[1256]

---

1249 راح وجاء ولم يجب إجابة واضحة.

دودڵبوو و وەڵامێكى رونى نەدايەوە.

1250 هەروەها بە (حرائم) و (حُرُم)يش كۆدەكرێتەوە.

المسجد حريم، فلا تتحدث فيه بغير ما أحلّه الله.

مزگەوت پيرۆزە، هيچ قسەيەكى تێدا مەكە جگە لەوەى خودا حەڵاڵى كردووە.

1251 جمع هَوامّ.

رشَشْتُ دواءً قاتلاً لهوامّ البيت.

دەرمانى بكوژى جڕوجانەوەرى ماڵم، رشت.

1252 جمع رُتُبات ورُتْبات ورُتَب

ما هي رُتبتك في الجيش؟

پلەت لەسوپادا چيە؟

1253 شقيقى جُنْدِيٌّ رَتِيبٌ.

براكەم سەربازێكى پلەدارە.

1254 الجمع : عَالَةٌ ، عُيَّلٌ ، عَيْلَى ، عَائِلاَتٌ

شقيقي الصغير رَجُلٌ عَائِلٌ.

برابچوكەكەم پياوێكى خێزاندارە. خێزاندار بەماناى هەبونى منداڵى زۆر.

إنّه رجل عائل صبور.

بەڕاستى پياوێكى هەژارى ئارامگرە.

1255 حاشَ يَحُوش ، حُشْ ، حَوْشًا ، فهو حائش ، والمفعول مَحوش

حاش اللِّصَّ.

دزەكەى گرت.

1256 (حَوْش) چاوگى (حاشَ)يە.

حَوْش السارق في البيت ظاهرة.

(سابَ) پشتگوێخست[1257]، (سَیْب) پشتگوێخستن[1258]

**483.** (ذبَّ)و(طرَدَ)و (أَخْرَجَ) دەرکرد[1259]

(راحَ) (اِشتمَّ)، هەم (شَمَّ) بۆنکرد[1260]

**484.** (عَتَمَ)، (أَظْلَمَ) ماناى تاریکبوو[1261]

(عَطِبَ)، (فسُدَ)، (تَلِفَ) خراپبوو[1262]

---

گرتنی دز لەماڵدا دیاردەیە.

مسك المجرمين من قبل الشرطة عمل هيّن.

گرتنی تاوانباران لەلایەن پۆلیسەوە کارێکی ئاسانە.

1257 سابَ يَسيب ، سِبْ ، سَيْبًا وسَيَبانًا ، فهو سائب ، والمفعول مَسيب

ساب صديقَه بعد الحادثة.

پاش رووداوەکە هاوڕێکەی پشتگوێخست.

1258 چاوگی (سابَ)یە.

سيب الصديق في الشدائد عمل غير إنساني.

پشتگوێخستنی هاوڕێ لەتەنگانەدا کارێکی نامرۆڤانەیە.

1259 ذبَّ البائعُ الذبابَ عن الحلوى.

فرۆشیارەکە مێشەکانی لەسەر شیرینییەکە دەرکرد.

طرَد العدُوَّ من البلاد.

دوژمنی لەوڵات دەرکرد.

أخرج بطاقتَه من جيبه.

ناسنامەکەی لەگیرفانی دەرکرد. واتە هێنایەدەرەوە.

1260 من أعان على مؤمن أو قتل مؤمنًا لم يرِح رائحة الجنَّة.

هەرکەسێك یارمەتی کەسێك بدات لەدژی بڕوادارێك یان بڕوادارێك بکوژێت، ئەوە بۆنی بەهەشت ناکات.

اشتمَّ العِطر.

بۆنی عەترەکەی کرد.

شمَّ الوَرد.

بۆنی گوڵەکەی کرد.

1261 عتَم اللَّيلُ.

شەو تاریکبوو.

أظلم المَكان فخاف الأطفال.

شوێنەکە تاریکبوو، بۆیە منداڵەکان ترسان.

**485.** (شَدّ) بەستنەوەیە[1263]، (شَدَّ)ش بەستەوە[1264]

(راقَ) هەم (صفَا) مانای رونبووەوە[1265]

**486.** (أَدِيم)و (جِلْد) پێست، كۆی (جِلْد)، (أَجلاد)ە[1266]

(مُعقَّد) ئاڵۆز[1267]، (بَسيط)ە سادە[1268]

---

[1262] عَطِبَتِ الفَاكِهَةُ.

میوەكە خراپبوو.

فسُدَ الطَّعامُ، فلم يأكله أحد.

خواردنەكە خراپبوو بۆیە كەس نەیخوارد.

تتلف كميّات كبيرة من الفواكه أثناء نقلها.

بڕێكی زۆر میوە لەكاتی گواستنەوەیدا خراپدەبێت.

[1263] چاوگی (شدّ)یە.

شدّ الأسير بالشجرة عمل غير إنساني.

بەستنەوەی دیل درەختەوە كارێكی نامرۆڤانەیە.

[1264] شدَّ شَدَدْتُ، يَشُدّ، اشْدُدْ/ شُدّ ، شَدًّا ، فهو شادّ ، والمفعول مَشْدود.

شدَّ طفله المزعج.

منداڵە بێزاركەرەكەی بەستەوە.

[1265] راق الشَّرابُ.

خواردنەوەكە رونبووەوە.

صفا الماءُ بعد ساعة من إخراجه من البئر.

پاش كاژێرێك لەدەرهێنانی لەبیرەكە، ئاوەكە رونبووەوە.

[1266](جِلْد) بە (جُلود)یش كۆدەكرێتەوە.

أَدِيم الكلب خشن.

پێستی سەگەكە زبرە.

الجلد يحمي الجسم من المؤثرات الخارجية.

پێست جەستە لەكارتێكەرە دەرەكییەكان دەپارێزێت.

[1267]سؤالك مُعقّد، هل تستطيع تسهيله؟

پرسیارەكەت ئاڵۆزە، دەتوانیت ئاسانی بكەیت؟

[1268]جمع بسيطون وبسطاء وبُسُط (لغير العاقل)، مؤ بسيطة، جمع مؤ بسيطات وبَسائِطُ.

الكتاب بسيط و يفهمه الجميع.

پەڕتوكەكە سادەیەو هەموان لێی تێدەگەن.

**.487** (اِنبَسَطَ) ماناى بڵاوبويەوە[1269]

(ضَمَّ) (يەكخست)ە، لەگەڵ دورييەوە[1270]

**.488** (برَكَ)، (واظَبَ) بەردەوامبوو[1271]

(اِنبَسَطَ)، (سُرَّ) هەردوو خۆشحاڵبوو[1272]

**.489** (نحِلَ) لاوازبوو[1273]، (نُحول) لاوازبون[1274]

(عارِض) كۆسپ، لاجان، كۆكەى (عارِضون)[1275]

---

[1269] انبسط الشُّعاعُ.

تيشكەكە بڵاوبويەوە.

[1270] ضَمَّ ضَمَمْتُ ، يَضُمّ ، اضْمُمْ / ضُمَّ ، ضَمًّا ، فهو ضامّ ، والمفعول مَضْموم وضمي.

ضمَّ صُفوفَ الحزب مرة أخرى.

جارێكى تر ريزەكانى حزبەكەى يەكخستەوە.

ضمَّ القمحَ.

گەنمەكەى دورييەوە.

[1271] برَك على العمل لمدة خمس سنوات.

بۆ ماوەى پێنج ساڵ لەسەر كارەكە بەردەوامبوو.

واظب الشَّابُّ على رياضته المفضَّلة.

گەنجەكە لەسەر وەرزشە دڵخوازەكەى بەردەوامبوو.

[1272] انبسط بنجاح ولده.

بە سەركەوتنى كوڕەكەى خۆشحاڵبوو.

سُرَّ بزيارة صديقه.

بە سەردانى هاوڕێكەى خۆشحاڵبوو.

[1273] نحِلَ ينحَل ، نُحولاً ، فهو ناحِل

نحِل الرجل بعد إصابته بالسرطان.

پاش توشبونى بە شێرپەنجە، پياوەكە لاوازبوو.

[1274] للنحول أسباب عديدة.

لاوازبون چەندين هۆكارى هەيە.

[1275] بە (عَوارض)يش كۆدەكرێتەوە.

لاجان= لاجانگ.

حدث له عارِضٌ منعه من الحضور.

**.490** (رَوَاح) ئێوارە، هەم بۆنکردنە[1276]

(فَشْر)وەك (كَذِبْ) درۆکردنە[1277]

**.491** (زاندان) بەمانای بازوو و باسکە[1278]

(سمكُ التُّرْس)ە ماسییەپانکە[1279]

**.492** (قَدَحَ)، (طَعَنَ) تانەیلێدا[1280]

(سابَّ) هەم (سَبَّ) جونیپێدا[1281]

---

توشی کۆسپێك بوو کە نەیهێشت ئامادەبێت.

تستطيع تخمين عمره عن طريق عارضيه.

لەڕێگەی لاجانگەکانییەوە دەتوانیت تەمەنی بخەملێنیت.

[1276] لەمانای دووەمیاندا چاوگی (راحَ)یە.

رواح اليوم غير حارّ.

ئێوارەی ئەمڕۆ گەرم نیە.

رواح الورود ألذّ من قفطها.

بۆنکردنی گوڵ لەچنینی بەچێژترە.

[1277] الفشر حرام.

درۆکردن حەرامە.

الكذب ذنب كبير.

درۆکردن گوناهێکی گەورەیە.

[1278] اعتمد على زانديك.

پشت بە باسك و بازوی خۆت ببەستە.

[1279] ماسییەپانکە: جۆرە ماسییەکی گەورەیە.

سمكُ التُّرْس لذيذ ولكنه غالِ.

ماسییە پانکە بەچێژە بەڵام گرانە.

[1280] قدَحَ يَقدَح قَدْحًا، فهو قادح، والمفعول مَقْدوح.

طعَنَ يَطعَن ويطعُن، طَعْنًا وطَعَنَانًا، فهو طاعِن، والمفعول مطعون وطعين.

قَدَحَ فِي عِرْضِ عدوه.

تانەیدا لەئابڕوی دوژمنەکەی.

قدحت المعارضة في نتائج الانتخابات.

ئۆپۆزسیۆن تانەیدا لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان.

**493.** (مُجَلَّد) بەرگە، هەروەها پەڕتوك[1282]

(شَرْشَرَة) داسە، بەڵام هی بچوك[1283]

**494.** (كَهرَبَ) چیە؟ كارەبای لێدا[1284]

(سدَحَ) مانای دای بەزەویدا[1285]

**495.** (حُمَيْراء) چیە؟ تای پەتاییە[1286]

(اِرتعشَ)یە مانای (لەرزی)یە[1287]

---

[1281] سابَّ زميلَه في الشركة.

جوێنیدا بە هاوكارەكەی لەكۆمپانیا.

انتقده ولكن لا تسبّه.

رەخنەی لێبگرە، بەڵام جوێنی پێمەدە.

[1282] جمع مُجلّدات.

بەرگ بەمانای بەشی كتێب.

صدر المعجم في ثلاثة مجلَّدات.

فەرهەنگەكە لەچوارچێوەی سێ بەرگدا دەرچوو.

له مُجلّدات عديدة حول السرطان.

چەندین كتێبی هەیە سەبارەت بە شێرپەنجە.

[1283] بەمانای داسی بچوك دێت.

حصد الفلاحُ واحته الصغيرة بالشّرشرة.

جوتیارەكە مێرگە بچوكەكەی بە داسە بچوكەكە دورییەوە.

[1284] كهربَ يكهرب ، كَهْرَبَةً ، فهو مُكهرِب ، والمفعول مُكهرَب

كهرب الجهازَ.

كارەبایدا لەئامێرەكە.

[1285] سدَحَ سدْحًا

سدح منافسه خلال أقل من دقيقة.

لەماوەی كەمتر لەخولەكێكدا ركەبەرەكەی دا بەزەویدا.

[1286] تای پەتایی: جۆرە نەخۆشییەكی گوازراوەیە.

أصاب الطفل بالحُمَيْراء، فلا تقترب منه.

منداڵەكە توشی تای پەتایی بووە، بۆیە لێی نزیك مەبەرەوە.

[1287] ارتعش الجبان.

**.496** (هوَّشَ) واته ئاژاوەی نایۆ[1288]

(مَبارِم) تەشی، بەڵام تاك نا، كۆ[1289]

**.497** (ركِبَ) سواربوو[1290]، (رُكوب)یش سواربون[1291]

(عارِض) كاتییە، كۆكەی (عارِضون)[1292]

**.498** (رُكوب) ئەنجامدان[1293]، (ركِبَ) ئەنجامدا[1294]

(راقَ)و (اِنصبَّ)و (اِنسَكبَ) رژا[1295]

---

ترسنۆكەكە لەرزی.

1288 ئاژاوەی نایۆ= ئاژاوەی نایەوە.

لا تهوِّش بین المؤمن وأخیه.

ئاژاوە لەنێوان بڕوادارو براكەیدا مەنێرەوە.

1289 تاكەكەی (مِبْرَم)ە.

اشترت مِبرمًا لغزل الصوف.

تەشییەكی كڕی بۆ رستنی خوری.

1290 كِبَ یَركَب ، رُكوبًا ، فهو راكب ، والمفعول مَرْكوب.

ركِب الدابةَ بسرعة.

بەخێرایی سوار وڵاخەكە بوو.

1291 چاوگی (ركِبَ)یە.

ركوب القطار عمل غیر متعب.

سواربونی شەمەندۆفێر كارێكی ماندوكەر نیە.

1292 الحُبّ العارض لا یؤدي الی الزواج.

خۆشەویستیی كاتی نابێتەهۆی هاوسەرگیری.

1293 چاوگی (ركِبَ)یە.

ركوب الذنوب یقلل من هیبة الإنسان.

ئەنجامدانی گوناهـ شكۆی مرۆڤ كەمدەكاتەوە.

1294 ركِبَ یَركَب ، رُكوبًا ، فهو راكب ، والمفعول مَرْكوب.

ركِب الذَّنْبَ ثم ندم.

گوناهەكەی ئەنجامدا، پاشان پەشیمانبووەوە.

1295 راق الماءُ.

ئاوەكە رژا.

**499.** (رَكْب) چیه؟ لەئەژنۆدان[1296]

(مُسابَّة)و (سِباب)، (سَبّ)، (شَتْم) جوێندان[1297]

**500.** (ركَبَ) چیه؟ لێیدا بە ئەژنۆ[1298]

(تُروس)، (تِرَسة) قەڵغان، بەڵام كۆ[1299]

---

انصبَّ النهرُ في البحر.

روبارەكە رژایە ناو دەریاكەوە.

انسكب اللبنُ.

شیرەكە رژا.

1296 چاوگی (ركَبَ)یە. لەئەژنۆدان: لێدان لەئەژنۆ.

ركب الطفل من قبل والده جريمة كبيرة.

لەئەژنۆدانی منداڵ لەلایەن باوكییەوە تاوانێكی گەورەیە.

1297 هەرچواریان چاوگن و بەمانای جوێندان دێن.

المُسابَّة عمل غير أخلاقي.

جوێندان كارێكی نائەخلاقییە.

سبابُ الْمُسْلِمِ ذنب كبير.

جوێندان بە موسڵمان گوناهێكی گەورەیە.

سَبّ الشيعة لرموز السنة عمل غير مبرّر.

جوێندانی شیعە بە سیمبولەكانی سوننە كارێكی بێبەهانەیە.

شتم الطالب الكسول غير مقبول.

جوێندان بە فێرخوازی تەممەڵ كارێكی قبوڵكراو نیە.

1298 ركَبَ يَركُب ، رَكْبًا ، فهو راكِب ، والمفعول مَرْكوب

لێیدا بە ئەژنۆ: بە ئەژنۆ لێیدا.

ركَب اللاّعبُ منافِسَه.

یاریزانەكە بە ئەژنۆ دای لەڕكەبەرەكەی.

1299 واتە هەردوكیان بەمانای قەڵغان دێن، بەڵام وشەكان كۆن نەك تاك. تاكەكەیان (تُرْس)ە.هەروەها بە (أتْراس) و(تِراس) و(تُرُس)یش كۆدەكرێتەوە.

كان والدي يصنع التروس للمجاهدين.

باوكم قەڵغانی بۆ خەباتكاران دروستدەكرد.

الترسة مستعدة لتوزيعها على المقاتلين.

قەڵغانەكان ئامادەن بۆ دابەشكردن بەسەر جەنگاوەراندا.

**.501** (سَرِيرة) چيه؟ ماناى نهێنى[1300]

(شافَ) سەيركرد، هەروەها بينى[1301]

**.502** (بالصُّدْفة) چيه؟ واته بەڕێكەوت[1302]

(تَرَاءى)، (ظهَرَ)، (أَوجَحَ) دەركەوت[1303]

**.503** (دَولة) وڵاته، جەمعەكەى (دُوَل)[1304]

(تُرْس السُلَحْفاة) قاپيلكى كيسەڵ[1305]

**.504** (صرَخَ) قيژاندى[1306]، (صُراخ) قيژاندن[1307]

---

[1300] جمع سَرائِر

إنّ الله مطّلع على سريرتك.

بێگومان خودا ئاگادارى نهێنييەكەته.

[1301] شافَ يَشُوف ، شُفْ ، شَوْفًا ، فهو شائف ، والمفعول مَشُوف.

بەماناى (سەيركردو بينى) دێت.

شافَ الحادثَ بنفسه.

خودى خۆى سەيرى روداوەكەى كردو بينى.

[1302] رأيتها بالصُّدْفة.

بەڕێكەوت بينيم.

[1303] تراءى لي أنّ مصلحتك في إكمال تعليمك.

بۆم دەركەوت كە بەرژەوەنديى تۆ لەتەواوكردنى خوێندنەكەتدايە.

ظهَر الغَضبُ على وجهه.

توڕەيى لەسەر دەموچاوى دەركەوت.

أَوْجَحَ الحصان من بعيد.

ئەسپەكە لەدورەوە دەركەوت.

[1304] العراق دَوْلَة مستقلّة.

عيراق وڵاتێكى سەربەخۆيە.

أي من هذه الدول تقع بين قطر والسعودية؟

كام لەم وڵاتانە دەكەوێتە نێوان قەتەرو سعوديەوە؟

(ئوردون، سوريا، بەحرەين، كوەيت) بەحرەين

[1305] تُرْس السلحفاة مادة صلبة.

قاپيلكى كيسەڵ ماددەيەكى رەقە.

(كسَرَ) شكاند[1308]، (كَسْر) شكاندن[1309]

**505.** (ضَمان) بيمەیە، جەمعی (ضَمانات)[1310]

(شَمعة) واتە مۆم، كۆی (شَمَعات)، (شَمْعات)[1311]

**506.** (مُعلِّم)، (مُدَرِّس) هەردوو مامۆستا[1312]

(راهِن)و (حالي)، (الآن)یش ئێستا[1313]

---

[1306] صرَخَ يَصرُخ ، صُراخًا وصَريخًا ، فهو صارخ وصريخ.

الفتاة إنسان يصرخ إذا رأى فأراً ويبتسم إذا رأى ذئباً!

كچ مرۆڤێكە كاتێك مشكێك دەبينێت دەقيژێنێت، كاتێكيش گورگێك دەبينێت زەردەخەنەدەكات!

[1307] چاوگی (صرَخَ)يە.

صُراخ الأب بوجه إبنه الرضيع عمل غير إنساني.

قيژاندنی باوك بەڕوی منداڵە شيرەخۆرەكەيدا كارێكی نامرۆڤانەيە.

[1308] كسَرَ يَكسِر ، كسْرًا ، فهو كاسِر ، والمفعول مَكْسور وكَسِير.

كسَرَ الطفل الزّجاجَ.

منداڵەكە شوشەكەی شكاند.

[1309] كسر القلب جرح لا يندمل بسهولة.

شكاندنی دڵ برينێكە بە ئاسانی سارێژنابێت.

[1310] بيمە= دەستەبەر.

تهتمّ الحكومة بتوسيع مظلّة الضَّمان الاجتماعيّ لتشمل كافَّة فئات الشّعب.

ميری گرنگيدەدات بە فراوانكردنی چەتری بيمەی كۆمەڵايەتی بۆ ئەوەی سەرجەم توێژەكانی گەل بگرێتەوە.

[1311] هەروەها بە (شَمْع)و(شُموع)يش كۆدەكرێتەوە.

أن تنير شمعةً خير من أن تلعن الظلامَ.

هەڵكردنی مۆمێك باشترە لە نەفرەتكردن لەتاريكی.

[1312] (مُعلِّم) بەمانای مامۆستای ئاستی خوار خوێندنی باڵا دێت، بەڵام (مُدَرِّس) بەرزترە.

المعلّم شخص يعلّم التلاميذ كيف يتجنبون المصاعب التي لولاها ما صار معلماً!

مامۆستا كەسێكە قوتابييان فێردەكات چۆن خۆيان لەو كۆسپانە لابدەن كە ئەگەر نەبونايە، ئەم نەدەبوو بە مامۆستا!

مُدَرِّس اللغة العربيّة يتكلّم بفصاحة.

مامۆستای زمانی عەرەبی بە زمانپاراوی قسەدەكات.

[1313] هەرسێكيان بەمانای ئێستا دێن.

الوضع الراهن صعب للموظفين.

**.507** (دولة) وڵاته، كۆی (دولات)، (دول)[1314]

(ترسُ السلحفاة) قاپلیكی كیسەڵ[1315]

**.508** (لَعب) وەك (لِعب) یاریكردنە[1316]

(نوّمَ) خەواند[1317]، (نومْ)یش خەوتنە[1318]

**.509** (مجتمع) چیە؟ واتە كۆمەڵگا[1319]

(مریض) نەخۆشە، جەمعەكەی (مرضی)[1320]

---

دۆخی ئێستا سەختە بۆ فەرمانبەران.

لا أستطیع شراء بیت جدید في الوضع الحالي.

لەم دۆخەی ئێستادا ناتوانمماڵێكی تازە بكڕم.

الآنَ قَدِ اكْتَمَلَ عدد الضیوف.

ئێستا ژمارەی میوانەكان تەواو بوو.

1314 العراق دَوْلَة مستقلَّة.

عیراق وڵاتێكی سەربەخۆیە.

1315 تُرْس السلحفاة مادة صلبة.

قاپیلكی كیسەڵ ماددەیەكی رەقە.

1316 چاوگی (لعِبَ)ن.

لا یتوقف الناس عن اللَعب لأنهم كبروا، بل یكبرون لأنهم توقفوا عن اللعب.

خەڵك لەبەرئەوە واز لەیاریكردن ناهێنن كە پیربون، بەڵكو پیربون لەبەرئەوەی وازیان لەیاریكردن هێنا. واتە هۆكاری وازهێنان لەیاریكردن پیربون نیە، بەڵكو هۆكاری پیربون وازهێنانە لەیاریكردن.

اللِعْب بالنار عمل خطیر.

یاریكردن بە ئاگر كارێكی مەترسیدارە.

1317 نوَّم السّاحرُ الفتاةَ.

جادوگەرەكە كچەكەی خەواند.

1318 چاوگی (نامَ)یە. خەوتن= نوستن.

من رأى في المنام أنه مات في نومه من غیر مرض ولا هیئة من یموت فإنه تطول حیاته.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی لەكاتی نوستندا مرد بەبێ بونی نەخۆشی یان شێوەی كەسێك كە دەمرێت، ئەوە ژیانی درێژدەبێت.

1319 مشكلة الآباء الأساسیة في مجتمعاتنا المعاصرة هي أنهم یریدون أن یكون أبناؤهم دائماً مدینون لهم.

كێشەی بنچینەیی باوكانی كۆمەڵگا هاوچەرخەكانمان ئەوەیە كە دەیانەوێت منداڵەكانیان هەمیشە قەرزارباریان بن.

من عادات وتقالید مجتمعنا انه عندما تكون فاسقاً یقولون اللهم اهدیه. وعندما یهدیك الله یقولون هذا كان اكبر فاسق.

**.510** (ابتسم) چيه؟ زەردەخەنەيكرد[1321]

(صدَّق بـ) باوەڕيپێكرد[1322]

**.511** (هل تعلم) چيه؟ ئايا دەزانى؟[1323]

(استطاع)يە بەماناى توانى[1324]

**.512** (سعادة) چيه؟ بەختەوەرى[1325]

(وجب) پێويستبوو، (وجوب) مەسدەرى[1326]

**.513** (بيّن) چيه؟ رونكردنەوە[1327]

---

خودايە هيدايەتى بدەيت، كاتێكيش خودا هيدايەتت دەدات، دەڵێن: ئەو كەسە پێشتر گەورەترين گوناهكار بوو!!!

[1320] من رأى أنه يعض أنامله في المنام فإن كان مريضاً مات.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بينى سەرپەنجەى خۆى دەگەزێت، ئەو كەسە ئەگەر نەخۆش بوو، ئەوە دەمرێت.

[1321] يوجد دائماً من هو أشقى منك، فابتسم.

هەميشە كەسێك هەيە كە لەتۆ بەدبەختترە، بۆيە زەردەخەنە بكە.

[1322] صدَّق بزوجته دون أي جدال.

بەبێ هيچ مشتومڕێك باوەڕى بە ژنەكەى كرد.

[1323] ئايا دەزانى؟= ئايا دەزانيت؟

هل تعلم أن عدد عظام الإنسان عند الولادة هو 270 عظمة؟

ئايا دەزانيت ژمارەى ئێسكەكانى مرۆڤ لەكاتى لەدايكبوندا 270 ئێسكن؟

هل تعلم أنه وفقًا لعلماء الفلك، يُعتقد أن عيد ميلادك يتزامن مع يوم ولادتك؟

ئايا دەزانيت كە بەگوێرەى زانايانى گەردوونناسى، لەو بڕوايەدان كە جەژنى لەدايكبونت رێكەوتى ئەو رۆژەيە كە تێيدا لەدايكبويت؟!

[1324] الإنسان يستطيع أن يعيش حوالي شهر بدون طعام، لكنه يستطيع أن يعيش أسبوعاً واحداً فقط دون ماء.

مرۆڤ دەتوانێت نزيكە مانگێك بەبێ خۆراك بژى، بەڵام تەنها بۆ ماوەى هەفتەيەك دەتوانێت بەبێ ئاو بژى.

[1325] للسعادة رافدان أزليان هما البساطة والطيبة.

بەختەوەرى دوو كۆڵەكەى هەميشەيى هەيە، ئەوانيش سادەيى و باشيين.

[1326] هەروەها (وَجْب)و (وَجْبة)و (وجِبَة)ش هەر مەسدەرى هەمان كارن. مەسدەر= (ع: مصدر)= چاوگ.

وجَبَ يَجِبُ.

واحدة من أول شروط السعادة، هي أن العلاقة بين الإنسان والطبيعة يجب أن لا تُكسر.

يەكێك لەمەرجە سەرەتاييەكانى بەختەوەرى بريتييە لەوەى كە پێويستە پەيوەنديى نێوان مرۆڤ و سروشت نەشكێنرێت.

[1327] بيَّن القائد أهمَّ أسباب الخلل في الجيش.

فەرماندەكە گرنگترين هۆكارەكانى كەموكورتييەكانى سوپاكەى رونكردەوە.

(أبعدَ)، (بعّدَ) دورخستەوە[1328]

**.514** (حفظ) پاراست، لەگەڵ لەبەرکرد[1329]

(قضى الصلاة) واتە نوێژیکرد[1330]

**.515** (كبرَ) گەورەبوو[1331]، (كبر) گەورەبون[1332]

(غرب) ئاوابوو[1333]، (غروب) ئاوابوون[1334]

**.516** (كرّر) ماناى دوبارەکردۆ[1335]

---

[1328] أبعدت الحكومةُ المعارِضين من السلطة.

حكومەت نەيارانى لەدەسەڵات دورخستەوە.

بعَّدَت الشرطة المواطنين عن مكان الحادث.

پۆليس هاوڵاتيانى لەشوێنى روداوەکە دورخستەوە.

[1329] حفِظَ يَحفَظ ، حِفْظًا ، فهو حافظ وحفيظ ، والمفعول مَحْفوظ.

من رأى في المنام الجرذ في بيته أو بيت غيره فليحفظ ذلك المنزل من اللصوص أو فليحذر ممن معه فإنه يتناول من متاعه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بينى جرج لەماڵەکەيدايە يان لەماڵێکى کەسێکى تردايە، ئەوە با ئەو ماڵە لەدز بپارێزێت يان وريای ئەو کەسە بێت کە لەگەڵيدايە چونکە لەکەرستەکانى دەبات.

من رأى في المنام كأنه بال على المصحف يحفظ ولد له القرآن.

کەسێك لەخەودا بينى ميزدەکات بە قورئاندا، ئەوە کوڕێکى خەوبينەکە قورئان لەبەردەکات.

[1330] قضَى الصَّلاةَ في وقتها.

نوێژەکەى لەکاتى خۆيدا کرد.

[1331] كبُر الطفل.

منداڵەکە گەورەبوو.

[1332] چاوگى (كبُرَ)يە.

الكِبَر في طريق كل طفل.

گەورەبوون لەسەر رێگاى هەموو منداڵێکدايە.

[1333] غرَبَ يَغرُب، غُرُوبًا، فهو غارِب.

غَرَبَتِ الشَّمْسُ.

خۆر ئاوابوو.

[1334] غروب الشمس مشهد جذاب.

ئاوابونى خۆر ديمەنێکى سەرنجڕاکێشە.

[1335] دوبارەکردۆ= دوبارەکردەوە.

(أسئلة) پرسیار، بەڵام تاك نا كۆ[1336]

**.517** (قاس) "پێوا"یە، (قیاس)ە پێوان[1337]

(وصّل)، (أوصل) هەردوكیان گەیان[1338]

**.518** (جسَّدَ) چیە؟ بەرجەستەكرد[1339]

(فارقَ الحیاة) دێت بەمانای مرد[1340]

**.519** (حرَزَ) پاراست[1341]، (حَرْز)یش پاراستن[1342]

---

كرَّر كلامە.

قسەكەی دوبارەكردەوە.

[1336] واتە ئەم وشەیە بەمانای پرسیار دێت، بەڵام تاك نیە، كۆیە. تاكەكەی (سُؤال)ە. هەروەها بە (سُؤالات)یش كۆدەكرێتەوە.

في أسئلة إمتحانات هذه السنة أخطاء عدیدة.

پرسارەكانی تاقیكردنەوەكانی ئەمساڵ چەندین هەڵەیان تێدایە.

[1337] قاسَ یَقِیس ، قِسْ ، قَیْسًا وقِیاسًا ، فهو قائِس ، والمفعول مَقِیس.

قاس القُماشَ بذراعه.

قوماشەكەی بە باڵی، پێوا.

قِیاس مساحة الوطن شيء صعب.

پێوانی روبەری نیشتمان شتێكی قورسە.

[1338] بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی ""گەیان"، وشەی "گەیاند"ە، بەڵام بۆ پارێزگاریكردن لەسەروای بەیتەكە "د"ەكەم لابردووە.

وصَّل الرِّسالةَ إلى صاحبها.

نامەكەی گەیاندە خاوەنەكەی.

أوْصَلَ الخبر الى أقرباءه.

هەواڵەكەی گەیاندە كەسوكارەكەی.

[1339] جسَّد مبادئَ الإسلام في حیاته الیومیّة.

بنەماكانی ئیسلامی لەژیانی رۆژانەیدا بەرجەستەكرد.

[1340] فارق الحیاةَ عقب الحادث.

پاش روداوەكە مرد.

[1341] حرَزَ یَحرُز ، حَرْزًا ، فهو حارِز ، والمفعول مَحْروز وحَرَز.

حرَزَ مالَه من اللصوص.

سامانەكەی لەدز پاراست.

(مُهِمّ)، (هامّ)و (ماسّ)، (مَفْصِليّ) گرن[1343]

**520.** (بِزَّة) جلوبەرگ[1344]، (بَدْلَة)، (بِذْلة) قات[1345]

(صُدْفة) ڕێکەوتە، کۆی (صُدُفات)، (صُدْفات)[1346]

**521.** (دعَمَ) چیە؟ پشتگیریکرد[1347]

(احتجزَ)یە مانای دەستگیرکرد[1348]

---

[1342] چاوگی (حرَزَ)یە.

حرز الدين واجب على كل مسلم.

پاراستنی ئاین ئەرکی هەموو موسڵمانێکە.

[1343] بێگومان مەبەستم لەوشەی (گرن) لێرەدا (گرنگ)ە، بەڵام لەبەر پاراستنی سەرەوای شیعرەکە پیتی (گ)ەکەم نەنوسیوە.

أريد أن أتكلم معك حول أَمْر مُهِمّ.

دەمەوێت سەبارەت بە کارێکی گرنگ قسەت لەگەڵدا بکەم.

إكمال الدراسة الجامعية هامّ جدًّا.

تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ زۆر گرنگە.

أجمعتنا حاجة ماسَّة.

پێویستییەکی گرنگ کۆیکردینەوە.

المفاوضات السّورية- الإسرائيلية محور مفصليّ في عملية السّلام.

دانوستانەکانی نێوان سوریاو ئیسرائیل تەوەرێکی گرنگن لەپرۆسەی ئاشتیدا.

[1344] يرتدي الشابّ البزّة العسكريّة.

گەنجەکە جلوبەرگی سەربازی لەبەردەکات

[1345] اشترى بَدْلَة جاهزة من السوق.

قاتێکی ئامادەی لەبازاڕ کڕی.

إذا حلمت أنك ارتديت بذلة من المطاط فهذا ينبئ بأنك ستنال الاحترام والتكريم نظراً لسمو أخلاقك وصفاء طبعك.

ئەگەر لەخەودا بینیت قاتێکی لاستیکیت لەبەرکرد ئەوە پێشبینی ئەوەیە کە ڕێزت لێدەنرێت بەهۆی بەرزیی ڕەوشت و پاکیی سروشتتەوە.

[1346] هەروەها بە (صُدَف)یش کۆدەکرێتەوە.

أجمل ما في الصدفة أنها خالية من الإنتظار.

جوانترین شتی ڕێکەوت ئەوەیە کە چاوەڕوانی تێدا نیە.

[1347] دعَمَ يَدعَم ، دَعْمًا ، فهو داعِم ، والمفعول مَدْعوم.

دعَم مرشَّح الحكومة في الانتخابات.

لەهەڵبژاردنەکەدا پشتگیریی کاندیدەکەی حکومەتی کرد.

522. (نِظام) رژێمە، کۆکەی (أَنْظِمَة)[1349]

(خَطّار) مەنجەنیق، وەك (رُمح)یش رمە[1350]

523. (ردَّدَ) مانای دوبارەکردۆ[1351]

(أقْرباء) خزم، بەڵام تاك نا کۆ[1352]

524. (أفحمَ) چیە؟ بیانوی بڕی[1353]

(صنَعَ) دروستکرد، (صَنیع) مەسدەری[1354]

---

1348 استمرّ احتجازُ الرَّهائن أكثرَ من سنة.

دەستگیرکردنی بارمتەکان زیاتر لەساڵێکی خایاند.

1349 هەروەها بە (نظم)یش کۆدەکرێتەوە.

كان نظام البعث وحشاً.

رژێمی بەعس دڕندە بوو.

1350 واتە وشەی (خطار) بەمانای مەنجەنیق دێت، هەروەها بەمانای رمیش دێت.

الخطار آلة حربية قديمة.

مەنجەنیق ئامێرێکی جەنگیی کۆنە.

هل تستطيع إستخدام الخطار؟

دەتوانیت رم بەکاربهێنیت؟

من رأى في المنام أنه يخرج من جسده دم من طعنة بِرُمْح فَإِنَّهُ يَصح جِسْمه وَيكثر مَاله وَإِن كَانَ مُسَافِرًا دلّ على سَلَامَته ورجوعه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی خوێن لەجەستەی دەڕوات لەئەنجامی لێدان بە رم، ئەو تەندروستیی باش دەبێت و سامانی زۆر دەبێت، ئەگەر ئەو کەسە لەگەشتدا بوو، ئەوە خەوەکەی ئاماژەیە بۆ سەلامەتی و گەڕانەوەی.

1351 دوبارەکردۆ= دوبارەکردنەوە: وتەوە.

ردَّدت الأمُّ دعاءَها لولدها.

دایکەکە نزایەکەی بۆ کوڕەکەی دوبارەکردەوە.

1352 تاکەکەی (قریب)ە.

أقرباءه عقارب.

خزمەکانی دوپشکن.

1353 أفحم خَصْمَه.

بیانوی نەیارەکەی بڕی.

1354 صنَع النَّجَّارُ منضدَةَ.

دارتاشەکە مێزێکی دروستکرد.

**.525** (رَعيل) "كۆمەڵ"ە، كۆكەی (أراعيل)[1355]

(غسَلَ) واتە شۆرد، چاوگەكەی (غَسيل)[1356]

**.526** (عَلامة) چيە؟ واتە نيشانە[1357]

(غُصْن) مانای لق، كۆكەی (أغصان)ە[1358]

**.527** (فؤاد)، (خِزَانَة)، (رَوع)و (جَنان) دڵ[1359]

(صَنْدَل) بەلەمە، هەروەها نەعل[1360]

---

1355 جاء رعيلٌ من الناس.

كۆمەڵێك خەڵك هاتن.

1356 اعتاد الطِّفلُ أن يغسِل يدَه قبل الطَّعام وبعده.

منداڵە وا راهات كە پێش و پاش خواردن دەستی بشوات.

1357 علامات الجهل موجودة فيك.

نيشانەكانی نەزانيت تێدايە.

"سوء الخلق من علاماتِ سوءِ العاقبةِ". ابن تيمية

بەدڕەوشتی يەكێكە لەنيشانەكانی عاقيبەتشەڕی.

ليس من علامات الصحة العقلية أن يتكيف المرء مع مجتمع مريض. - كريشنا مورتي.

خۆگونجاندن لەگەڵ كۆمەڵگەيەكی نەخۆش، يەكێك نيە لەنيشانەكانی تەندروستيی عەقڵ.

1358 قف العصفورُ على غصن الشّجرة.

چۆلەكەكە لەسەر لقی درەختەكە وەستا.

1359 فؤاد الأم رقيق.

دڵی دايك ناسكە.

خِزانَةُ الإنسان مليئة بالأسرار.

دڵی مرۆڤ پڕە لەنهێنی.

أنت في صميم روعي.

تۆ لەناخی دڵمدايت.

الجنان يعشق كل جميل.

دڵ عاشقی هەموو جوانێك دەبێت.

1360 عبر الصَّندلُ النَّهرَ.

بەلەمەكە روبارەكەی تێپەڕاند.

لبس الطّفل الصَّنْدلَ.

.528 (جُنَّ) "شێتبوو"ه[1361]، (جُنون)یش شێتبون[1362]

(غُرور) بەمانای لەخۆباییبون[1363]

.529 (حَضارة) چیە؟ شارستانێتی[1364]

(جاعَ) برسیبوو[1365]، (جُوع)یش برسێتی[1366]

.530 (عُمْق) واتە قوڵی[1367]، (عَمیق)یش قوڵە[1368]

پاڵەوانێتی مانای (بُطولة)[1369]

.531 (كَتَبَ) نوسی[1370]، (مَكتَب) نوسینگە[1371]

---

منداڵەکە نەعلەکەی لەپێکرد.

1361 جُنَّ بعد أن فقد زوجتَه وأطفالَه.

پاش ئەوەی ژن و منداڵەکانی لەدەستدا، شێتبوو.

1362 للجنون أسباب كثيرة.

شێتبون هۆکاری زۆرە.

1363 غُرور الشباب داء قاتل.

لەخۆباییبونی گەنجان دەردێکی کوشندەیە.

1364 بلغت الحضارة الإسلاميّة أَوْجَهَا في القرن الرابع الهجريّ.

لەسەدەی چوارەمی کۆچیدا شارستانێتیی ئیسلام گەیشتە لوتکە.

1365 نَحْنُ قَومٌ لاَ نَأْكُلُ حَتّى نَجُوعَ وَإِذَا أَكَلْنَا لاَ نَشْبَعُ.

ئێمە نەتەوەیەکین تا برسیمان نەبێت ناخۆین، کە خواردیشمان تێرناخۆین.

1366 الجوع عدو الإنسان.

برسێتی دوژمنی مرۆڤە.

1367 عُمْقُ البئر مخيف.

قوڵیی بیرەکە مەترسیدارە.

1368 البئر عميقة.

بیرەکە قوڵە.

1369 لم يشترك المنتخب العراقي في البطولة.

هەڵبژاردەی عیراق لەپاڵەوانێتییەکەدا بەشداری نەکرد.

1370 كتَب رسالةً الى أمه.

نامەیەکی بۆ دایکی نوسی.

1371 لمنقاشة المشكلة لابد أن أزور مكتب المدير.

(صدِئَ) ژەنگیکرد[1372]، (صَدَأ)یش ژەنگە[1373]

**.532** (عاشِق) دڵداره، کۆکەی (عُشَّاق)ە[1374]

(خُلُق) رەوشتە، جەمعی (أخلاق)ە[1375]

**.533** (مُفید) سودبەخشە، واتە بەسودە[1376]

(زَنْد) پەلەپیتکە، کۆکەی (أَزْنُد)ە[1377]

**.534** (جَمال) جوانییە[1378]، (جمُلَ) جوانبوو[1379]

(تجهَّمَ)یە مانای روگرژبوو[1380]

**.535** (ثَمَرَة) بەروبوم، جەمعەکەی (ثَمَر)[1381]

---

بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشەکە، پێویستە سەردانی نوسینگەی بەڕێوەبەر بکەم.

1372 صدِئ الحَدیدُ.

ئاسنەکە ژەنگیکرد.

1373 صدأ الحدید یؤدِّي إلی تآکله.

ژەنگی ئاسن دەبێتەهۆی خۆخواردنەوەی.

1374 العاشق مریض.

دڵدار نەخۆشە.

1375 حسّن أخلاقك.

رەوشتت جوان بکە.

1376 الکتاب مفید.

کتێب بەسودە.

1377 لا تلمس زَنْد البندقیَّة.

دەستمەدە لەپەلەپیتکی تفەنگەکە.

1378 إنَّ اللهَ جَمِیلٌ یُحِبُّ الْجَمَالَ.

بێگومان خودا جوانەو جوانییشی خۆشدەوێت.

الجمال سلاح خطیر!

جوانی چەکێکی مەترسیدارە!

1379 جمُلت المرأةُ بعد الزواج.

ژنەکە پاش هاوسەرگیری، جوانبوو.

1380 تجهَّم المدرس تجاه الطالب المشاغب.

مامۆستایەکە بەرامبەر فێرخوازە ئاژاوەگێڕەکە روگرژبوو.

(صَحابيّ) هاوەڵ، بەس هی پێغەمبەر[1382]

536. (زَرافة) چیه؟ واته زەڕافه[1383]

(نِصْف) مانای نیو، کۆکەی (أنصاف)ه[1384]

537. (مُغایِر) چیه؟ پێچەوانه[1385]

(تَضْحِیَة) مانای قوربانیدانه[1386]

538. (قارنَ) چیه؟ بەراوردکرد[1387]

(أعدمَ) هەژاربوو، لەگەڵ ئیعدامکرد[1388]

539. (أفشی) بەمانای بڵاوکردەوه[1389]

---

[1381] ثمرة شجرة التفاح لذيذة.

بەروبومی درەختی سێو بەچێژه.

[1382] بەمانای هاوەڵی پێغەمبەر، بەتایبەت پێغەمبەری ئیسلام (درودی خودای لەسەر بێت) دێت.

كان علي بن أبي طالب صَحَابِيّاً و صهر النبي.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب هاوەڵ و زاوای پێغەمبەر بوو.

[1383] الزَرافة حيوان كبير.

زەڕافه گیاندارێکی گەورەیه.

[1384] نصف رغيف خير من البقاء بلا خبز.

نیو کولێره باشتره لەمانەوه بەبێ نان.

[1385] أخلاقه مغايرة لأقواله.

ڕەوشتی پێچەوانەی قسەکانیەتی.

[1386] قدّم الشعبُ تضحيات كبيرة عديدة حتى نال استقلالَه.

گەل چەندین قوربانیدانی گەورەی پێشکەشکرد تاوەکو سەربەخۆیی بەدەستهێنا.

[1387] قارن الكاتب كتابه الجديد بكتابي.

نوسەر کتێبه نوێیەکەی به کتێبەکەی من بەراوردکرد.

[1388] ئیعدامکرد= لەسێدارەدا.

أعدَم التاجر من بعد غِنًى.

بازرگانەکه پاش دەوڵەمەندی هەژاربوو.

أعدمت الحكومة القاتلَ.

حکومەت بکوژەکەی لەسێدارەدا.

[1389] أفشى معلوماتٍ عديدة عن الحادث.

(زنَدَ النَّارَ) ئاگریکردەوە[1390]

**540.** (غَناء) چیە؟ دەوڵەمەندی[1391]

(صِلَة)و (عَلاقة) هەردوو پەیوەندی[1392]

**541.** (نبَحَ) وەڕی[1393]، (عوَی)یە لوراند[1394]

(فقَّعَ)و (فرقعَ) هەردوکیان تەقاند[1395]

**542.** (خالِص) پەتییە، جەمعەکەی (خُلَّص)[1396]

(دنِسَ) پیسبوو، چاوگەکەی (دَنَس)[1397]

---

چەندین زانیاریی لەسەر روداوەکە بڵاوکردەوە.

[1390] زنَدَ النَّارَ في الجبل.

لەشاخەکە ئاگریکردەوە.

[1391] البخيل من مات من فقره وعاش الناس بغناءه.

چروك كەسێك خۆی بەهۆی هەژارییەکەیەوە دەمرێت و خەڵك بەهۆی دەوڵەمەندییەکەیەوە دەژی.

[1392] توجد صلة كبيرة بين علم النَّفس والأخلاق.

پەیوەندییەکی گەورە لەنێوان دەرونزانی و رەوشتدا هەیە.

كان على علاقة طيِّبة معه.

پەیوەندییەکی باشی لەگەڵدا هەبوو.

[1393] نبَحَ ينبَح، نَبْحًا ونُباحًا ونِباحًا ونَبيحًا ونُبوحًا وتَنْباحًا ، فهو نابِح.

القافلة تسير والكلاب تنبح.

کاروان دەڕوات و سەگ دەوەڕێت.

[1394] عوَى يَعوِي ، اعْوِ ، عُواءً ، فهو عاوٍ.

عوى الذِّئب حتَّى الفجر.

گورگەکە تا بەرەبەیان لوراندی.

[1395] فقَّع أصابعَه.

پەنجەکانی تەقاند.

فرقع عجلة سيارة زميله.

تایەی ئۆتۆمبێلی هاوکارەکەی تەقاند.

[1396] القلادة مصنوعة من الذهب الخالص.

ملوانکەکە لەئاڵتونی پەتی دروستکراوە.

[1397] إذا المرءُ لم يَدْنَس من اللُّؤم عرضُ// فكلّ رداء يرتديه جميلُ.

543. (مُنتصِر) چیه؟ واته سەرکەوتوو[1398]

(تغلَّبَ)یە بەمانای زاڵبوو[1399]

544. (قائِد) فەرماندە، جەمعەکەی (قادة)[1400]

(جَوَاد) ماینە، کۆکەی (جِیاد)ە[1401]

545. (بَعوضة) چیه؟ واته مێشولە[1402]

(جُنْدَب)و (جُنْدُب)، (جَرَاد)یش کوللە[1403]

546. (اغتاب) چیه؟ غەیبەتیکرد[1404]

---

ئەگەر مرۆڤ ئابڕوی بە نامەردی پیس نەبێت، هەر جلوبەرگێك بپۆشێت، هەر جوانە.

[1398] أعظم المنتصر مَن انتصر على نفسه.

گەورەترین سەرکەوتوو ئەو کەسەیە بەسەر خۆیدا سەرکەوتووە.

[1399] الخوف من الموت غريزة حية لا معابة فيها.. وإنما العيب أن يتغلب هذا الخوف علينا ولا نتغلب عليه.

ترس لەمردن غەریزەیەکی زیندووەو عەیبی تێدا نیه، بەڵام عەیب ئەوەیە ئەم ترسە زاڵببێت بەسەرمانداو ئێمە زاڵ نەبین بەسەریدا.

[1400] هەروەها بە (قائدون)و (قُوَّاد)یش کۆدەکرێتەوە.

إذا اردت أن تكون قائداً فعليك أن تمثل دور الجندي.

ئەگەر ویستت ببیتە فەرماندە، پێویستە لەسەرت رۆڵی سەرباز ببینیت.

[1401] هەروەها بە (أجاويد)و (أجياد)یش کۆدەکرێتەوە. بەمانای ماینی چاك دێت نەك هەموو جۆرە ماینێك.

بكم اشتريت جوادك؟

ماینەکەت بەچەند کڕی.

[1402] إن البعوضة تُدْمي مُقْلَةَ الأسد!

مێشولە خوێن لەچاوی شێر دەهێنێت!

[1403] (جراد) بەمانای کوللە دێت بەگشتی، بەڵام (جُنْدَب)و (جُنْدُب) بەمانای جۆرێکی بچوك لەکوللە دێن نەك هەمویان.

الجُنْدَب حشرة نظيفة.

کوللە مێرویەکی پاکە.

هل أكلت لحم الجُنْدُب؟

ئایا گۆشتی کوللەت خواردووە؟

يوجد ما يزيد على 20,000 نوع من الجراد في العالم.

لەجیهاندا زیاتر لە بیست هەزار جۆر کوللە هەیە.

[1404] غەیبەتیکرد: عەیبەکانی بەبێ ئامادەبونی خۆی، باسکرد.

{وَلاَ يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا} .

(تجاوزَ)یە مانای تێپەڕکرد[1405]

**.547** (ثانیة) چرکەیە، کۆکەی (ثواني)[1406]

(حسُنَ) جوانبوو[1407]، (حُسْن)یش جوانی[1408]

**.548** (توقَّعَ) چیە؟ چاوەڕێکرد[1409]

(أحدثَ) داهێنا، هەم پیساییکرد[1410]

**.549** (انتهی) چیە؟ کۆتاییهات[1411]

(دَمْغَة) پەنجەمۆر، کۆی (دَمَغات)، (دَمْغات)[1412]

**.550** (تُرْس) واتە قەڵغان، کۆی (أتْراس)، (تِروس)[1413]

---

هەندێکتان غەیبەتی هەندێکتان نەکەن.

1405 تێپەڕکرد= تێپەڕاند

تجاوز سن الأربعين.

تەمەنی 40 ساڵی تێپەڕاند.

1406 انتظر ثانية واحدة.

یەك چرکە چاوەڕێبکە.

1407 حسنت الفتاة بعد الزواج.

کچەکە پاش هاوسەرگیری جوانبوو.

1408 حسن المرأة غير متعلق بأخلاقها.

جوانیی ژن وابەستە نیە بە رەوشتییەوە.

1409 توقّع حدوثَ الزلزال قبل يومين من حدوثه.

پێش دوو رۆژ لەڕودانی، پێشبینی رودانی زەمینلەرزەکەی کرد.

1410 حدث طريقةً جديدةً في معالجة البواسير.

شێوازێکی نوێی داهێنا لەچارەسەرکردنی مایەسیری.

أَحْدَثَ الطفل وسط الطريق.

منداڵەکە لەناوەڕاستی رێگاکەدا پیساییکرد.

1411 انتهى زمنُ العبوديَّة.

سەردەمی کۆیلایەتی کۆتاییهات.

1412 دمغتك مختلفة عن دمغتي طبعاً.

بێگومان پەنجەمۆری تۆ لە هی من جیاوازە.

1413 كان الفارس يحمل الرّمحَ والتُّرسَ.

(مَعْسولُ اللِّسان) واته زمانلوس[1414]

**551.** (نَجیب) خانەدان، کۆکەی (نُجباء)[1415]

(قارعةُ طریق) ناوەڕاست ڕێگا[1416]

**552.** (ضَریبة) باجە، جەمعی (ضرائِب)[1417]

(مِرْزَبَّة) "پیك"ە، کۆکەی (مَرازِب)[1418]

**553.** (ماخور) چیە؟ قەحبەخانە[1419]

(کَوْن) گەردونە، کۆکەی (أکوان)ە[1420]

**554.** (مضَغَ)، (لاكَ) جوو[1421]، (عِلْك) بنێشتە[1422]

---

سوارەکە رم و قەڵغانی پێبوو.

[1414] زوجها رجل معسول اللسان، لا تثق به.

مێردەکەی پیاوێکی زمانلوسە، متمانەی پێمەکە.

[1415] هو رجل نجیب وعالم.

ئەو پیاوێکی خانەدان و زانایە.

[1416] بێگومان دەبوو بنوسم (ناوەڕاستی ڕێگا) نەك (ناوەڕاست ڕێگا)، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە، پیتی یائەکەم نەنوسیوە.

أوقف سیّارته في قارعة الطّریق.

ئۆتۆمبێلەکەی لەناوەڕاستی ڕێگاکەدا وەستاند.

[1417] هەروەها بە (ضرِیبات)یش کۆدەکرێتەوە.

إذا رأیت في المنام أنك دفعت ضریبة فسوف تتمکن من تدمیر المؤثرات الشریرة المتجمعة حولك.

ئەگەر لەخەودا ببینیت باجت دا، ئەوە دەتوانیت کارتێکەرە خراپەکانی دەوروبەرت لەناوبەریت.

[1418] (مِرْزَبَّة) بەبێ شەددەکەش دەنوسرێت. بە نیسبەت جەمعەکەشیەوە، بە (مِرْزبّات)و (مَرازِبة)ش کۆدەکرێتەوە.

پیك: چەکوشی گەورە.

[1419] جمع مَوَاخِرُ ومَوَاخِیر.

المجتمعات الحدیثة لا تسمح بافتتاح المواخیر.

کۆمەڵگا مۆدێرنەکان ڕێ بە کردنەوەی قەحبەخانە نادەن.

[1420] عندي شهادة في عِلْم الکَوْن .

بڕوانامەیەکم هەیە لەسەر زانستی گەردون.

[1421] مضَغَ یَمضَع ویَمضُغ ، مَضْغًا ، فهو ماضغ ، والمفعول مَمْضوغ.

مضغ اللقمة قبل أن ینطق بالحدیث.

پێش ئەوەی دەستبکات بە قسەکردن، پارووەکەی جوو.

(مُزَايَدَة)يە فشەهەڵوێستە[1423]

**555.** (حَلَق) ئەڵقەیە، (شَنْف)و (قُرْط) گوارە[1424]

(إحصائيَّة)يە، واتای ئامارە[1425]

**556.** (صَلِخَ) کەڕبوو[1426]، (أَصْلَخ)ە نابیست[1427]

(عَزيز)و (حَبِيب) هەردوو خۆشەویست[1428]

---

لاكَ يَلُوك، لُكْ، لَوْكًا، فهو لائك، والمفعول مَلوك.

لاك الطعامَ بصورة قبيحة.

خواردنەکەی بەشێوەیەکی ناشرین جوو.

[1422]جمع الجمع عُلوك وأعلاك، مفرد عِلْكة.

العلك يساهم في خسارة الوزن.

بنشێت یارمەتی دابەزینی کێش دەدات.

[1423] لا أحبّ المزايدة السياسية.

حەزم لەفشەهەڵوێستی سیاسی نیە.

[1424] وضعت في أذنها حَلَقًا ذهبيًّا.

ئەڵقەیەکی ئاڵتونی کردە گوێیەوە.

هل تحب الشنف؟

حەزت لەگوارە هەیە؟

من رأى في أذنه قرطاً فهو يشتهي سماع الغناء والمعازف، إلا أن يرى بالأقراط لؤلؤاً فهو يحفظ القرآن ويجمعه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی گوارە لەگوێیدایە، ئەو حەز لەگوێگرتن لەگۆرانی و موزیك دەکات، بەڵام ئەگەر گوارەکان مرواریيان پێوەبێت، ئەو قورئان لەبەردەکات و کۆیدەکاتەوە.

[1425] يعتمد البحث العلميّ على الإحصائيّات الحديثة.

لێکۆڵینەوە زانستییەکە پشت بە ئامارە نوێیەکان دەبەستێت.

[1426] صَلِخَ صَلَخاً فهو أَصْلَخُ، وهي صلخاء والجمع : صُلْخٌ.

صلخ الرجل بعد الإنفجار.

پیاوەکە پاش تەقینەوەکە، کەڕبوو.

[1427] نابیست: کەڕ

هل تستطيع إفهام الأصلخ بسهولة.

دەتوانیت نابیست بەئاسانی تێبگەیەنیت؟

[1428] إذا حلمت أنك تغادر قلعة فسوف تسلب أملاكك أو قد تفقد حبيبك أو شخصاً عزيزاً عليك عن طريق الموت.

557. (أنسی) چیە؟ بیربردەوە[1429]

(جرَّبَ) مانای تاقیکردەوە[1430]

558. (أجرب)و (جَرِب) هەم (جَرْبَان)یش گەڕ[1431]

(سُورة) سورەتە، جەمعەکەی (سُوَر)[1432]

559. (بَوَّاب) دەرگاوان، (باب)یش دەرگایە[1433]

(عاقِل)، (لَبیب) ژیر[1434]، (حَکیم) دانایە[1435]

---

ئەگەر لەخەوتدا بینیت قەلایەك جێدەهێڵێت، ئەوە موڵکەکانت داگیردەکرێن یان رەنگە خۆشەویستەکەت یان کەسێکی خۆشەویستت لەڕێگەی مردنەوە، لەدەستبدەیت.

حبيبك يبلغك السلام.

خۆشەویستەکەت سەلامت لێدەکات.

1429 أنساه الوعد.

بەڵێنەکەی بیربردەوە.

1430 لا تمدحنَّ امرءًا حتى تُجرِّبه.

مەدحی هیچ کەسێك مەکە تا تاقینەکەیتەوە.

1431 گەڕ بەمانای توشبووی نەخۆشیی گەڕی.

لا تدنو من الشخص الأجرب.

لەکەسی گەڕ نزیك مەبەرەوە.

الكلب الجرب مخيف.

سەگی گەڕ ترسناکە.

لا تلمس جسد الجربان.

دەست لەجەستەی گەڕ مەدە.

1432 تُقْرأُ سورةُ الفاتحة في كلّ صلاة.

سورەتی فاتیحە لەهەموو نوێژێکدا دەخوێنرێت.

1433 البواب لم يسمح لي بدخول مكتب الوزير.

دەرگاوانەکە رێی پێنەدام بچمە نوسینگەی وەزیرەوە.

باب الغرفة مكسور.

دەرگای ژورەکە شکاوە.

1434 هو شاب عاقل و وسيم أيضاً.

ئەو گەنجێکی ژیرو قۆزیشە.

**.560** (التهمَ) چیه؟ حەپەلوشکرد[1436]

(فرَمَ) مانای پارچەپارچەکرد[1437]

**.561** (كسَدتِ السُّوق) "بازاڕ وەستا"یە[1438]

(فسَا) ماناکەی "تسیلێدا"یە[1439]

**.562** (دَهَنَ) چەورکرد[1440]، (دُهْن) مانای رۆن[1441]

(كَيَّفَ) گونجاند[1442]، (كَيْفَ) واته (چۆن؟)[1443]

---

سأل أحد الفلاسفة سقراط .. كيف تُعامل المرأة العاقلة زوجها ..؟ فقال لهم : المرأة العاقلة لا تتزوج.

فەیلەسوفێك لە سوقرات دەپرسێت: ژنی ژیر چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ مێردەكەیدا دەكات؟

سوقرات لەوەڵامدا دەڵێت: ژنی ژیر شوناكات.

اللبيب تكفيه إشارة.

ژیر ئاماژەیەكی بەسە. واتە بەئاسانترین شێوە تێدەگات.

1435 كان جدي رجلاً حكيماً.

باپیرم پیاوێكی دانا بوو.

1436 التهم الجائعُ الطَّعامَ.

برسییەكە خواردنەكەی حەپەلوشكرد.

1437 فرَم اللحمَ.

گۆشتەكەی پارچەپارچەكرد.

1438 أثناء ارتفاع سعر الدولار كسدت السوق.

لەكاتی بەرزبونەوەی نرخی دۆلاردا، بازاڕ وەستا.

1439 فسا الطفل.

منداڵەكە تسیلێدا.

1440 دهَنَ يدهُن ، دَهْنًا ، فهو داهن، والمفعول مَدْهون.

دهَن شعره للحفلة.

قژی چەوركرد بۆ ئاهەنگەكە.

1441 جمع أَدْهان ودِهان ودُهون.

رۆن= چەوری

أن جسم الإنسان يحوي على الدهون مايكفي لسبعة قطع من الصابون.

لەشی مرۆڤ هێندە چەوری تێدایە كە بەشی حەوت پارچە سابون دەكات.

1442 كيف حياته وفقًا للبيئة.

563. (غِشاء) پەردەیە، کۆکەی (أَغْشِیة)[1444]

(مَصْلَحة) مانای بەرژەوەندییە[1445]

564. (نِجارة) چیە؟ واتە دارتاشی[1446]

(غَشَّی) هەم (غطَّی) هەردوو داپۆشی[1447]

565. (حُرِّیَّة) چیە؟ واتە ئازادی[1448]

(قِوادة) حەتمەن مانای گەوادی[1449]

566. (وجَمَ) بێدەنگبوو[1450]، (وُجُوم) بێدەنگبون[1451]

---

ژیانی بەگوێرەی ژینگەکە گونجاند.

1443 {أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى}

پیشانمبدە چۆن مردوو زیندودەکەیتەوە؟

1444 وضع على اللحم غِشاء رقيقًا.

پەردەیەکی تەنکی لەسەر گۆشتەکە دانا.

1445 من مصلحة المتّهم أن يصرِّح بأسماء شركائه.

لەبەرژەوەندیی تۆمەتباردایە ئاشکراکردنی ناوی هاوبەشەکانی.

1446 تعتمد النِّجارةُ العصريّة على آلات متطوِّرة.

دارتاشیی هاوچەرخ پشت بە ئامێری پەرەسەندوو دەبەستێت.

1447 غشَّى الضبابُ القرية.

تەم گوندەکەی داپۆشی.

غطَّت وجهَها بالنِّقاب.

دەموچاوی بە نیقاب داپۆشی.

1448 فعل ما تحب هو الحرية. حب ما تفعله هو السعادة.

ئازادی بریتییە لەئەنجامدانی ئەوەی حەزت لێیەتی. بەختەوەریش بریتییە لەخۆشویستنی ئەوەی ئەنجامیدەدەیت.

1449 القوادة لها أنواع عديدة.

گەوادی چەندین جۆری هەیە.

1450 وجَمَ يجِم، جِمْ، وَجْمًا ووُجُومًا، فهو واجِم ووَجِم.

وجم المهندسُ أمام مديره.

ئەندازیارەکە لەبەردەم بەڕێوەبەرەکەی بێدەنگبوو.

1451 چاوگی (وجَمَ)یە.

الوجوم خير من الكلام الطائش.

(استشهاد) چاوگ، مانای شەهیدبون[1452]

**567.** (ضَعیف) چیە؟ بێدەسەڵات[1453]

(حَوْبة) گوناهە، کۆی (حَوْبات)، (حَوَبات)[1454]

**568.** (نَعثَل) پیری گێل، هەم نێرەکەمتیار[1455]

(وَضّاح)و (برّاق) هەردوو بریقەدار[1456]

**569.** (عِلج) کەری کێویی بەهێزو قەڵەو[1457]

(مُنتصَفُ اللیل) مانای نیوەشەو[1458]

**570.** (غِشّ) فێڵکردنە[1459]، (غشَّ) فێڵیکرد[1460]

---

بێدەنگبون لەقسەی هەڵەشە باشترە.

1452 چاوگی (اسْتُشهِدَ)یە.

من أُسْتشهِدَ فله الجنّة.

هەرکەس شەهیدبوو بەهەشتی بۆ دەبێت.

1453 الإنتصار على الضعيف هزيمة.

سەرکەوتن بەسەر بێدەسەڵاتدا شکستە.

1454 غسل الله حَوْبتَه.

خودا گوناهەکەی شۆردەوە.

1455 أزعجني هذا النعثل.

ئەم پیرە گێلە بێزاریکردم.

النعثل حيوان مقيت.

نێرەکەمتیار ئاژەڵێکی بێزراوە.

1456 قتله بسيف وضاح.

بە شمشێرێکی بریقەدار کوشتی.

ما كلّ برّاق ذهب.

هەموو بریقەدارێك زێڕ نیە.

1457 هاجم النمر العلج.

پڵنگەکە هێرشیکردە سەر کەرە کێوییە بەهێزو قەڵەوەکە.

1458 منتصف الليل وقت مرعب.

نیوەشەو کاتێکی تۆقێنەرە.

1459 الغِشّ عمل لا إنساني.

(استباحَ)یه مانای حەڵاڵكرد[1461]

**.571** (خِباء) چادره، كۆكەی (أَخْبِيَة)[1462]

(عَتَمَة) وەك (ظُلْمة) هەر تاریكییه[1463]

**.572** (بَرِّيَّة) چیه؟ واته بیابان[1464]

(ظَلیم) حوشترمل، كۆی (ظُلْمان)، (ظِلْمان)[1465]

**.573** (ظَلیم)و (مَظلوم) ستەملێكراو[1466]

(غاسِق) واته شەو، بەس ئەنگوستەچاو[1467]

---

فێڵكردن كارێكی نامرۆڤانەیه.

1460 مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنَّا.

ئەوەی فێڵبكات له ئێمه نیه.

1461 استباح العالم دم المرتد.

زانایەكه خوێنی هەڵگەڕاوەكەی حەڵاڵكرد.

1462 نصب الرُّعيان أخبيتَهم في الواحة.

شوانەكان چادرەكانیان لەناو مێرگەكه داكوتی.

1463 استتر اللِّصُّ بعَتَمة اللَّيل محاولاً السَّرقة.

دزەكه لەكاتی هەوڵدانی بۆ دزییەكه، خۆی به تاریكیی شەوەكه شاردەوه.

خاف من ظُلْمة اللَّيل.

لەتاریكییەكەی شەو ترسا.

1464 جمع بَرارٍ وبراريّ وبرّيّات.

إيجاد الماء البرِّيَّة شيء صعب.

دۆزینەوەی ئاو لەبیاباندا شتێكی قورسه.

1465 بەمانای حوشترملی نێر دێت نەك مێ. حوشترمل= نەعامه.

كان يعدو عَدْو الظليم.

وەك حوشترملی نێر رایدەكرد.

1466 وَلَدٌ ظَلیم سبب أنتفاضة كبيرة.

كوڕێكی ستەملێكراو بووەهۆی راپەڕینێكی گەوره.

اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ.

لەنزای ستەملێكراو بترسه، بێگومان هیچ پەردەیەك لەنێوان ئەوو خودادا نیه.

1467 بەمانای شەوی ئەنگوستەچاو دێت. ئەنگوستەچاو= زۆر تاریك.

574. (اِكتَرَى) چیه؟ واته بەکرێگرت[1468]

(تحمَّلَ)یە مانای بەرگەیگرت[1469]

575. (ينَعَ) پێگەیی، چاوگەکەی (يُنوع)[1470]

(فَرْع) واته لق، کۆی (أفْرُع)، (فُروع)[1471]

576. (كتَفَ) بەستەوە، دەستی لەپشتۆ[1472]

(شرايين) خوێنبەر، بەڵام تاك نا کۆ[1473]

577. (داهنَ) واته ماستاویکرد بۆ[1474]

(أسْياد)و (سادَة) گەورە، بەڵام کۆ[1475]

---

هل تتجرأ على زيارة المقابر في الغاسق؟

ئایا بوێریی ئەوەت هەیە لەشەوی ئەنگوستەچاودا سەردانی گۆڕستان بکەیت؟

[1468] اكترى سيّارةً لمدة يومين.

ئۆتۆمبێلێکی بەکرێگرت بۆ ماوەی دوو رۆژ.

[1469] تحمل البرد.

بەرگەی سەرماکەی گرت.

[1470] ينَع العنبُ.

ترێیەکە پێگەیی.

[1471] فروع الشجرة كبيرة.

لقەکانی درەختەکە گەورەن.

[1472] بەمانای "دەستی لەپشتۆ بەستەوە" دێت. دەستی لەپشتۆ بەستەوە= دەستی لەپشتەوە بەستەوە.

كتَف الجُنْديُّ الأسيرَ.

سەربازەکە دەستی دیلەکەی لەپشتەوە بەستەوە.

[1473] تاکەکەی (شَرْيان)و (شِرْيان)ە.

تصلُّب الشَّرايين مرض خطير.

رەقبونی خوێنبەرەکان نەخۆشییەکی مەترسیدارە.

[1474] داهَن رئيسَه.

ماستاوی بۆ سەرۆکەکەی کرد.

[1475] واته ئەو دوو وشەیە کۆن نەك تاك. تاکەکەیان (سيِّد)ە.

من هو سيِّدك؟

گەورەکەت کێیە؟

**578.** (فهِمَ) تێگەیشت، چاوگەکەی (فَهْم)ە[1476]

(جُرْأة) بوێری[1477]، (حَیاء)یش شەرمە[1478]

**579.** (شِبْل) بێچووەشێر، کۆی (أشبال)، (شِبال)[1479]

(عَمَل) واتە کار، جەمعەکەی (أعمال)[1480]

**580.** (تحالُف) چیە؟ هاوپەیمانی[1481]

(لِحاف) لێفەیە، لەگەڵ بەتانی[1482]

---

[1476] فهم يَفهَم، فَهْمًا، فهو فاهِم وفَهِم وفَهيم، والمفعول مَفْهوم.

خاطب الناس باللغة التي يفهمونها.

بەو زمانە قسە لەگەڵ خەڵكدا بكە كە تێیدەگەن.

"من أخلاق الجاهل الإجابة قبل أن يسمع، والمعارضة قبل أن يفهم، والحكم بما لا يعلم".. جعفر بن محمد

رەوشتی نەزان:

+ وەڵامدانەوە پێش ئەوەی شتەكە ببیستێت.

+ دژبون پێش ئەوەی تێبگات.

+ بڕیاردان لەسەر شتێك كە لێیی نازانێت.

[1477] هل عندك جرأة تصحيح مدرسك؟

ئایا بوێریی ڕاستكردنەوەی مامۆستاكەت تێدایە؟ واتە ئایا دەوێریت هەڵەی مامۆستاكەت ڕاستبكەیتەوە؟

[1478] لا حياء في الدين ولا في العلم.

شەرم نە لەئاییندا هەیە، نە لە زانستدا.

[1479] هەروەها بە (أَشْبُل)و(شُبول)یش كۆدەكرێتەوە.

هذا الشِّبْل من ذاك الأسد.

ئەم بێچووەشێرە هی ئەو شێرەیە. پەندێكە بەكاردەهێنرێت بۆ كەسێك كە لەباوكی بچێت.

[1480] عمل الخير يبدأ من البيت.

كاری چاكە لەماوە دەستپێدەكات.

[1481] هاوپەیمانی= هاوپەیمانێتی

التحالُف الكردي مطلوب في الوقت الحالي.

هاوپەیمانیی كورد لەئێستادا پێویستە.

[1482] جمع أَلْحِفَة ولُحُف.

على قد لحافك مد رجليك.

بەقەدەر لێفەكەت قاچت ڕاكێشە.

**.581** (ضاعَ) "ونبوو"ە، هەم بەفیڕۆچوو[1483]

(استشهدَ)یە مانای شەهیدبوو[1484]

**.582** (عِنوَان)و (عُنوان)، (عِنوان) ناونیشان[1485]

(فهَّمَ)، (أفهمَ) هەردوو تێگەیان[1486]

**.583** (استخدمَ) چیە؟ بەکار هێنا[1487]

---

إن رأت العزباء نفسها تلتحف بلحاف دافء في منامها، وكانت سعيدة به، فذلك يعني أنها قد تتزوج قريبا من رجل يسعدها، ويصونها.

ئەگەر خانمێکی سینگڵ لەخەودا بینی بەتانییەکی گەرم دەدات بەخۆیداو دڵی پێیخۆشبوو، ئەوە مانای ئەوەیە بەمزوانە هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکدا دەکات کە بەختەوەری دەکات و دەیپارێزێت.

[1483] ضاعَ يَضِيع، ضِعْ، ضَياعًا ، فهو ضائع.

ضاع الطِّفلُ في المدينة.

منداڵەکە لەشارەکەدا ونبوو.

لا يضيع جميلٌ أينما زُرِع.

چاکە لەهەر شوێنێکدا بچێنرێت، بەفیڕۆناچێت.

[1484] استشهدَ يستشهد، استِشهادًا.

من رأى في المنام أنه يطير مَعَ الْمَلَائِكَة يستشهد.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی لەگەڵ فریشتەدا دەفڕێت، ئەوە شەهیددەبێت.

[1485] عِلوانُ الكتاب جذاب.

ناونیشانی کتێبەکە سەرنجڕاکێشە.

هل تعلم عُنوان المكتبة العامة؟

ئایا ناونیشانی کتێبخانەی گشتی دەزانیت؟

لا أعلم عِنوان منزله.

ناونیشانی ماڵەکەی نازانم.

[1486] تێگەیان= تێگەیاند.

فهَّمه المعادلة.

هاوکێشەکەی تێگەیاند.

أفهمه الدَّرسَ بسهولة.

وانەکەی بەئاسانی تێگەیاند.

[1487] استخدم الطَّاقةَ النوويَّةَ لأغراض سلميَّة.

وزەی ناوکی بۆ ئامانجگەلی ئاشتی بەکارهێنا.

(غبَّ) بەمانای بینی پێوەنا[1488]

**[584.](#)** (غُبّ) کەنداو بچوك، جەمعەکەی (أغباب)[1489]

(شبَّ) گەورەبوو، چاوگەکەی (شَباب)[1490]

**[585.](#)** (دَیْجور)و (أَلْیَل) ئەنگوستەچاو[1491]

(مُصنَّف) پەڕتوك، هەم پۆلێنکراو[1492]

**[586.](#)** (لَثَة) پوك[1493]، (سِنّ) دان[1494]، (ضِرْس)، (ناجِذ) خرێ[1495]

---

[1488] غبَّ الشّرابَ.

بینی بەخواردنەوەکەوە نا. واتە بەیەك جار هەڵیقوڕاند.

[1489] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "کەنداو بچوك"، بریتییە لە "کەنداوی بچوك" بەڵام پیتی یائەکە بەر جادەی زەروراتی شیعر کەوتووە!

کەنداوی بچوك: دۆڵێك کە پڕبوبێت لەئاوی دەریا.

وقع في الغُبّ.

کەوتە ناو کەنداوە بچوکەکەوە.

[1490] هەروەها بە (شبیبة)ش دەبێتە چاوگ.

شبَّ شبَبْتُ ، **يَشِبّ** ، اشْبِبْ / **شِبَّ** ، شَبابًا وشبيبةً ، فهو شابّ.

من شبّ على شيء شاب عليه.

هەرکەسێك لەسەر شتێك گەورەبوو، لەسەریشی پیردەبێت. بەرامبەر ئەو پەندە کوردییەیە کە دەڵێت: خویەك گرتت بەپیری، بەری نادەیت تا ئەمری.

[1491] مێی (أَلْيَل) بریتییە لە (لَيْلاء)ە.

ترك المدينة في ليلة ديجور.

لەشەوێکی ئەنگوستەچاودا شارەکەی جێهێشت.

زارني في ليلة لَيْلاء.

لەشەوێکی ئەنگوستەچاودا سەردانی کردم.

[1492] مصنَّفات العقَّاد مفيدة.

کتێبەکانی عەقاد بەسودن.

الكتب مصنفة حسب الحروف الأبجدية.

کتێبەکان بەگوێرەی پیتی ئەبجەدی پۆلێنکراون.

[1493] جمع لثات ولِثًى ولِثِيّ

أصيب بالتهاب اللّثة.

(اِثنا عَشَريّ) ماناى دوانزەگرێ[1496]

**587.** (فَضْفاض) فراوان، لەگەڵ بەخشندە[1497]

(مِبْرَد) بڕبەنە، کۆی (مَبارِد)ە[1498]

**588.** (طَبَّ) چیە؟ چارەسەرکرد[1499]

(صفَرَ بـِ) واتە بەفیکە بانگکرد[1500]

---

توشی هەوکردنی پوك بوو.

[1494] جمع أسنان وأَسُنّ، جمع الجمع أَسِنَّة.

دان= ددان

أسنانك صفراء.

ددانەکانت زەردن.

[1495] جمع ضرس: أضراس وضُروس. جمع ناجذ: ناجذون ونواجِذ.

ئەم وشەیە بەگشتی نێرە، بەڵام جارجارەش وەك مێ بەکاردەهێنرێت.

وشەی (ضرس) بەمانای خرێ دێت بەگشتی، بەڵام (ناجذ) بەدیاریکراوی بەمانای خرێیەکانی ئەوپەڕ (نزیك مەڵاشوو) دێت.

شعر بألمٍ في ضُروسِه.

هەستی بەئازارێك کرد لەخرێکانیدا.

ضَحِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ.

پێغەمبەر هێندە پێکەنی تاوەکو خرێکانی ئەوپەڕی دەرکەوتن.

[1496] دوانزەگرێ: بەشی یەکەمی ریخۆڵەباریکە.

الاثنا عَشَريّ جزء مهم من جهاز الهضم.

دوانزەگرێ بەشێکی گرنگە لەکۆئەندامی هەرس.

[1497] لبس ثوباً فضفاضاً للحفلة.

جلوبەرگێکی فراوانی لەبەرکرد بۆ ئاهەنگەکە.

کان حاطم الطائي رَجُلاً فَضفاضاً.

حاتەمی تائی پیاوێکی بەخشندە بوو.

[1498] هل تعلم ما هو المبرد؟

ئایا دەزانیت بڕبەن چیە؟

[1499] یاطبیب طُبَّ نفْسكَ.

ئەی دکتۆر خۆت چارەسەرکە.

[1500] صفَر بكلبه.

سەگەکەی بە فیکە بانگکرد.

**.589** (صفَّرَ) بۆیەکرد، بەڵام بە هی زەرد[1501]

(بُرمة) مەنجەڵی قوڵی مس یا بەرد[1502]

**.590** (صُفْر) مسی زەرد[1503]، (صِفْر)یش سفره[1504]

(حزَرَ) خەملاند، چاوگەکەی (حَزْر)ە[1505]

**.591** (صَفْراء) زەردی مێ و ئاوی زراوه[1506]

گەوجی واتاکەی (غَبَاء)، (غَبَاوة)[1507]

---

[1501] بەمانای "بۆیەی کرد بە بۆیەی زەرد" دێت: زەردیکرد.

صفّر الصّباغُ الحائط.

بۆیەچییەکە دیوارەکەی بە بۆیەی زەرد بۆیەکرد.

[1502] جمع بُرُمات وبُرْمات وبِرام وبُرَم وبُرْم.

بەمانای مەنجەڵی قوڵی دروستکراو لە مس یان بەرد، دێت.

هل یوجد أي طعام في البرمة.

ئایا مەنجەڵەکە هیچ خۆراکێکی تێدایە؟

[1503] مسی زەرد:  تێکەڵەی مس و زنك (توتیا).

الصفر مادة جذابة.

مسی زەرد ماددەیەکی سەرنجڕاکێشە.

[1504] جمع أَصْفار.

للأسف موقعك في المستشفى كصفر على الشّمال.

بەداخەوە پێگەت لەنەخۆشخانەکەدا وەك سفری لای چەپ وایە.

[1505] حزَرتُ نتیجةَ المسابقة.

ئەنجامی پێبڕکێیەکەم خەملاند.

[1506] جمع صَفْراوات وصُفْر.

زەردی مێ: موئەنەسی زەرد. ئاوی زراو: زەرداوی زراو.

أحب السیارة الصفراء.

حەزم لەئۆتۆمبێلی زەردە.

تساعد الصفراء على هضم الموادّ الدُّهنیّة.

زەرداو یارمەتیی هەرسکردنی مادده چەورییەکان دەدات.

[1507] گەوجی= گەمژەیی.

غباء المرء مرض لیس له دواء.

**.592** (هُنَيْهَة) چیە؟ ماوەیەکی کەم[1508]

(ضَرْع) واتە گوان[1509]، (إِحليل) چوك، گۆی مەم[1510]

**.593** (مُنْتَخَب) چیە؟ هەڵبژاردە[1511]

(راقبَ)و (عَاوَرَ) (چاودێریکرد)ە[1512]

**.594** (ظالِم)و (غاشِم) هەردوو ستەمکار[1513]

---

گەوجیی مرۆڤ نەخۆشییەکە دەرمانی نیەز

غباوة الملحد لا حدود لها.

گەوجیی بێباوەڕ بێسنورە.

[1508] ماوەیەکی کەم بەمانای کاتێکی کەم و کەمێك.

جلس هُنَيْهة ثم انصرف.

کەمێك دانیشت، پاشان ڕۆیشت.

[1509] جمع ضُروع

ضَرْع البقرة كبير جداً.

گوانی مانگاکە زۆر گەورەیە.

[1510] جمع أحاليل

گۆی مەم= گۆی مەمك.

أُصيب بالتهاب في الإحليل.

توشی هەوکردنی چوك بوو.

إحليل المرأة مكان خصب لنقل الجراثيم.

گۆی مەمکی ژن ناوچەیەکی بەپیتە بۆ گواستنەوەی میکرۆب.

[1511] شقيقي لاعب في المنتخب العراقي.

براکەم یاریزانێکی هەڵبژاردەی عیراقە.

[1512] راقب العدوَّ خلسة.

بەدزییەوە چاودێری دوژمنی کرد.

عَاوَرَ الشَّمْسَ.

چاودێری خۆری کرد.

[1513] عمر الظالم قصير.

تەمەنی ستەمکار کورتە.

الغاشم يدخل الجحيم.

ستەمکار دەچێتە دۆزەخەوە.

(حَجَر) واته بەرد، جەمعەکەی (أحجار)[1514]

**595.** (عتَبَ على) گلەییکرد لە[1515]

(إلاّ) وەك (سِوَى) مانای جگەلە[1516]

**596.** (معاصي) تاوان، بەڵام تاك نا كۆ[1517]

(اعتباطاً)ە مانای بەبێ هۆ[1518]

**597.** (صَفير) هەم فیکە، هەم فیکەلێدان[1519]

(حَجَّام) ماناکەی کەڵەشاخەوان[1520]

**598.** (شَبَكة) واته تۆڕ، کۆی (شَبَك)، (شِباك)[1521]

---

1514 {فَقُلْنَا اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْحَجَرَ}

پاشان پێمانوت بە داردەستەکەت لەبەردەکە بدە.

1515 لا تعتب عليَّ لتقصيري في السُّؤال عنك.

گلەییم لێمەکە بەهۆی کەمتەرخەمیم لەئەحواڵپرسینت.

1516 كلُّ شيء ينقصُ بالإنفاق إلاّ العلم.

هەموو شتێك بە بەخشین کەمدەکات جگەلە زانست.

لا تتبع سوى الحقِّ.

شوێن هیچ شتێك مەکەوە جگەلە راستی.

1517 تاکەکەی (معصية)یە.

اجتنب المعاصي.

خۆت لەتاوان بەدوربگرە.

1518 بەبێ هۆ= لەخۆوە.

فرَض رأيَه اعتباطًا.

بۆچونی خۆی بەبێ هۆ سەپاند.

1519 صفير بعض الطيور مزعج.

فیکەی هەندێك باڵندە بێزارکەرە.

الصفير عادة سيئة.

فیکەلێدان خویەکی خراپە.

1520 کەڵەشاخەوان: کەسێك پیشەی کەڵەشاخگرتن بێت= پسپۆڕی کەڵەشاخگرتن= کەڵەشاخگر.

الحَجَّام رجل كبير السن.

پسپۆڕی کەڵەشاخەکە پیاوێکی بەتەمەنە.

(طَيْر) باڵندەیە، بەڵام کۆ نەك تاك[1522]

**599.** (شُبْكَة) چیە؟ خزمایەتییە[1523]

(شَجاعَة) مانای ئازایەتییە[1524]

**600.** (حذَقَ) ترشبوو،( حَذَاقة) مەسدەر[1525]

(حاسِر) سەرڕوتە، جەمعەکەی (حُسَّر)[1526]

**601.** (طَيْش) کەرێتییە، هەم هەڵەشەیی[1527]

(فشَرَ) درۆیکرد، (فَشْر) مەسدەری[1528]

---

[1521] ألقى الصيّادُ شِباكه في النّهر.

راوکەرەکە تۆڕەکانی هەڵدایە ناو روبارەکەوە.

[1522] تاکەکەی (طائر)ە.

العصفور طائر جميل.

چۆلەکە باڵندەیەکی جوانە.

[1523] بيني وبينك شُبكة قوية.

خزمایەتییەکی بەهێز لەنێوان من و تودا هەیە.

[1524] الفضائل الأربعة الرئيسية عند أفلاطون هي الحكمة والشّجاعة والعفّة والعدالة.

بەلای ئەفلاتونەوە چوار چاکە سەرەکییەکە بریتین لە دانایی و ئازایەتی و داوێنپاکی و دادپەروەری.

[1525] هەروەها بە (حِذْق)یش دەبێتە چاوگ.

حذَقَ الخلُّ بمرور الزمن.

بەتێپەڕبونی کات، سرکەکە ترشبوو.

[1526] هەروەها بە (حاسرون)و (حواسر)یش کۆدەکرێتەوە.

لا تأخذ النصيحة من الحاسر الجاهل.

ئامۆژگاری لەسەرڕوتی نەزان وەرمەگرە.

[1527] الطَيْش ينزّل منزلة الإنسان عند الناس.

کەرێتی پلەی مرۆڤ لەلای خەڵك دادەبەزێنێت.

الطيش يدمّر الإنسان.

هەڵەشەیی مرۆڤ لەناودەبات.

[1528] فشَرَ يَفشُر ، فَشْرًا ، فهو فاشِر.

ئیمانم نەچێ رەنگە وشەی "فشە" لەزمانی کوریدا، لەم وشەیەوە وەرگیرابێت.

كان يفشُر وهو يروي مغامراته.

602. (عِصابة) کۆمەڵ، جەمعی (عَصائِب)[1529]

(مَنْكِب) واتە شان، کۆکەی (مَناكِب)[1530]

603. (تطوُّر) چیە؟ پەرەسەندن[1531]

(مُغالَطة)یە بەهەڵەبردن[1532]

604. (عيَّنَ) دیاریکرد، لەگەڵ تەعینکرد[1533]

(غالطَ) مانای بەهەڵەدابرد[1534]

605. (مِشْرَطة)، (مِشرَط) هەردوکیان نەشتەر[1535]

---

لەکاتی گێرانەوەی سەرکەشییەکانیدا، درۆیدەکرد.

1529 أُلْقيَ القبضُ على عِصابة اللُّصوص.

کۆمەڵە دزەکە دەستگیرکران.

1530 أصيب في مَنْكِبه.

شانی بریندار بوو.

1531 نظرية التطوّر غير صحيحة.

بیردۆزی پەرەسەندن راست نیە.

1532 چاوگی (غالطَ)یە.

بەهەڵەبردن= بەهەڵەدابردن.

غالَط زمیلە.

هاوکارەکەی بەهەڵەدا برد.

1533 تەعینکرد= دامەزراند.

عيَّن يوم الجمعة موعدًا للاجتماع.

رۆژی هەینی وەك وادەی کۆبونەوەکە دیاریکرد.

عيَّن إبنه في منصب مدير.

کوڕەکەی لەپۆستی بەڕێوەبەر دامەزراند.

1534 لا تغالطني في الحساب.

بەهەڵەم مەبە لەحسابکردنەکەدا. واتە مەمخەرە هەڵەوە.

1535 لا تلمس المِشْرَطة.

دەست لەنەشتەرەکە مەدە.

لم يكن مِشْرط الجرّاح نظيفاً.

نەشتەری پزیشکە نەشتەرگەرەکە پاك نەبوو.

(نُمْرة) ژمارە، جەمعەکەی (نُمَر)[1536]

**606.** (وضُعَ) رسوابوو، چاوگەکەی (ضَعَة)[1537]

(بِضْعَة) پارچەیە، کۆکەی (بِضَع)ە[1538]

**607.** (ذابَ) چیە؟ توایەوە[1539]

(انتشرَ) مانای بڵاوبویەوە[1540]

**608.** (ضفَرَ) چیە؟ کرد بە پەلکە[1541]

(قاعِدة) یاسا، هەروەها (بنکە)[1542]

**609.** (اتَّضعَ) چیە؟ مانای رسوابوو[1543]

(انعتقَ)یە واتای رزگاربوو[1544]

---

[1536] نُمرة سيَّارتك جميلة.

ژمارەی ئۆتۆمبێلەکەت جوانە.

[1537] وضُع عندما أصبح عبدًا للمال.

کاتێك بوو بە کۆیلەی پارە، رسوابوو.

[1538] فاطمة بضعة مني.

فاتمە پارچەیەکە لە من.

[1539] نحن لا نجمد في الحقّ، ولا نذوب في الباطل.

ئێمە نە لە حەقدا دەیبەستین، نە لە ناحەقدا دەتوێینەوە.

[1540] انتشر الوباءُ في البلاد.

پەتایەکە لەوڵاتدا بڵاوبویەوە.

[1541] ضفَرت شعر ابنتها.

قژی کچەکەی کرد بە پەلکە.

[1542] جمع قاعِدات وقَواعِد.

الالتزام بقواعد المرور واجب على الكل.

پابەندبون بە یاساکانی هاتوچۆ ئەرکی هەموانە.

عادت الطائرات إلى قواعدها سالمة.

فڕۆکەکان بەسەلامەتی گەڕانەوە بۆ بنکەکانیان.

[1543] يتَّضع مَن يكون شحيحًا.

هەرکەسێك چروك بێت، رسوادەبێت.

[1544] انعتق من قيود السّلطة.

610. (ضَيْعة)، (قَرْيَة)، (رِيف) هەرسێ لادێیە[1545]

(مِقْلاع)و (خَطّار) قۆچەقانێیە[1546]

611. (غلام) خزمەتكار، هەروەها كوڕە[1547]

(طين) لەگەڵ (وحل) هەردوكیان قوڕە[1548]

612. (قشرة) توێكڵە، كۆدوجای (قشور)[1549]

---

لەكۆت و بەندی دەسەڵات رزگاربیبوو.

[1545] (قَرْيَة)و (ريف) بەمانای لادێ دێن بەگشتی، بەڵام (ضَيْعة) بەمانای لادێی بچوك دێت.

لادێ= گوند.

تعيش أمي في ضَيعة بعيدة.

دایكم لەگوندێكی بچوكی دور دەژی.

أَحبَّ العيشَ في القرية.

حەزم لەژیانی ناو گوندە.

عاش في الرِّيف مدة طويلة.

ماوەیەكی دورودرێژ لەگوندا ژیا.

[1546] أصابته حجرة مِقْلاع.

بەردێكی قۆچەقانێ بەریكەوت.

استعمال الخطار يحتاج مهارة.

بەكارهێنانی قۆچەقانێ پێویستی بە لێهاتویی هەیە.

[1547] بەمانای خزمەتكارو كوڕیش دێت. كوڕ لەتەمەنی لەدایكبونەوە تا نزیك پێگەیشتن.

دفع لغلامه أجرَه.

كرێكەی دا بە خزمەتكارەكەی.

من رأى في المنام أنه يخرج من إحليله حية فإنه يولد له غلام يكون له عدواً.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی مارێك لەچوكییەوە دەردەچێت، ئەوە كوڕێكی دەبێت، دەبێتە دوژمنی.

[1548] الغرق بالطين في المنام قد يدل على دنو الأجل.

نقومبون لەقوڕ لەخەودا رەنگە ئاماژەبێت بۆ نزیكبونەوەی مردن.

غاصت قدَمي في الوَحل.

پێم لەقوڕەكەدا نقومبوو.

[1549] مەبەستم لەكۆدوجا، جەمعی جەمعە، واتە جەمعی جەمعی (قِشْرة)، (قُشُور)ە. جەمعەكەی (قِشْرات)و (قِشْر)ە.

من رأى في المنام أنه أكل قشرة البيض، فإنه رجل نباش.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی توێكڵی هێلكە دەخوات، ئەو كەسێكە گۆڕ هەڵدەداتەوە بەمەبەستی دزینی شتەكانی ناوی.

(ببر) واته بەور، جەمعەکەی (ببور)[1550]

**613.** (وَصِيّ)، هەم (وَلِيّ) سەرپەرشتیارە[1551]

(طُرَّة) لێوارە، کۆکەی (طِرَار)ە[1552]

**614.** (وَصِيَّة) چيه؟ وەسیەتنامە[1553]

(غِبّ)و (مَغبَّة) هەردوو ئەنجامە[1554]

**615.** (جار) دراوسێیە، کۆی (جِيرة)، (جِيران)[1555]

(قَبِيح) ناشرين[1556]، (جَمِيل)، (بَهِيّ) جوان[1557]

---

1550 بەور: گیاندارێکی مەمکداری دڕندەی قەبارە گەورەیە.

هل تخاف من الببر ؟

ئایا لەبەور دەترسیت؟

1551 مات أبوه فصار عمُّه وَصيًّا عليه.

باوکی مرد، دوای ئەوە مامی بووە سەرپەرشتیاری.

دعا المديرُ وَلِيّ أمر الطالب.

بەڕێوەبەر سەرپەرشتیاری کاروباری فێرخوازەکەی بانگکرد.

1552 هەروەها بە (طُرَر)یش کۆدەکرێتەوە.

وقف على طُرَّة الوادِي دون خوف.

بەبێ ترس لەسەر لێواری شیوەکە وەستا.

1553 وضح الميت أشياء كثيرة في وصيته.

مردووەکە لەوەسیەتنامەکەیدا زۆر شتی رونکردەوە.

1554 لم يخش غِبّ عمله.

لەئەنجامی کارەکەی نەترسا.

يخشى بعض الآباء مغبَّة السلوك السيِّئ لأبنائهم.

هەندێك لەدایك و باوکان ترسیان لەئەنجامی رەفتاری خراپی رۆڵەکانیان هەیە.

1555 خَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ.

باشترین دراوسێ لای خودا، باشترینیانە بۆ دراوسێکەی.

1556جمع: قِباح وقَبْحَى.

هل ترضى بالزواج مع فتاة ذكيّة قبيحة الشكل.

ئایا قایل دەبیت بە هاوسەرگیریکردن لەگەڵ کچێکی زیرەکی روخسار ناشرین؟

1557 طفلك جميل جداً.

616. (أَلْية) سمت و دوگ، كۆی (ألايا)یه[1558]

(أُكْرةُ الباب)ه دەسكی دەرگایە[1559]

617. (استأجرَ) چیە؟ واتە بەكرێگرت[1560]

(قفَا أثَرَهُ) شوێنپێی هەڵگرت[1561]

618. (نَفْساء)، (نُفَساء) هەردوو زەیستان[1562]

(مَأْبون) قوندەرە، دوربێ لەڕوتان[1563]

619. (زُبْل)و (زِبْل) هەردوو پەیینە[1564]

---

منداڵەكەت زۆر جوانە.

وجهك البَهِيّ جنن كثيراً من الناس.

دەموچاوە جوانەكەت زۆر كەسی شێتكرد.

1558 هەروەها بە (أَليَّات)و (أَلَيات)یش كۆدەكرێتەوە.

أَلْية الخروف كبيرة جداً.

دوگی بەرخەكە زۆر گەورەیە.

هناك صلة ضعيفة بين حجم ألية المرأة وجمالها.

پەیوەندییەكی لاواز هەیە لەنێوان قەبارەی سمتی ژن و جوانییەكەیدا.

1559 أُكْرةُ باب مدخلنا مكسورة.

دەسكی دەرگای هۆڵەكەمان شكێنراوە.

1560 استأجر شقةً لمدة شهرين.

شوقەیەكی بۆ ماوەی دوو مانگ بەكرێگرت.

1561 قفا أثر اللص.

شوێنپێی دزەكەی هەڵگرت.

1562 جمع نُفَساوات ونُفاس ونِفاس

زەیستان: ژنێك كە تازە منداڵی بوبێت.

النُّفساءُ تخاف من الجن.

زەیستانەكە لەجنۆكە دەترسێت.

1563 لا تصاحبه، إنه شخص مَأْبون.

هاوڕێیەتی مەكە، ئەو كەسێكی قوندەرە.

1564 جمع أزْبال

الزُبْل يقوي الأراضي الزراعية.

(حَجْر صِحِّيّ)یە کەرەنتینە[1565]

**.620** (إسم مُستعار) ناوە، بەس خوازراو[1566]

(شَبَكيَّة)یە مانای تۆڕ(ی چاو)[1567]

**.621** (أعارَ) واتە بەخواستن پێدا[1568]

(صفَّرَ) بەتاڵکرد، هەم فیکەی لێدا[1569]

**.622** (مُسَلْسَل) چیە؟ واتە "زنجیرە"[1570]

(مِنْشار) مشارە، کۆی (مناشِير)ە[1571]

**.623** (يَتِيم)و (لَطيم)، (عَجيّ) هەتیوە[1572]

---

پەیین زەویی کشتوکاڵی بەهێزدەکات.

للزِبْل رائحة كريهة.

پەیین بۆنێکی ناخۆشی هەیە.

1565 الحَجْر الصِحِّيّ طريقة ناجحة لإحتواء تفشي بعض الأمراض المعدية.

کەرەنتینە رێگایەکی سەرکەوتووە بۆ کۆنترۆڵکردنی بڵاوبونەوەی هەندێکی نەخۆشیی گوازراوە.

1566 بەمانای ناوی خوازراو دێت.

نشر مقالته تحت اسم مُستعار.

وتارەکەی لەژێر ناوێکی خوازراودا بڵاوکردەوە.

1567 المشكلة في شَبَكيَّة عينك اليسرى.

کێشەکە لەتوڕی چاوی چەپتدایە.

1568 **أعارَ** يعير ، أَعِرْ ، **إعارةً** ، فهو مُعير ، والمفعول مُعار.

أعار صديقَه كتابًا.

کتێبێکی بەخواستن دا بە هاوڕێیەکەی.

1569 صفَّرتِ السَّيِّدةُ البيتَ من المتاع.

خاتونەکەماڵەکەی لەکەلوپەل بەتاڵکرد.

صفَّر الحكمُ لإنهاء المباراة.

ناوبژیوانەکە فیکەیلێدا بۆ کۆتاییپێهێنانی یارییەکە.

1570 المُسلسل التليفزيونيّ رائع.

زنجیرە تەلەفزیۆنییەکە نایابە.

1571 هل تعرف إستعمال المنشار الكهربائيّ؟

دەزانیت مشاری کارەبایی بەکاربهێنیت؟

(فِضَّة) كانزايه، كتومت زيوه[1573]

**.624** (تِلميذ) قوتابى[1574]، (طالِب) خوێندكاره[1575]

(عار) شورەييە، جەمعى (أَعْيار)ه[1576]

**.625** (عُذْر)و (مَعْذِرة) وەك (حُجَّة) بيانوو[1577]

---

[1572] قد تدل رؤية اليتيم في المنام على عودة الحق للرائي.

بينينى هەتيو لەخەودا رەنگە ئاماژەبێت بۆ گەڕانەوەى ماف بۆ خەوبين (ئەو كەسەى خەوەكەى بينيوه).

لا تحتضن طفلك أمام اللطيم.

منداڵەكەت لەباوەش مەگره لەبەرچاوى هەتيودا.

تربية العَجيّ غير صعبة.

بەخێوكردنى هەتيو قورس نيه.

[1573] واته بەماناى كانزايەك دێت كه ئەويش زيوه.

جمع فِضاض وفِضَض

الفِضَّة هي أفضل موصل حراري لذا تستخدم في صنع النافذة الخلفية للسيارة لإذابة الثلج في فصل الشتاء .

زيو باشترين گەيەنەرى گەرمييه، هەربۆيه بەكاردەهێنرێت لەدروستكردنى جامى دواوەى ئۆتۆمبێل بەمەبەستى تواندنەوەى بەفر لەزستاندا.

[1574] جمع تلامِذة وتلاميذ

ولدي الصغير تلميذٌ في مدرسة ابتدائيّة.

كوڕە بچوكەكەم قوتابييه لەخوێندنگەيەكى سەرەتايى.

[1575] جمع طالبون وطَلَبة وطُلاّب، مؤ طالبة، جمع مؤ طالبات.

في الجامعة كثير من الطُلاّب الأجانب.

زانكۆكه خوێندكارى بێگانەى زۆر لێيه.

[1576] شورەيى= شەرمەزارى.

النار ولا العار.

ئاگر باشتره لەشەرمەزارى.

[1577] هەرسێيكان بەماناى بيانوو دێن.

عُذْرك أقبح من ذنبك.

بيانووەكەت لەگوناهەكەت ناشرينتره.

لا أقبل معذرتك.

بيانووەكەت قبوڵ ناكەم.

تعدَّدت الانقلابات العسكريَّة بحجّة إنقاذ الوطن.

(تعلَّمَ)یە، بەمانای فێربوو[1578]

**.626** (تعذَّرَ) واتە بیانووی هێناوۆ[1579]

(معاطِس) لوتە، بەڵام تاك نا کۆ[1580]

**.627** (مِمراض) بەمانای هەمیشەنەخۆش[1581]

(حَزین) خەفەتبار[1582]، (فَرِحْ)ە دڵخۆش[1583]

**.628** (أفحمَ) دەمکوتکرد، هەم نوزەی بڕی[1584]

(خلَدَ) مایەوە، (خُلُود) مەسدەری[1585]

---

بە بیانووی رزگارکردنی نیشتمان، کودەتای سەربازی زۆر بووە.

1578 خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ.

باشترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان بووەو خەڵکیش فێردەکات.

1579 بیانووی هێناوۆ= بیانووی هێنایەوە.

تعذَّر المريض.

نەخۆشەکە بیانووی هێنایەوە.

1580 تاکەکەی " مَعطَس "ە.

معطسك بحاجة الى ثلاث عمليات جراحية.

لوتت پێویستی بە سێ نەشتەرگەرییە.

1581 والدي رجل مِمراض، لا يستطيع العمل.

باوکم پیاوێکی هەمیشەنەخۆشە، توانای کارکردنی نیە.

1582 يجب على الرجل الحزين أن يشاهد أفلاماً كوميدية.

پیاوی خەفەتبار پێویستە سەیری فیلمی کۆمیدی بکات.

1583 لا تكن فرحاً بموت أحد.

بە مردنی هیچ کەسێك دڵخۆش مەبە.

1584 أفحم خصمه بحججه القوية.

بە بەڵگە بەهێزەکانی، نەیارەکەی دەمکوتکرد.

أفحم البكاءُ الطفل.

گریان نوزەی منداڵەکەی بڕی.

1585 هەروەها بە (خُلْد)یش دەبێتە چاوگ.

خلَد في السجن لمدة طويلة.

ماوەیەکی زۆر لەزینداندا مایەوە.

**.629** (خلَّدَ) ماناى بە نەمرى هێشتۆ[1586]

(كُتُب) كتێبە، بەڵام تاك نا كۆ**[1587]**

**.630** (خَلَدْ) بیروهۆش، كۆكەى (أخلاد)ە[1588]

(مُصْمَت) ماناى قوڵ، هەروەها سادە[1589]

**.631** (عانِس) قەیرەیە، مێیە، هەم نێرە[1590]

(خَطَّار) واتە شێر[1591]، (خُلْد) مشكەكوێرە[1592]

**.632** (أغدقَ)، (غدِقَ) بەخوڕبارى[1593]

---

[1586] بە نەمرى هێشتۆ= بە نەمرێ هێشتەوە.

خلَّدته مؤلفاته العلميَّة.

كتێبە زانستییەكانى، بە نەمرى هێشتیانەوە.

[1587] تاكەكەى (كِتَاب)ە.

الكتاب خير جَليس.

كتێب باشترین هاوڕێیە.

[1588] لم يَأت في خَلَدِي هذا الأمر.

ئەم شتە نەهاتە بیروهۆشمەوە.

[1589] هو في نوم مصمت، لا تيقظه.

لەخەوێكى قوڵدایە، خەبەرى مەكەرەوە.

أحب اللون المصمت في اللباس.

لەجلوبەرگدا حەزم لەڕەنگى سادەیە.

[1590] واتە بەماناى قەیرەكچ و قەیرەكوڕیش دێت.

جمع عانسون، مؤ عانس وعانسة، جمع مؤ عانسات وعُنْس وعوانسُ وعُنَّس.

البقاء كاِمْرَأَةٌ عَانِسٌ خير من وجود زوج طالح.

مانەوە وەك ژنێكى قەیرە، باشترە لەبونى مێردێكى خراپ.

شقيقي رجل عانس.

براكەم پیاوێكى قەیرەیە.

[1591] لا تقترب من الخَطّار.

نزیك مەبەرەوە لە شێر.

[1592] يُعد الخلد حيوانًا منعزلًا يقضي معظم وقته تحت الأرض.

مێشكەكوێرە بە گیاندارێكى دابڕاو دادەنرێت و زۆربەى كاتەكانى لەژێر زەویدا بەسەردەبات.

(اِستبداد) حەتمەن ماناى زۆردارى[1594]

**.633** (هاتفَ) بە تێل قسەی لەگەڵ کرد[1595]

(أصابَ) پێکا، توشبوو، راستیکرد[1596]

**.634** (إصابة) روداو، گۆڵ و توشبونە[1597]

(خُلُود) ماناکەی درەنگپیربونە[1598]

---

[1593] أغدق المطرُ الليلة الماضية.

شەوی رابردوو باران بەخوڕباری.

غدِق المطرُ في منطقة بينجوين.

باران لەناوچەی پێنجوێن بەخوڕباری.

[1594] قبول الإستبداد يجلب المذلة.

قبوڵکردنی زۆرداری رسوایی دەهێنێت.

[1595] بە تێل قسەی لەگەڵ کرد= بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کرد.

هاتف صديقَه حول المشكلة.

سەبارەت بە کێشەکە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ هاوڕێکەی کرد.

[1596] أصاب السَّهمُ الهدفَ.

تیرەکە ئامانجەکەی پێکا.

أصابَه مرض عضال.

توشی نەخۆشییەکی کوشندە بوو.

أصاب العالم في قوله وفعله.

زانایەکە لە قسەو کرداریدا راستیکرد.

[1597] لەمانای سێیەمیاندا چاوگی (أصاب)یە.

جُرح في إصابة مرور.

لەڕوداوێکی هاتوچۆدا برینداربوو.

سجَّل اللاعب ثلاث إصابات خلال أقل من خمس دقائق.

یاریزانەکە لەماوەی کەمتر لەپێنج خولەکدا سێ گۆڵی تۆمارکرد.

الإصابة بمرض الجدريّ غير مميته.

توشبون بە نەخۆشیی ئاوڵە کوشندە نیە.

[1598] الخلود من سمات الذين لديهم أزواج صالحة.

درەنگپیربون تایبەتمەندییەکی ئەو کەسانەیە کە هاوسەری باشیان هەیە.

**.635** (رفَضَ) ڕەتكردۆ، چاوگەكەی (رَفَض)[1599]

(قَفّاص) سانیع و بائیعی قەفەز[1600]

**.636** (كُرَة) واتە تۆپ، كۆی (كُرات)، (كُرى)[1601]

(رعَف أنفُه) لوتـی پژا[1602]

**.637** (خلَد) چیە؟ درەنگ پیربوو[1603]

(شافهَ) دواند، بەڵام ڕووبەڕوو[1604]

**.638** (بَوْل) واتە میز[1605]، (مِرحاض)ە دەستاڤ[1606]

---

[1599] هەروەها بە (رَفْض)یش دەبێتە چاوگ.

ڕەتكردۆ= ڕەتكردەوە.

رفض حجَّته رفضًا باتًّا.

بەڵگەكەی بەتەواوەتی ڕەتكردەوە.

[1600] بەمانای سانیعی قەفەزو بائیعی قەفەزیش دێت.

سانیعی قەفەز= قەفەزدروستكەر.

بائیعی قەفەز= قەفەزفرۆش.

صنع القفّاصُ القَفَصَ من الخشب.

قەفەزدروستكەرەكە قەفەزەكەی لە دار دروستكرد.

ابتعت من القفّاص قفصًا للببّغاء.

قەفەزێكم لەقەفەزفرۆشكە كڕی بۆ توتییەكە.

[1601] اشتريت كرة جديدة لولدي الصغير.

تۆپێكی نوێم بۆ كوڕە بچوكەكەم كڕی.

[1602] خۆی لەخۆیدا ڕستەیەكی تەواوە.

[1603] خلَدَ يَخلُد، خُلْدًا وخُلُودًا، فهو خالد.

خلد والدي الفضل يعود لوالدتي.

باوكم درەنگ پیربوو، بەڵام چاكەكە بۆ دایكم دەگەڕێتەوە.

[1604] شافهَ يشافه، مشافهةً وشِفاهًا ، فهو مُشافِه ، والمفعول مُشافَه.

بەمانای "ڕووبەڕوو دواند" دێت، واتە دواندنی ڕووبەڕوو نەك لەڕێگەی تێل و ناڕاستەوخۆو هتد...ەوە.

ڕووبەڕوو دواند= ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ كرد.

شافَه الرَّجُلُ زوجته حول المشكلة.

پیاوەكە ژنەكەی ڕووبەڕوو دواند سەبارەت بە كێشەكە.

(خَلَف) قەرەبوو، کۆی (خُلوف)، (أخلاف)[1607]

**.639** (واقعَ) چیه؟ چوو بەگژیا[1608]

(رغَا) کەفیکرد، لەگەڵ زۆر گریا[1609]

**.640** (عَنْکبوت) چیه؟ جاڵجاڵۆکە[1610]

(دوَّار)، (متجوِّل) هەردوو گەڕۆکە[1611]

---

1605 جمع أَبْوال.

احتباس البول حالة صحية مزعجة.

گیرانی میز حاڵەتێکی تەندروستیی بێزارکەرە.

1606 جمع مَراحيض.

دەستاڤ= ئاودەست.

يرى ابن سيرين أن مشاهدة المرحاض في حلم الرجل المتزوج تشير إلى أنه يخون زوجته مع امرأة أخرى سيئة السمعة.

ئیبن سیرین پێیوایە بینینی ئاودەست لەخەودا لەلایەن پیاوەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو پیاوە ناپاکی لەهاوسەرەکەی دەکات لەگەڵ ژنێکی بەدناودا.

1607 قەربوو: جێگرەوە.

أعطاك الله خَلَفًا كبيراً لفقدان ثروتك.

خودا قەربوویەکی گەورەی پێبەخشیت بۆ لەدەستدانی سامانەکەت.

1608 واقع الرَّجلُ زميله.

پیاوەکە چوو بەگژ هاوکارەکەیدا.

1609 رغَا يَرغُو ، ارْغُ ، رَغْوًا ، فهو راغٍ.

رغا الماءُ أثناء الغليان.

ئاوەکە لەکاتی کوڵاندا کەفیکرد.

رغا الصَّبيُّ بعد موت أمه.

کوڕەکە پاش مردنی دایکی زۆر گریا.

1610 جمع عنكبوتات وعَناكِبُ وعناكيبُ، مذ عنكبوت وعنكب.

{وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ}

و بێگومان لاوازترین ماڵ، ماڵی جاڵجاڵۆکەیە.

1611 اشتريت الفاكهة من بائع جوال.

میوەکەم لەفرۆشیارێکی گەڕۆك کڕی.

رأيت رجلاً متجولاً يبحث عن الأشياء القديمة.

پیاوێکی گەڕۆکم بینی بەدوای شتگەلی کۆندا دەگەڕا.

641. (أصابَ) چيه؟ بريندارکرد[1612]

(أتعسَ)، (تعَسَ) هەردوو لەناوبرد[1613]

642. (لَقحة) بەمانای حوشتر(ی پڕشیر)[1614]

(عُصْفُور) چۆلەکە، کۆکەی (عصافير)[1615]

643. (أفاقَ) واتە بەئاگاهاتۆ[1616]

(سُکارَى) سەرخۆش، بەڵام تاك نا کۆ[1617]

644. (غَرام) چيه؟ خۆشەويستی[1618]

(عُمومًا) حەتمەن مانای بەگشتی[1619]

---

1612 أصاب منافسه في المباراة.

رکەبەرەکەی لەيارييەکەدا بريندارکرد.

1613 أتعسه اللهُ.

خودا لەناويبرد.

تعست صديقها بالسكوت.

بەبێدەنگی هاوڕێکەی لەناوبرد.

1614 الجمع: لِقاح

بەمانای حوشتری مێي پڕشير دێت واتە شيری زۆر بێت.

اللقحة حيوان ثمين.

حوشتری پڕشير ئاژەڵێکی گرانبەهايە.

1615 رأيت عصفورًا يحلق في السماء.

چۆلەکەيەکم بينی لەئاسماندا دەفڕی.

1616 بەئاگاهاتۆ= بەئاگاهاتەوە.

أفاق من نومته.

لەخەوەکەی بەئاگاهاتەوە. واتە بەخەبەری بووەوە.

1617 تاکەکەی (سكران)ە.

رأيت رجلاً سكرانًا يشرب النفط بدل الماء.

پياوێکی سەرخۆشم بينی لەبری ئاو نەوتی دەخواردەوە.

1618 غرام قيس بليلى مشهور.

خۆشەويستيی قەيس بۆ لەيلا بەناوبانگە.

1619 زرت المدن العراقية عُمومًا.

**.645** (ناصَب) واتە بەرهەڵستیکرد[1620]

(أوجدَ) دابینکرد، هەم دەوڵەمەندکرد[1621]

**.646** (تخطَّى)، (أَهمَلَ) واتە پشتگوێخست[1622]

(خلَّفَ) جێهێشت، هەروەها دواخست[1623]

**.647** (اِرمَكَّ) چیە؟ واتە لاوازبوو[1624]

(تعَسَ)، (تعِسَ) بەدبەختبوو[1625]

**.648** (صَكَّ) "لێدا"یە، هەروەها داخست[1626]

---

سەردانی شارەکانی عیراقم کردووە بەگشتی.

[1620] ناصَب الظالم حتى الموت.

تا مردن بەرهەڵستیی ستەمکارەکەی کرد.

[1621] أوجدت الحكومةُ عملاً للعاطلين.

حکومەت کاری بۆ بێکارەکان دابینکرد.

الحمد لله الذي أوجدني بعد فقر.

سوپاس بۆ ئەو خودایەی پاش هەژاری، دەوڵەمەندی کردم.

[1622] تخطَّى البائعُ المشتري.

فرۆشیارەکە کڕیارەکەی پشتگوێخست.

إن الله يمهل ولا يُهمل.

بێگومان خودا مۆڵەتدەدات بەڵام پشتگوێناخات.

[1623] خلَّف لورثته أموالاً طائلة.

سامانێکی زۆری بۆ میراتگرەکانی جێهێشت.

خلّف الدَّيْنَ.

قەرزەکەی دواخست.

[1624] ارْمَكَّ الجمَلُ بسبب المرض.

حوشترەکە بەهۆی نەخۆشییەوە لاوازبوو.

[1625] تعَسَ الولد بعد وفاة أمه.

منداڵەکە پاش کۆچیدوایی دایکی، بەدبەختبوو.

تعِسَ الشاب بعد الإنحراف عن الطريق المستقيم.

پاش لادان لەسەر ڕێگای ڕاست، گەنجەکە بەدبەختبوو.

[1626] بەڵام لێدان و داخستنی توند نەك ناسکەلێدان و ناسکەداخستن!

(لَبِنَة) شیردەرە، دێش بەمانای خشت[1627]

**.649** (یهودِيّ) چیە؟ واتە جولەکە[1628]

(صَكّ) لەگەڵ (شِيك) هەردوکیان چەکە[1629]

**.650** (حَذْف) بڕینە، کارەکەی (حذَف)[1630]

(رَغْوَة) هەم (رُغْوة) هەردوو مانای کەف[1631]

---

صَكَّ صَكَكْتُ ، يَصُكّ ، اصْكُكْ / صُكَّ ، صَكًّا ، فهو صاكّ ، والمفعول مَصْكوك

صَكَّ وَجْهَه بعد شتمه.

پاش جوێنپێدانی، لەدەموچاوی دا.

صَكَّ البابَ و هرب.

دەرگەکەی داخست و رایکرد.

1627 جمع لَبِنات ولَبِن.

بَقَرَةٌ لَبِنَةٌ خير من ثورين للفقير.

مانگایەکی شیردەر لەدوو گا باشترە بۆ هەژار.

بنَى منزله من اللبن.

ماڵەکەی لەخشت دروستکرد.

1628 جمع يَهود

{مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا} .

ئیبراهیم نە جولەکە بوو، نە گاور.

1629 چەکی بانك نەك هی کوشتن!

صَكّك مزور.

چەکەکەت ساختەکراوە.

قدَّمت الشركة شِيكًا سخيًا للموظفين المتميزين.

کۆمپانیا چەکێکی بەبەهای پێشکەش بە کارمەندە ناوازەکان کرد.

1630 حذَفَ يَحذِف ، حَذْفًا ، فهو حاذِف ، والمفعول مَحْذوف.

بڕین بەمانای سڕینەوە.

حذَف الرئيس عبارةً من خطابه.

سەرۆك دەستەوژایەکی لەوتارەکەی سڕییەوە.

1631 رغوة الصابون تؤذي العين.

کەفی سابو زیان بە چاو دەگەیەنێت.

هل رأيت رغوة البحر؟

**.651** (بندقَ عليه) تەقەيلێكرد[1632]

(زبَلَ)، (زبَّلَ) پەينيتێكرد[1633]

**.652** (صفرَ) چيە؟ فيكەی لێدا[1634]

(اِستَنثَرَ) ئاوی لەلوتی رادا[1635]

**.653** (بسَرَ) چيە؟ رويگرژكرد[1636]

(استرفدَ) داوای يارمەتی لێكرد[1637]

**.654** (رِفاد) وەك (رَفْد) يارمەتيدانە[1638]

(ثَمَّ) "ئەوێ"يە[1639]، (ثُمَّ) "پاشان"ە[1640]

---

كەفی دەريات بينيوە؟

1632 خۆی لەخۆيدا رستەيەكی تەواوە.

بەمانای تەقەيلێكرد دێت بەڵام بە تفەنگ نەك بە ئاڕپيجی و هتد...!

1633 زبَلَ الفلاحُ أرضَه.

جوتيارەكە پەينی كردە زەوييەكەيەوە.

تزبيل الأشجار يكون غالبًا في فصل الشتاء.

زۆربەی جار پەيينكردنە درەخت لەوەرزی زستاندا ئەنجامدەدرێت.

1634 صفرَ الشاب حين رأى الفتاة الجيملة.

گەنجەكە كاتێك كچە جوانەكەی بينی فيكەی لێدا.

1635 اِستَنثَرَ الرجل أثناء الوضوء.

پياوەكە لەكاتی دەستنوێژدا ئاوی لەلوتی رادا.

1636 بسَرَ يَبسُر ، بَسْرًا وبُسورًا ، فهو باسِر.

بسَر الرجل حين سمع أخته تتحدث عن زوجته.

پياوەكە كاتێك گوێی لەخوشكەكەی بوو قسە لەسەر ژنەكەی دەكات، رويگرژكرد.

1637 استرفد المحتاجُ الغنيَّ.

هەژارەكە داوای يارمەتی لەدەوڵەمەندەكە كرد.

1638 هەروكيان چاوگی (رفَدَ)ن.

رفَد والدي السَّائلَ.

باوكم يارمەتيی سواڵكەرەكەی دا.

1639 {فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ}

روبكەنە هەر شوێنێك، ئەوێ ئاڕاستەی خودايە.

**.655** (وَديعة) چيه؟ راسپارده[1641]

(رفَدَ) دەرکرد، چاوگەکەی (رَفْد)ە[1642]

**.656** (غلَم)و (غُلْمَة) مانای زەوقهەستان[1643]

(رَعْف) هەم (رُعاف) هەردوو لوتپژان[1644]

**.657** (يَعْسُوب) شاژن و پوشكەبەقنگە[1645]

(بُنْدُق) گوللـەيە، بەس هی تفەنگە[1646]

---

[1640] دخل الرجال ثُمَّ النساء.

پیاوەکان چونەژورەوە، پاشان ژنەکان.

[1641] جمع وَدائعُ.

راسپاردە= ئەمانەت.

هل ترجع لي وديعتي؟

ئایا راسپاردەکەم بۆ دەگێڕیتەوە؟

[1642] رفَدَ يَرفِد ، رَفْدًا ، فهو رافِد ، والمفعول مَرْفود.

رفَد المدرس تلميذًا مشاغِبًا.

مامۆستاکە قوتابییەکی ئاژاوەگێڕی دەرکرد.

[1643] هەردوکیان چاوگی (غَلِمَ)ن.

غَلِمَ الرجل حين رأى زوجته عارية.

پیاوەکە کاتێك هاوسەرەکەی بەڕوتی بینی، زەوقیهەستا.

[1644] هەردوکیان چاوگی (رعُفَ)ن.

رعُف الرجل بسبب الشمس.

پیاوەکە بەهۆی خۆرەوە لوتپیژا.

[1645] جمع يعاسيبُ

بەمانای شاژن(ی هەنگ)و پوشکەبەقنگەش دێت.

اليَعْسُوب حشرة كبيرة.

شاژن مێروویەکی گەورەیە.

اذا رأت الفتاة العزباء في المنام اليعسوب فإن هذا دلالة على صلاح الأحوال والخروج من حالة الحزن.

ئەگەر کچێکی شونەکردوو لەخەودا پوشکەبەقنگەی بینی، ئەوە ئاماژەیە بۆ چاکبونی بارودۆخی کچەکەو دەرچون لەخەفەت.

[1646] مفرد بُنْدُقة.

لا تلمس البُنْدُقة.

658. (اِستَرَقَ) لەگەڵ (سَرق) دزی[1647]

(ارتعدَ)یە بەمانای لەرزی[1648]

659. (ضَفْر)و (ضَفيرة) هەردوكيان پەلكە[1649]

(حبَّة سوداء)ە بەمانای رەشكە[1650]

660. (سِراج) چرایە، كۆی (سُرُج)و (سُرْج)[1651]

(أشمطُ الشَّعر) سەر ماش و برنج[1652]

661. (وَشيجة) چيە؟ پەيوەنديیە[1653]

(نَدى) شەونمە، كۆكەی (أندية)[1654]

---

دەست لەگوڵـەكە مەدە.

1647 استرَق نقوداً كثيرة من المصرف.

پارەيەكی زۆری لەبانكەكە دزی.

الكذاب لص أيضاً، اللص يسرق مالك والكذاب يسرق عقلك.

درۆزن دزيشە، دز پارەت دەدزێت و درۆزنيش عەقڵت.

1648 ارتعد خوفًا من كشف جريمته.

لەترسی ئاشكرابونی تاوانەكەی لەرزی.

1649 ضفرك غير نظيف.

پەلكەكەت پاك نيە.

ضفيرات شَعْرك جميلة.

پەلكەكانی قژت جوانن.

1650 للحبَّة السَّوداء فوائد عديدة.

رەشكە چەندين سودی هەيە.

1651 قرّب السراج مني.

چراكەم لێ نزيكبكەرەوە.

1652 زوجها رجل أشمطُ الشَّعر.

مێردەكەی پياوێكی سەر ماش و برنجە.

1653 جمع وشائِج

عندي وشِيجة المحبَّة مع أصدقائي.

پەيوەنديی خۆشەويستييم لەگەڵ هاوڕێكانمدا هەيە.

1654 هەروەها بە (أنداء)يش كۆدەكرێتەوە.

**.662** (بُدْرَة) وەك (بودرة)، ماناكەی بۆدره[1655]

(أَصْفَر) واته زەرد، جەمعەكەی (صُفْر)ه[1656]

**.663** (نَدى) وەك (سَخاء) بەخشندەیی[1657]

(حفيظة)و (غَضَب) هەردوو توڕەیی[1658]

**.664** (نَسيب) هەم زاوا، هەم وەجاخزاده[1659]

(رِفْد) یارمەتی، كۆكەی (أرفاد)ه[1660]

---

[1655] وضعت الأم البُدْرة على قدم طفلها المصابة.

دایكەكە بۆدرەی كرد بە پێیە نەخۆشەكەی منداڵەكەیدا.

للبودرة أنواع عديدة.

بۆدره چەندین جۆری هەیە.

[1656] اشتريت ثوبًا لونه أصفرُ.

جلوبەرگێكم كڕی كە ڕەنگەكەی زەرد بوو.

[1657] نداه أخجل الثريين.

بەخشندەییەكەی دەوڵەمەندەكانی شەرمەزاركرد.

السَخاء من شيمة الأبرار.

بەخشندەیی یەكێكە لەڕەفتارەكانی چاكەكاران.

[1658] المقدرة تُذهب الحفيظةَ.

توانین توڕەیی لادەبات. مەبەست ئەوەیە كە تواناو دەسەڵاتت هەبوو لێبوردە بە نەك لەسەر بنچینەی توڕەیی وەڵامبدەیتەوە.

ثلاثة لا يعرفون إلّا عند ثلاث: الشجاع عند الحرب، والحليم عند الغضب، والصديق عند الحاجة.

سێ جۆر كەس هەن لەسێ حاڵەتدا نەبێت، ناناسرێنەوە: ئازا لەكاتی جەنگ و هێمن لەكاتی توڕەیی و هاوڕێ لەكاتی پێویستیدا.

[1659] جمع أنْسِبَاءُونُسَبَاءُ.

لەمانای یەكەمیاندا هاومانای (صِهْر).

نسيبي عالم جليل.

زاواكەم زانایەكی پایەبەرزە.

الرجل النسيب لا يزور الأماكن المشبوهة.

پیاوی وەجاخزاده سەردانی شوێنی گوماناوی ناكات.

[1660] هەروەها بە "رُفُود"یش كۆدەكرێتەوە.

لا تقطع أرفادك عن الفقراء.

یارمەتییەكانت لەهەژاران مەبڕە.

**.665** (تفاؤل) چیە؟ واتە گەشبینی[1661]

(أصابَ من)ە چێژی لێبینی[1662]

**.666** (بدَأَ) دەستپێکرد، (بَدْء) مەسدەری[1663]

(صَلَخ) ماناکەی کەڕبون و کەڕی[1664]

**.667** (زَريبة) تەویلە، هەم چاڵ(ی راوکەر)[1665]

(أُكْرَة)ش هەر چاڵە، کۆی (أُكْرات)، (أُكَر)[1666]

**.668** (نحَرَ)، (ذبَحَ)، (عقَرَ) سەربڕی[1667]

---

1661 التفاؤل من الله، أما التشاؤم فيولد في دماغ الإنسان.

گەشبینی لەلایەن خوداوەیە، بەڵام رەشبینی لەدەماخی مرۆڤدا لەدایکدەبێت.

1662 أصاب الرَّجلُ من زوجته.

پیاوەکە چێژی لەژنەکەی بینی.

1663 بدَأَ يَبدَأ، بَدْءًا وبَدْأةً وبِدَايةً، فهو بادِئ.

بدأت الفتنة في هذا الحي.

ئاژاوەکە لەم گەڕەکەوە دەستیپێکرد.

1664 چاوگی (صَلِخَ)یە.

للصلخ أسباب عديدة.

کەڕبون چەندین هۆکاری هەیە.

هل يوجد علاج للصلخ؟

ئایا کەڕی چارەسەری هەیە؟

1665 جمع زَريبات وزَرائب.

تبيت أبقار المزرعة في الزَّريبة.

مانگاکانی کێڵگەکە لەتەویلەکەدا دەمێننەوە.

للزريبة دور مهم في الصيد.

چاڵی راوکەر رۆڵێکی گرنگی لەڕاوکردندا هەیە.

1666 هەروەها بە (أُكُرات)یش کۆدەکرێتەوە.

وقعت الدجاجة في الأكرة.

مریشکەکە کەوتەناو چاڵەکەوە.

1667 نحَرَ يَنحَر ، نَحْرًا ، فهو ناحِر ، والمفعول مَنْحور ونحير.

ذبَحَ يَذبَح ، ذَبْحًا ، فهو ذابِح ، والمفعول مَذْبوح وذبيح.

(باعَ) "فرۆشت"ه[1668]، (اشترى) كڕی[1669]

**.669** (أَصْدقاء) هاوڕێ، بەڵام تاك نا كۆ[1670]

(لخاطِركَ) لەبەر خاتری تۆ[1671]

**.670** (مِنْ كُلِّ خَاطِرِي) لەناخی دڵمۆ[1672]

(طُلَّح) خراپەكار، بەڵام تاك نا كۆ[1673]

---

قَرَ يَعقِر ، عَقْرًا ، فهو عاقِر ، والمفعول معقور.

نحر القصّاب البقرة بسهولة.

قەسابەكە بە ئاسانی مانگاكەی سەربڕی.

هل تخاف من ذبح الجاموس أمامك؟

ئایا لەسەربڕینی گامێش لەبەردەمتدا دەترسیت؟

عقر عِجْلاً لعيد الأضحى.

بۆ جەژنی قوربان گوێرەكەیەكی سەربڕی.

[1668]باعَ يَبيع ، بِعْ ، بَيْعًا ، فهو بائع وبَيِّع ، والمفعول مَبِيع ومَبْيوع.

باع الرجل بيته بثمن رخيص.

پیاوەكەماڵەكەی بە نرخێكی هەرزان فرۆشت.

[1669]اشترى يشتري ، اشْتَرِ ، اشتراءً ، فهو مُشترٍ ، والمفعول مُشترًى.

اشتريت اليوم كتابًا مفيداً.

ئەمڕۆ كتێبێكی بەسودم كڕی.

[1670] تاكەكەی (تەبعەن بیلامانێ!) بریتییە لە "صَديق".

صديقي العزيز إذا كنت ستعيش مئة عام، فإنني أتمنى أن أعيش مئة عام تنقص يوماً واحداً كي لا أضطر للعيش من دونك.

هاوڕێی ئازیز ئەگەر تۆ سەد ساڵ بژیت، ئاواتەخوازم من یەك ڕۆژ كەمتر لەسەد ساڵ بژیم، بۆ ئەوەی ناچارنەبم بەبێ تۆ بژیم.

[1671] تخليت عن حقي لخاطرك.

لەبەر خاتری تۆ وازم لەمافەكەی خۆم هێنا.

[1672] لەناخی دڵمۆ= لەناخی دڵمەوە.

قدمت لك الهدية من كل خاطري.

دیارییەكەم لەناخی دڵمەوە پێشكەشكردیت.

[1673] بێگومان بە (طالحون)یش كۆدەكرێتەوە. پێچەوانەی (صالح)ە.

الثناء يزيد الصَّالحين صلاحًا والطَّالحين سوءًا.

ستایش چاكەكاران چاكتردەكات و خراپەكارانیش خراپتر.

671. (قاق) قەلەڕەش، گێل، جەمعەکەی (قیقان)[1674]

(كَسَرَ خَاطِرَهُ) دڵی شکان[1675]

672. بازرگانیکرد (تجَرَ)، (اتَّجرَ)[1676]

(غِرَّة) ساویلکە، کۆکەی (غِرَر)ە[1677]

673. (قاقَ) چیە؟ گارەگاریکرد[1678]

(ندَّى)، (بَلَّلَ) هەردوکیان تەڕکرد[1679]

674. (تنصَّلَ) گۆڕا، خۆیدزیۆ، نەما[1680]

---

1674 لەمانای یەکەمیاندا موڕادیفی (غراب)ە.

القاق طائر غير محبوب.

قەلەڕەش باڵندەیەکی رۆحسوك نیە.

لا تصاحب القاق.

هاوڕێیەتی گێل مەکە.

1675 بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "دڵی شکان"، بریتییە لە دڵی شکاند، بەڵام لەبەر قافیەی شیعرەکە دالەکەم لابردووە.

كَسَرَ خَاطِرَهُ على شيء تافه.

لەسەر شتێکی بێبایەخ دڵی شکاند.

1676 يتجر الرجل منذ صباه.

پیاوەکە لەمنداڵییەوە بازرگانیدەکات.

لو اتَّجرت بالأكفان ما مات أحدٌ.

ئەگەر بازرگانیم بە کفنەوە بکردایە، کەس نەدەمرد. پەندێکە بۆ گوازرشتکردنی لەبێبەختی بەکاردەهێنرێت.

1677 شقيقته فتاة غرة.

خوشکەکەی کچێکی ساویلکەیە.

1678 قاقَ يقيق ، قِقْ ، قَيْقًا / قاقَ يَقُوق قَوْقًا ، فهو قائِق.

قَاقَتِ الدَّجَاجَةُ في الحديقة.

مریشکەکە لەباخچەکەدا گارەگاریکرد.

1679 ندّى المطرُ الأرضَ.

بارانەکە زەوییەکەی تەڕکرد.

بلَّل حبيبته بالماء.

خۆشەویستەکەی بە ئاو تەڕکرد.

1680 خۆیدزیۆ= خۆیدزییەوە.

(دُوارُ البحر) گێژی، بەس دەریا[1681]

**.675** (غَرَّ) واتە ڕشت، هەم هەڵخەڵەتان[1682]

(طَيلَسان) شاڵە، بەڵام هی سەرشان[1683]

**.676** (قَيَّنَ)، (زيَّنَ) ڕازاندەوە[1684]

(نعَشَ)، (أنعشَ) بوژاندەوە[1685]

---

تنصَّلتِ لحيتُه من الخضاب.

ریشی بەهۆی بۆیاخەوە گۆڕا.

تنصَّل من المسئوليَّة.

خۆی لەبەرپرسیارێتییەکە دزییەوە.

تنصَّل كَمَدُه.

خەفەتەکەی نەما.

[1681] بەمانای گێژیی دەریا دێت کە حاڵەتێکی تەندروستییە بەهۆیەوە توشبوو لەکاتی سەیرکردنی شەپۆلەکانی دەریا، لەکاتی گەشتی دەریایی، سەری گێژدەخوات.

هل عندك دُوار البحر.

گێژیی دەریات لەگەڵدایە؟

[1682] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "هەڵخەڵەتان" بریتییە لە هەڵخەڵەتاند، بەڵام لەبەر قافیەکە دالەکەم لابردووە.

غَرَّ الْمَاءَ على قميصه.

غَرَّ الفتاة بالمال.

کچەکەی بە پارە هەڵخەڵەتاند.

ئاوەکەی بە کراسەکەیدا ڕشت.

[1683] بەمانای شاڵی سەر شان دێت نەك شاڵی ڕانکوچۆغە.

وضع العالم الطَيلَسان على كتفه وبدأ بخطبته.

زاناکە شاڵەکەی لەسەر شانی داناو دەستیکرد بە وتارەکەی.

[1684] قيَّنَ العروسة للحفلة.

بوکەکەی ڕازاندەوە بۆ ئاهەنگەکە.

ليس الجمال بأثواب تُزيِّننا

إن الجمال جمالُ العلم والأدبِ

جوانی بەو جلوبەرگانە نیە کە دەمانڕازێننەوە

بێگومان جوانی، جوانی زانست و ئەدەبە

[1685] نعش الربيعُ الحدائِقَ والبساتين.

**.677** (تخطَّى) چيه؟ واته تێپەڕاند[1686]

(قبَضَ) ماناى گرت، وەرگرت و مراند[1687]

**.678** (قبَضَ) بەماناى توشى قەبزيكرد[1688]

(مُبتذِل) سوكه[1689]، (اِبتذلَ) سوككرد[1690]

**.679** (قبَّض)، (سلَّمَ) ماناى رادەستكرد[1691]

---

بەهار باخچەو بێستانەكانى بوژاندەوە.

أنعشت الحكومة الجديدة اقتصادَ البلد.

حكومەتە نوێيەكە ئابوريى وڵاتى بوژاندەوە.

1686 تخطَّى يتخطَّى ، تَخَطَّ ، تخطّيًا ، فهو متخطٍّ ، والمفعول متخطًّى.

تخطَّى الرجل سنَّ الشَّباب.

پياوەكە تەمەنى گەنجيى تێپەڕاند.

1687 قبَضَ يَقبِض ، قَبْضًا ، فهو قابِض ، والمفعول مَقبوض.

قبَضَ السكين بيده.

چەقۆكەى بەدەستى گرت.

قَبَض مرتَّبَه آخر الشهر.

كۆتايى مانگ موچەكەى وەرگرت.

قبَضَ اللهُ المريض بعد حياة طويلة.

پاش ژيانێكى زۆر، خودا نەخۆشەكەى مراند.

1688 قبَضَ يَقبِض ، قَبْضًا ، فهو قابِض ، والمفعول مَقبوض.

قبَضَ الدّواءُ أمعاءَه.

دەرمانەكە ريخۆڵەكانى توشى قەبزيكرد.

1689 أغضبه تعبير مبتذل.

گوزارشتێكى سوك تورەيكرد.

1690 قرأتُ لكاتب يبتذل الأدب فعلمت أنّه ليس أديبًا.

بابەتێكى نوسەرێكم خوێندەوە كە تێيدا ئەدەب سوكدەكات، لەوەوە زانيم كە ئەو نوسەرە ئەديب نيە.

1691 رادەستكرد= تەسليمكرد.

قبَّض البائعَ ثمن السِّلعة.

بەهاى كاڵاكەى رادەستى فرۆشيارەكە كرد.

سلَّم نفسَه للشّرطة.

(أزرى)، (أزرى بـ) هەردوكيان سوككرد[1692]

**.680** (تقبَّضَ) چيە؟ واتە چرچبوو[1693]

(سريعُ الخاطر) ماناى گورجدوو[1694]

**.681** (قُبضَ) واتە مرد، كەوتەگيانەڵا[1695]

(تشبَّكَ)يە ماناى لێكئاڵا[1696]

**.682** (قَبْضَة) واتە مشت، وەك (مِقْبَض)يش دەسك[1697]

(زاندان) بەماناى دوو ئێسكى باسك[1698]

---

خۆى رادەستى پۆليس كرد.

1692 أزرى مقالته.

وتارەكەى سوككرد.

أزرى المريض بنصائح الطبيب.

نەخۆشەكە ئامۆژگارييەكانى پزيشكەكەى سوككرد.

1693 تقبَّض جلده بسبب الشيخوخة.

پێستى بەهۆى پيرييەوە چرچبوو.

1694 گورجدوو: كەسێكى زيرەك كە هەميشە وەڵامى ئامادەبێت و خێرا وەڵامبداتەوە.

المدرس سريع الخاطر، لا أستطيع مجادلته.

مامۆستاكە گورجدووە، ناتوانم چەلەحانێى لەگەڵدا بكەم.

1695 قُبِض المريض بعد صراع طويل من المرض.

پاش ململانێكى زۆر لەگەڵ نەخۆشى، نەخۆشەكە مرد.

قُبِض السائق بسبب الحادث ولكنه نجا من الموت.

بەهۆى رووداوەكەوە شۆفێرەكە كەوتەگيانەڵا بەڵام لەمردن رزگاربيبوو.

1696 لێكئاڵا= تێكئاڵا.

تشبّكت الأسلاك الكهربائية.

وايەرە كارەباييەكان لێكئاڵان.

1697 واتە (قَبْضَة) بەماناى مشت دێت، هەروەها هاوماناى (مِقْبَض)يشە كە بەماناى دەسك دێت.

أعطى السائل قَبْضَة من أرز.

مشتێك برنجى دا بە دەرۆزەكەر "سواڵكەر"ەكە.

قَبْضَة بابه من الذهب.

دەسكى دەرگاكەى لەئاڵتونە.

**.683** (مَقْبَض)و (مَقْبِض) هەردوكیان دەسكە[1699]

(حَبَّةُ البَرَكة) وەك (شُونیز) رەشكە[1700]

**.684** (قُنْفُذ) ژیشكە، كۆكەی (قَنافِذ)[1701]

(غَریم)و (دائِن) هەردوو خاوەنقەرز[1702]

**.685** (ألقى القبضَ على) واتە دەستگیركرد[1703]

(عبَّسَ)، (كلَّحَ)، (قبَّض) گرژكرد[1704]

---

[1698] هل عندك أية معلومات عن الزاندين؟

ئایا هیچ زانیارییەكت هەیە سەبارەت بە دوو ئێسكی باسك؟

[1699] مَقْبَض السيف صَدِئ.

دەسكی شمشێرەكە ژەنگاوییە.

لا تلمس مَقْبِض السكين.

دەستمەدە لەدەسكی چەقۆیەكە.

[1700] لحبة البركة فوائد عديدة.

رەشكە چەندین سودی هەیە.

هل أكلت الشونيز؟

رەشكەت خواردووە؟

[1701] القنفذ يسرح في الليل وينام في النهار.

ژیشك بە شەودا دەگەڕێت و بە رۆژدا دەخەوێت.

[1702] قتل غريمه بعد سجال على الدين.

پاش دەمەقاڵەیەك لەسەر قەرز، خاوەنقەرزەكەی كوشت.

الدائن لا ترجع ديونه اليه بسهولة.

خاوەنقەرز قەرزەكانی بە ئاسانی بۆ ناگەڕێتەوە.

[1703] ألقت الشرطة القبضَ على اللص.

پۆلیس دزەكەی دەستگیركرد.

[1704] عبَّس وجهَه عند رؤية آثار الجريمة.

لەكاتی بینینی شوێنەواری تاوانەكە، دەموچاوی گرژكرد.

كلَّح الهمُّ وجهَه.

خەفەت دەموچاوی گرژكرد.

قبَّض وجهَه ليعبِّر عن غضبه.

**.686** (تملَّقَ) واته ماستاویکرد بۆ[1705]

(غِلْمة) خزمەتکار، بەڵام تاك نا كۆ[1706]

**.687** (مِسْبار) ئامێره، هی پشکنینه[1707]

(سَرّاج) سانیع و بائیعی زینه[1708]

**.688** (واقِعة) جەنگە، هەروەها روداو[1709]

(مَسْتور) داوێنپاك، لەگەڵ داپۆشراو[1710]

---

بۆ گوزارشتکردن لەتوڕەیی، دەموچاوی گرژکرد.

[1705] تملق مديره.

ماستاوی بۆ بەڕێوەبەرەکەی کرد.

[1706] تاکەکەی (غُلام)ه. به (أغْلِمَة)و (غِلمان)یش كۆدەكرێتەوه.

دفع لغلامه أجرَه.

کرێکەی دا به خزمەتکارەکەی.

[1707] بەمانای ئامێری پشکنین دێت. ئامێری پشکنین= پشکنەر.

مِسبار الأعماق جهاز مدهش.

پشکنەری قوڵی، ئامێرێکی سەرسوڕهێنه.

[1708] بەمانای سانیعی زین و بائیعی زین دێت.

سانئیعی زین= زیندروو: زیندروستکەر.

بائیعی زین= زینفرۆش.

كان والدي سَرّاجاً ماهراً.

باوکم زیندروویەکی کارامه بوو.

كان السراج رجلاً غاضباً.

زینفرۆشەکه پیاوێکی توڕه بوو.

[1709] هل تعلم أنَّ السلطان العثماني مراد الأوَّل هو الوحيد من بين سلاطين آل عثمان الذي قُتل في معركة، وذلك في واقعة قوصوه سنة 791هـ الموافقة لسنة 1389م؟

ئایا دەزانیت سوڵتان مورادی یەکەم، تەنها سوڵتانی بنەماڵەی عوسمانه که لەجەنگدا کوژرابێت، ئەویش لەجەنگی قوسوەدا بوو (کۆسۆڤۆی ئێستا)، لەساڵی 791ی کۆچی بەرامبەر 1389ی زاینی.

قتل الثائر في واقعة مأساوية.

شۆڕشگێرەکه لەڕوداوێکی تراژیدیدا کوژرا.

[1710] زوجها رجلٌ مستور لا ينظر الى المرأة.

**.689** (دفَنَ) واته ناشت، چاوگەکەی (دَفْن)ە[1711]

(قَوام)و (قامَة) هەردوکیان بەژنە[1712]

**.690** (سمُلَ) کۆنبوو، (یَسمُل) کۆندەبێ[1713]

(یَصلِم) بەمانای لەبنادەبڕێ[1714]

**.691** (أسملَ) کۆنبوو[1715]، (سَمِیل) واتە کۆن[1716]

(هاتِف)، (تِلیفون) هەردوو تەلەفۆن[1717]

---

مێردەکەی پیاوێکی داوێنپاکە، سەیری ژن ناکات.

عیوبك مستورة من الله.

کەموکورتییەکانت لەلایەن خوداوە داپۆشراون.

[1711] من رأى في المنام أنه میت، وقد دفن فإنه یسافر سفراً بعیداً ولا یجد مالاً.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی مردووەو نێژرا، ئەوە گەشتێکی دوور ئەنجامدەدات و پارەی دەستناکەوێت.

[1712] حبیبته فتاة لها قوام جذاب.

خۆشەویستەکەی کچێکە کە بەژنێکی سەرنجڕاکێشی هەیە.

لیس لقامة الإنسان أي ربط بشخصیته.

بەژنی مرۆڤ هیچ پەیوەندییەکی بە کەسایەتییەوە نیە.

[1713] سمُل ثوبه ولکنه لم یستطع شراء ثوب جدید.

جلوبەرگەکەی کۆنبوو، بەڵام نەیتوانی جلوبەرگی تازە بکڕێت.

[1714] رابردووەکەی (صلَمَ)یە.

لەبنادەبڕێ= لەبنادەبڕێت.

صلَم تنظیم داعش أذنَه.

ڕێکخراوی داعش لوتی لەبنابڕی.

[1715] أسملَ قمیصه بسرعة.

کراسەکەی خێرا کۆنبوو.

[1716] فستانك سمیل، سوف أشتری لك فستاناً جدیداً.

عەزییەکەت کۆنە، عەزییەکی تازەت بۆ دەکڕم.

[1717] اتصل بالهاتف.

بە تەلەفۆن پەیوەندی بکە.

تُنجَز الکثیر من الأعمال بواسطة التلیفون.

زۆرێك لەکارەکان بە تەلەفۆن جێبەجێدەکرێن.

**.692** (صَفَر) چيه؟ سفريهێنا[1718]

(سمَلَ عينَهُ) چاويدەرهێنا[1719]

**.693** (أصمتَ) بێدەنگكرد[1720]، (صمتَ) بێدەنگبوو[1721]

(داخَ) بەمانای توش سەرەخولێبوو[1722]

**.694** (مَكان)، (مَطرَح) شوێن، دووەم نزيك نا[1723]

(صلَمَ) مانای بڕی لەبنا[1724]

**.695** (مُستَهَلّ) چيه؟ سەرەتايه[1725]

---

1718 صَفَر الطالب الكسول.

خوێندكاره تەمبەڵەكه سفريهێنا.

1719 عذّبه آسِروه وسمَلوا عينه.

ئەوانەی بەديليان گرتبوو، ئەشكەنجەياندا‌و چاوياندەرهێنا.

1720 أصمت العالمُ الجاهلَ.

زاناكه نەزانەكەی بێدەنگكرد.

1721 صمَتَ يَصمُت ، صَمْتًا وصُمُوتًا وصُماتًا ، فهو صامِت.

قال أحد الفلاسفة  الكتب سعادة الحضارة، بدونها يصمت التاريخ ويخرس الأدب ويتوقف العلم ويتجمد الفكر والتأمل.

يەكێك لەفەيلەسوفەكان دەڵێت، كتێب بەختەوەريی شارەستانييەتە، بەبێ كتێب مێژوو بێدەنگدەبێت و وێژه لاڵدەبێت و زانست دەوەستێت و بيرو تێڕامان دەيبەستێت.

1722 توش سەرەخولێ بوو= توشی سەرەخولێ بوو= توشی سەرەسوڕێ بوو.

داخ عندما نظر من مكانٍ مرتفع.

كاتێك لەشوێنێكی بەرزەوه سەيريكرد، توشی سەرەسوڕێ بوو.

1723 مەخسەوی شەريفم لەم نيوەبەيتە ئەمەيه: ئەو دوو وشەيه هەردوكيان بەمانای شوێن دێن، يەكەميان بەمانای شوێن دێت بەگشتی، بەڵام دووەميان بەمانای شوێن دێت كه نزيك نەبێت، واته بەمانای شوێنێك دێت كه دوور بێت.

يستحيل على المرء أن يُوجد في مكانين معًا في آن واحد.

مەحاڵه مرۆڤ لەيەك كاتدا لەدوو شوێندا بێت.

هاجر فلم يجد سوى ذاك المطرح.

كۆچيكردو لەو شوێنه زياتری نەدۆزييەوه.

1724 بڕی لەبنا= لەبنا بڕی.

صلَم أذنَه لسبب تافه.

لەبەر هۆيەكی بێبايەخ گوێچكەی لەينابڕی.

(تُفّاحة آدم) بینەقاقایە[1726]

**.696** (اصفرَّ) چیە؟ زەردهەڵگەڕا[1727]

(فادِح) گەورەیە[1728]، (فادِحة) بەڵا[1729]

**.697** (وازِع) ڕێگرە، بەس هێنی ناوۆ[1730]

(أشراف) ئابڕووە، بەڵام تاك نا كۆ[1731]

**.698** (مشَى) واتە ڕۆشت[1732]، (مَشْي)یە ڕۆشتن[1733]

---

1725 مُسْتَهَلُّ العَمَلِ كان صعباً.

سەرەتای كارەكە قورس بوو.

1726 تُفَّاحة آدمك كبيرة جداً.

بینەقاقات زۆر گەورەیە.

1727 اصفرَّ وجهُه من الخوف.

دەموچاوی زەردهەڵگەڕا لەترسا.

1728 تَعَرَّضَ لِضَرَرٍ فَادِحٍ.

توشی زیانێكی گەورە بوو.

1729 جمع فادحات وفوادحُ.

كان مقتله فادِحة كبيرة للجميع.

كوژرانی بەڵایەكی گەورە بوو بۆ هەموان.

1730 بەمانای ڕێگر (ی ناوۆ) دێت. ڕێگری ناوۆ= ڕێگری ناوەوە: ئەو ڕێگرە هەناوییانەی نایەڵن ڕەفتارێكی دیاریكراو ئەنجامبدەیت.

بسبب وازعه الديني لم ينتقم من القاتل.

بەهۆی ڕێگرە ئاینییەكەیەوە، تۆڵەی لەبكوژەكە نەكردەوە.

1731 تاكەكەی (شَرَف)ە.

لا يكتم السر إلا من له شرف *** والسر عند كرام الناس مكتوم.

تەنها ئەو كەسانە نهێنی دەپارێزن كە ئابڕوویان هەیە*** نهێنی لەلای كەسانی بەڕێز شاراوەیە.

1732 مشَى يَمشِي، امْشِ، مَشْيًا، فهو ماشٍ.

اذا رأيتم رجلاً يمشي على الماء. ويطير في الهواء, فلا تغترّوا به, حتى تعرضوا أمره على الكتاب والسنة.

ئەگەر پیاوێكتان بینی بەسەر ئاودا دەڕوات و لەناو هەوادا دەفڕێت، فریوی پێمەخۆن تا كارەكەی نەخەنە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت.

1733 المشي في الصباح بمعدة خالية مفيد للصحة.

ڕۆشتن لەبەیانیاندا بە گەدەی بەتاڵەوە بەسودە بۆ تەندروستی.

(إستحمام) حەتمەن مانای خۆشتن[1734]

**699.** (طافَ) چیە؟ سوڕایەوە[1735]

(اِرتَدَّ) مانای هەڵگەڕایەوە[1736]

**700.** (رعُفَ)و (رعِفَ) لوتی پژا[1737]

(تأقلمَ)یە بەمانای گونجا[1738]

**701.** (غَلِمَ) چیە؟ زەوقی هەستا[1739]

(توقَّفَ)یە بەمانای وەستا[1740]

**702.** (أدركَ) باڵقبوو، لەگەڵ تێگەیشت[1741]

---

1734 چاوگی (استحمَّ)یە.

الإستحمام في البحر له طعم خاص.

خۆشتن لەناو دەریادا تامێکی تایبەتی هەیە.

1735 طافَ يَطُوف، طُفْ، طَوَافًا وطَوَفانًا وطَوْفًا وتطوافًا، فهو طائِف.

يطوف الحجّاجُ حول الكعبة.

حاجییان بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە.

1736 ارتدَّ يرتدّ، ارتدِدْ، ارتَدَّ، ارتِدادًا، فهو مُرتَدّ، والمفعول مُرتَدٌّ عنه.

ارتدَّ عن الاسلام فقتل بعد شهرين.

لەئیسلام هەڵگەڕایەوە، بۆیە دوای دوو مانگ کوژرا.

1737 رعُفَ الطفل بسبب الشمس.

منداڵەکە بەهۆی خۆرەوە لوتی پژا.

رعِفَ المريض بعد العملية الجراحية.

نەخۆشەکە پاش نەشتەرگەرییەکە لوتی پژا.

1738 تأقلم الرجل مع البيئة الجديدة.

پیاوەکە لەگەڵ ژینگە تازەکەدا گونجا.

1739 غَلِمَ غَلَمًا، وغُلْمَةً فهو غَلِمٌ، ومِغْليم، وهي غَلِمةٌ، ومِغليم.

غَلِمَ الرجل بعدما رأى فتاة شبه عارية.

پاش ئەوەی کچێکی نیمچەڕوتی بینی، پیاوەکە زەوقی هەستا.

1740 توقَّف القطار في المحطّة.

شەمەندۆفێرەکە لەوێستگەکەدا وەستا.

1741 أدرك الصَّبيُّ.

(جنَّب) مانای بەپاڵیا ڕۆیشت[1742]

**.703** (هبِلَ) شێتبوو، چاوگەکەی (هَبَل)[1743]

(خاطَرَ) واتە گرەویکرد لەگەڵ[1744]

**.704** (سمَلَ) کۆنبوو[1745]، (یَسمُل) کۆندەبێت[1746]

(أهبلَ) شێتبوو[1747]، (أَهْبَلْ) گێل و شێت[1748]

**.705** (حَصافة) چیە؟ واتە دانایی[1749]

(دَمَوِيّ) خوێناوی[1750]، (دِیَة) خوێنبایی[1751]

---

منداڵەکە باڵقبوو.

أدركت ما في قلب صديقها.

لەوە تێگەیشت کە لەدڵی هاوڕێکەیدایە.

[1742] جنَّب بسيّارته القطارَ.

بە ئۆتۆمبێلەکەی بەپاڵ شەمەندۆفێرکەدا ڕۆیشت.

[1743] هبِل الرَّجلُ بعد موت زوجته.

پاش مردنی ژنەکەی، پیاوەکە شێتبوو.

[1744] خاطر صديقه قبل اللعبة.

پێش یارییەکە گرەوی لەگەڵ هاوڕێکەیدا کرد.

[1745] سمَل الثَّوبُ بسرعة.

پۆشاکەکە خێرا کۆنبوو.

[1746] القميص الرخيص يَسمُل بعد غسلة واحدة.

کراسی هەرزان، پاش یەك شۆردن کۆندەبێت.

[1747] أهبلَ الرَّجلُ بعد فقدان أمه.

پیاوەکە پاش لەدەستدانی دایکی، شێتبوو.

[1748] بەمانای گێل و شێتیش دێت.

لا تجادل الأهبل.

چەلەحانی لەگەڵ گێلدا مەکە.

للأهبل مكانة عالية في الجنة.

شێت پێگەیەکی بەرزی هەیە لەبەهەشتدا.

[1749] عُرِف الرَّئيس الرَّاحل بشعوره الوطنيّ وحصافته السِّياسيّة.

سەرۆکی کۆچکردوو بە هەستی نیشتمانی و دانایی سیاسی ناسرابوو.

**.706** (مَجَرَّة) چيه؟ گەلەئەستێره[1752]

(غَشُوم) ستەمکار، مێیە، هەم نێره[1753]

**.707** (أفّاق)و (جَوّاب) هەردوو گەڕیده[1754]

(مِعضاد) تەوراس، کێرد، کۆی (معاضید)ه[1755]

**.708** (مِداد) مەرەکەب، نەوت(ی چرایه)[1756]

---

[1750] كان عَهْدٌ صدام المقبور دَمَوِيّاً.

سەردەمی سەدامی گۆڕبەگۆڕ خوێناوی بوو.

[1751] ما هي دِيَة رجل مقتول خَطَأً في الإسلام؟

خوێنبایی پیاوێکی بە هەڵەکوژراو، لەئیسلامدا چیە؟

[1752] المَجَرَّة دليل واضح على وجود الله.

گەلەئەستێرە بەڵگەیەکی روونە لەسەر بونی خودا.

[1753] واتە ئەم وشەیە بەمانای ستەمکار دێت و داڕشتەی نێرو مێشی هەمان شتە.

نێر:

كان صدام حاكماً غشوماً لا مثيل له.

سەدام ستەمکارێکی بێوێنە بوو.

مێ:

عشيقة هتلر لم تكن غشوماً.

دڵدارەکەی هیتلەر ستەمکار نەبوو.

[1754] جاء رَجُلٌ أفَّاق يسأل عن تأريخ المدينة.

پیاوێکی گەڕیدە هات پرسیاری لەمێژووی شارەکە دەکرد.

شقيقي صحفيّ جوّاب.

براکەم رۆژنامەنوسێکی گەڕیدەیە.

[1755] استخدم المعضاد لتجميل الشجرة.

تەوراسەکە بەکاربهێنە بۆ جوانکردنی درەختەکە.

لا تضع المعضاد قرب الطفل.

کێرد لەنزیك منداڵ دامەنێ.

[1756] جمع أَمِدَّة.

{قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي}

بڵێ ئەگەر دەریا مەرەکەب بوایە بۆ قسەکانی پەروەردگارم، ئەوا پێش ئەوەی قسەکانی پەروەردگارم تەواوببێت، دەریاکە تەواودەبوو.

لمداد السراج رائحة كريهة.

(اصفارَّ) ماناى (زەردهەڵگەڕا)يە[1757]

**.709** (غمّازة) ماناى چاڵى رومەتە[1758]

(بَيْتُ القصيد)ە پوختەى بابەتە[1759]

**.710** (نُعْرَة) خەرەنگەز، تڕوفيزو لوت[1760]

(شَرْط) واتە مەرج، جەمعەكەى (شُروط)[1761]

**.711** (طرَحَ) لێدەركرد، هينەكەى (يطرَح)**[1762]**

**(طَالِح)** خراپەكار، جەمعەكەى **(طُلَّح)[1763]**

---

نەوتى چراكە بۆنێكى ناخۆشى هەيە.

[1757] اصفارَّ يصفارّ، اصْفارِرْ/ اصْفارَّ، اصفيرارًا، فهو مُصفارّ.

اصفارَّ الطفل بسبب المرض.

منداڵەكە بەهۆى نەخۆشييەوە، زەردهەڵگەڕا.

[1758] للفتاة غمّازتان تزيدان في جمالها حين تبتسم.

كچەكە دوو چاڵى رومەتى هەيە كە لەكاتى زەردەخەنەدا جوانييەكەى زياددەكەن.

[1759] هل فهمت بيت القصيد؟

لەپوختەى بابەتەكە تێگەيشتيت؟

[1760] جمع نُعرات ونُعَر.

بەماناى (خەرەنگەز)و (تڕوفيز ""لوتبەرزى)و لوتيش دێت.

خەرەنگەز: مێشەسەگانە.

دخلت النُّعرةُ في خيشومه.

خەرەنگەزەكە چووە ناو لوتييەوە.

قتلته نُعْرة قبلية.

تڕوفيزى هۆزگەرايى كوشتى.

نُعْرَةُ الثَّور أكبر من نظيرتها البقرية.

لوتى گا لە هى مانگ گەورەترە.

[1761] العملُ شرط النجاح.

كاركردن مەرجى سەركەوتنە.

[1762] مەخسەوى شەريفم لەوشەى هينەكەى، بريتييە لەڕانەبردووەكەى.

طرَحَ العدد الصغير من الكبير.

ژمارە بچوكەكەى لەگەورەكە دەركرد.

712. (سَمَلْ) واته کۆن، جەمعەکەی (أسمال)[1764]

جیابونەوەیە، مانای (اِنفصال)[1765]

713. (خاطرَ بـ) خستە مەترسییەوە[1766]

(طرَح عنه) لێی دورخستەوە[1767]

714. (نزَلَ) دابەزی[1768]، (نزّلَ) دابەزان[1769]

(قَین) واتە کۆیلە، کۆی (أقْیان)، (قِیان)[1770]

---

[1763] بێگومان بە (طالحون)یش کۆدەکرێتەوە.

الثناء یزید الصَّالحین صلاحًا والطَّالحین سوءًا.

ستایشکردن چاکەکار چاکتردەکات و خراپەکاریش خراپتر.

[1764] إعطاء الثوب السَمَل خیرٌ من عدم إعطاءه.

بەخشینی جلوبەرگی کۆن لەنەبەخشینی باشترە.

[1765] چاوگی (إنفَصَلَ)یە.

الوداع لا یقع إلا لمن یعشق بعینیه، أما ذاك الذي یحب بروحه وقلبه فلا ثمة انفصال أبداً. جلال الدین الرومي.

ماڵئاواییکردن تەنها لای ئەو کەسە رودەدات کە تەنها بە چاو عاشق دەبێت، بەڵام ئەوەی بە گیان و دڵ خۆشەویستی دەکات، هەرگیز جیابونەوەی تێدا رونادات.

[1766] خاطر بحیاته من أجل صدیقه.

ژیانی لەپێناو هاورێکەیدا خستەمەترسییەوە.

[1767] طرَح عنه الحزن بنکتة قویة.

بە نوکتەیەکی بەهێز، خەفەتەکەی لێ دورخستەوە.

[1768] نزَلَ یَنزِل، نُزُولاً، فهو نازِل.

من رأى في المنام أَن الله نزل فِي أَرض أَو فِي بلد فَإِن الْعدْل یَشْمَل ذَلِك الْمَكَان وَیدل على الخصب لأَهْلهَا فَإِن كَانُوا ظالمین حلت بهم النقمَة.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی خودا لەخاکێك یان وڵاتێك دابەزی، ئەوە دادوەری ئەو شوێنە دەگرێتەوەو ئاماژەیە بۆ خێرو بەرەکەت بۆ خەڵکەکەی، خۆ ئەگەر خەڵکەکە ستەمکار بون، ئەوە توشی بەڵا دەبن.

[1769] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "دابەزان"، بریتییە لە دابەزاند، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە، نونەکەم لابردووە.

نزّل الصغیرَ من فوق الدّراجة.

منداڵە بچکۆلەکەی لەسەر پاسکیلەکە دابەزاند.

[1770] هەروەها بە " قُیُون"یش کۆدەکرێتەوە.

کان القین ولداً مزعجاً.

.715 (ينزِلُ) چيه؟ سازشدەكات[1771]

(طَرْحَة) واته لەچك، جەمعەكەی (طَرْحَات)[1772]

.716 (يَنزِل) بەمانای دەمێنێتەوە

"دەبارێت"يشەو دەنيشێتەوە[1773]

.717 (نزَل بِهِ) واته توشيبوو[1774]

(طِرْح) كۆرپەيە، بەڵام لەبارچوو[1775]

.718 (أرفدَ)، (رفَدَ) يارمەتيدا[1776]

---

كۆيلەكە كوڕێكی بێزاركەر بوو.

[1771] رابردووەكەی "نزَلَ"يە.

نزَل عن حقّه لوجه الله.

لەبەر خاتری خودا سازشی لەمافی خۆی كرد. واته وازی لێهێنا.

[1772] هەروەها بە "طَرَحات"و "طِرَاح"و "طُرَح"يش كۆدەكرێتەوە.

لەچك= سەرپۆش.

لبست العروسة الطرحة في حفل زفافها.

بوكەكە لەئاهەنگی هاوسەرگيرييەكەيدا لەچكەكەی كردەسەری.

[1773] رابردووەكەی (نزَلَ)يە.

نزل في الفندق.

لەميوانخانەكە مايەوە.

نزَل المطرُ طوال النهار.

بەدرێژايی رۆژەكە باران باری.

نزلتِ الطَّائرةُ في المطار.

فڕۆكەكە لەفڕۆكەخانەكە نيشتەوە.

[1774] نزَلت به مصيبة كبيرة.

توشی بەڵايەكی گەورە بوو.

[1775] بەمانای كۆرپەی لەبارچوو دێت.

كان طِرْح الشاة صغير الحجم.

كۆرپە لەبارچووەكەی بزنەكە قەبارەی بچوك بوو.

[1776] نحن بحاجة إلى من يُرفدنا بالعلم والمال في بداية حياتنا.

ئێمە پێويستمان بەوەيە كە لەسەرەتای ژيانماندا بە زانست و سامان يارمەتيمان بدات.

(ارتكبَ)يە مانای ئەنجامدا[1777]

**.719** (كَبير) سەرۆكە، هەروەها گەورە[1778]

سەرەتاو ناوچەوان، دەمڕاستیش (غُرَّة)[1779]

**.720** (تَكبير) ئەڵڵاهو ئەكبەر وتنە[1780]

(تَخفيض) ماناكەی داشكاندنە[1781]

**.721** (هِواية) خوليا، واتە ئارەزوو[1782]

---

رفَد الغني السَّائلَ.

دەوڵەمەندەكە يارمەتيی دەرۆزەكەرەكەی دا.

1777 من رأى في المنام أَن الله تَعَالَى على غير مَا وصف بِهِ من صِفَات الْكَمَال فَإِنَّهُ يرتكب أمرا بَاطِلا من بِدعَة أَو غَيرهَا.

ئەگەر كەسێك لەخەودا خودای بەشێوەيەكی جياواز لەوەسفی خۆی كە بێكەموكورتييە، بينی، ئەوە ئەو كەسە كارێكی ناڕاست ئەنجامدەدات وەك بيدعە يان شتی تر.

1778 جمع كِبار وكُبراءُ، مؤ كبيرة، جمع مؤ كبيرات وكبائِرُ (لغير العاقل).

غضب كبير الأطباء بسبب الإهمال الذي أدى الى وفاة المريض.

بەهۆی ئەو كەمتەرخەمييەی بووەهۆی مردنی نەخۆشەكە، سەرۆكی پزيشكەكان توڕەبوو.

إستطاع أن يرفع صندوقاً كبير الحجم .

توانی سندوقێكی قەبارە گەورە بەرزبكاتەوە.

1779 جمع غُرَر

كانت غُرَّة الشهر الماضي مليئة بالأحداث.

سەرەتای مانگی رابردوو پڕ بوو لەڕوداو.

غُرَّة الرَّجل بيضاء.

ناوچەوانی پياوەكە سپييە.

والدي غرة المنطقة.

باوكم دەمڕاستی ناوچەكەيە.

1780 چاوگی (كبَّرَ)يە.

كبَّر المُصلّي.

نوێژخوێنەكە ئەڵڵاهو ئەكبەری كرد (ئەڵڵاهو ئەكبەری وت).

1781 جمع تخفيضات

السوق مليء بالناس في موسم التَّخفيضات الشِّتويّة.

لەوەرزی داشكاندنە زستانييەكاندا بازاڕ پڕە لەخەڵك.

(اِمْتَلأَ)و (فَاضَ)، (غصَّ)ش هەر پڕبوو[1783]

**.722** (شَنّة) پیرەژن، هەروەها دێرین[1784]

(غصَنَ) بڕییەوە، هینەکەی (یَغصِن)[1785]

**.723** (غُصّة) خەفەت و ئازار، کۆی (غُصَص)[1786]

بزانە (عُطاس) بکەری (عطَس)[1787]

**.724** (نزَل) چیە؟ سازشیکرد[1788]

---

[1782]هوايتى جمع الطَّوابع البريديَّة.

کۆکردنەوەی پولی پۆستە، ئارەزووەمە (خولیامە).

[1783] هەرسێکیان بەمانای "پڕبوو" دێن.

امتلأتِ القاعةُ بالمشاهدين.

هۆڵەکە پڕبوو لەبینەر.

فاضَ الإناءُ.

دەفرەکە پڕبوو.

غصَّتِ القاعةُ بالضيوف.

هۆڵەکە بە میوان پڕبوو.

[1784] عمر الشَنّة طويل.

تەمەنی پیرەژنەکە درێژە.

البيت شنة يرجع الى عصر العباسيين.

ماڵەکە دێرینەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عەباسییەکان.

[1785] مەبەستم لەهینەکەی بریتییە لە "رانەبردووەکەی". واتە ئەم دوو وشەیە کاری رابردوو و رانەبردون.

غصَنَ أغصانَ الشجرة الصغيرة.

لقە بچوکەکانی درەختەکەی بڕییەوە.

[1786] رحلت يا أبتي وتركت غصة في قلبي لا تموت.

بابەگیان رۆیشتیت و خەفەتێکی نەبڕاوەت لەدڵمدا جێهێشت.

في حلْقِه غُصَّةٌ.

گەرووی ئازارێکی تێدایە.

[1787] واتە ئەم وشەیە بکەری (عطَس)یە کە بە مانای پژمی دێت. کەواتە (عُطاس)بەمانای کەسێك دێت کە دەپژمێت.

يجب على العطاس أن لا يغلف عينيه أثناء العطس.

ئەو کەسەی دەپژمێت پێویستە لەکاتی پژمینەکەدا چاوی دانەخات.

(أغصنَ)، (غصّنَ) هەردوو لقیکرد[1789]

**.725** (اتِّفاق) چیە؟ واتە رێککەوتن[1790]

(عرَجَ) سەرکەوت، (عُروج) سەرکەوتن[1791]

**.726** (عرَجَ) شەلی، (عَرَج)یش شەلین[1792]

(تَلِید) رەسەنە، هەروەها دێرین[1793]

**.727** (فَرُّوج) جوجکە، کۆکەی (فراریج)[1794]

---

1788 نزَلَ ينزِل، نُزُولاً.

نزل عن حقه.

سازشی لەمافەکەی خۆی کرد.

1789 أغصنتِ الشَّجرةُ.

درەختەکە لقیکرد.

غصّنَت الشجيرة في فصل الربيع.

نەمامەکە لەوەرزی بەهاردا لقیکرد.

1790 الاتفاق السياسيّ خير من الحرب.

رێککەوتنی سیاسی لە جەنگ باشترە.

1791 کارو چاوگن.

عرَج على الجبل حتَّى وصل إلى القمّة.

بەسەر شاخەکەدا سەرکەوت تا گەیشتە لوتکەکە.

1792 کارو چاوگن. هەروەها بە "عَرَجان"یش دەبێت بە چاوگ.

عرَج الرَّجُلُ.

پیاوەکە شەلی.

1793 جمع أتلاد وتُلَداءُ، مؤ تليد وتليدة، جمع مؤ تليدات وتلائد وتُلُد.

يفتخر بِعرقه التَلِيد.

شانازی بە رەگەزە رەسەنەکەیەوە دەکات.

كهف شاندر في كردستان تليد جداً.

ئەشکەوتی شانەدەر لەکوردستان زۆر دێرینە.

1794 بەدیاریکراوی بەمانای جوجکەی مریشك دێت.

يحبُّ الأطفال اللَّعب مع الفراريج.

منداڵ حەزدەکات یاری لەگەڵ جوجکەدا بکات.

شەل ماناكەی (أعرَج)و (عارِج)[1795]

**728.** (عرَّج على) سەردانيكرد[1796]

(جنَى) ئەنجامدا، هەم تاوانيكرد[1797]

**729.** (حاصرَ) چيە؟ ئابلۆقەدا[1798]

(انعرجَ)يە بەماناى لايدا[1799]

**730.** (عُرْجون) هێشووە، بەس هى خورمايە[1800]

(تشوَّشَ)يە ماناى (شێوا)يە[1801]

**731.** (حَزَازة) واتاى "رق و قين"و داخ[1802]

---

[1795] الأعرج لا يستطيع الهروب.

شەل ناتوانێت رابكات.

لا تقلد العارج.

لاسايى شەل مەكەرەوە.

[1796] عرَّج على منزل عمِّه وهو في طريقه إلى القرية.

لەڕێگايدا بۆ گوندەكە، سەردانى ماڵى مامى كرد.

[1797] جنَى يجني،اجْنِ، جِنايةً، فهو جانٍ.

جنَى الشاب بعد تركه للمسجد.

پاش وازهێنانى لەمزگەوت، گەنجەكە تاوانيكرد.

جنَى جناية خطيرة بعد إفلاسه.

پاش مايەپوچبونى، تاوانێكى مەترسيدارى ئەنجامدا.

[1798] حاصرت قوّاتُ الجيش مواقعَ المتمرِّدين.

هێزەكانى سوپا شوێنەكانى ياخيبووەكانيان ئابلۆقەدا.

[1799] انعرج الطَّريقُ بعده مدة قليلة من السياقة.

پاش ماوەيەكى كەم لەلێخوڕين، رێگاكە لايدا. واتە راستييەكەى نەما.

[1800] جمع عَراجين.

بەماناى هێشووى خورما دێت.

كم هو سعر عرجون تمر في البصرة؟

نرخى هێشوويەك خورما چەندە لە بەسرە؟

[1801] تشوَّش عليه الأمرُ.

كارەكەى لێ شێوا.

(وحيدُ القَرْن)و (كَرْكدَّن) يەكشاخ[1803]

**[.732](#)** (صدّق) چيه؟ باوەڕپێكرد[1804]

(صدق) راستیوت[1805]، (كذب) درۆيكرد[1806]

**[.733](#)** (غذاء) خۆراكە، كۆكەى (أغذية)[1807]

(أمومة)ش ماناى دايكايەتييە[1808]

**[.734](#)** (اختار) چيه؟ واتە هەڵبژارد[1809]

---

1802 بەماناى "رق و قين"و "داخ" دێت.

يهتمَّ النَّاس بحزازاتهم الشَّخصيَّة أكثر من اهتمامهم بالخطر المحدق بوطنهم.

خەڵك ئەوەندەى گرنگى بە رق و قينى كەسى دەدەن، ئەوەندە گرنگى بەو مەترسيیە نادەن كە چاوى بڕيوەتە نيشتمانەكەيان.

تعذبه حزازة عدم مساعدة الغريق بإستمرار.

داخى يارمەتينەدانى نقومبووەكە هەميشە ئازاريدەدات.

1803 يەكشاخ: گياندارێكى قەبارگەورەى پێستئەستورەو سەرلوتى شاخێكى پێوەيە.

هل تعلم أن قرن وحيد القرن مكون بشكل أساسي من بروتين يسمى كراتين وهو المادة التي يتكون منها شعر الإنسان وأظافره!

ئايا دەزانيت شاخى يەكشاخ بەشێوەيەكى بنچينەيى لەپرۆتينێك دروستبووە كە پێيدەووترێت كيراتين، كە هەمان ئەو ماددەيەيە كە موو و نينۆكى مرۆڤى لێ پێكدێت!

ليس الكركدن حيوانًا اجتماعيًا.

يەكشاخ گياندارێكى كۆمەڵايەتى نيه.

1804 صدَّقَ القاضي كلامه.

دادوەرەكە بڕواى بە قسەكانى كرد.

1805 صدَقَ يصدُق، صِدْقًا ، فهو صادِق.

كان يصدُق دائمًا.

هەميشە راستيدەووت.

1806 كذَبَ يَكذِب ، كِذْبًا وكَذِبًا وكِذابًا وكِذْبةً وكِذّابًا ، فهو كاذب.

من يكذب في الرؤيا يكلّف يوم القيامة عقد شعيرتين.

هەركەسێك درۆبكات لەخەودا ئەوە رۆژى دوايى داواى لێدەكرێت دوو دەنكە جۆ پێكەوە گرێبدات.

1807 القراءة غذاء الروح.

خوێندنەوە خۆراكى گيانە.

1808 الأُمومة أعظمُ هبة خصَّ الله بها النساء.

دايكايەتى گەورەترين بەخششە كە خودا تايبەتى كردووە بە ژنان.

(برد) ساردبوو، (بارد) ماناى سارد[1810]

**.735** (حرم) بێبەشكرد، چاوگەكەى (حرمان)[1811]

(وطن)و (موطن) هەردوو نیشتمان[1812]

**.736** (منَّى) چیە؟ هەڵخەڵەتان[1813]

(العیدُ الكبیر) جەژنە، هى قوربان[1814]

**.737** (تبوَّل) چیە؟ واتە میزكردن[1815]

---

[1809] لا تطعن في ذوق زوجتك، فقد اختارك.

تانەمەدە لەحەزى ژنەكەت، بێگومان ئەو حەزەیە كە تۆى هەڵبژاردووە.

[1810] برَدَ يَبرُد ، بَرْدًا وبُرُودًا ، فهو بارِد.

برَد الجوُّ منذ الصباح.

كەشو هەواكە لەبەیانییەوە ساردبوو.

هل تعلم أن الماء الساخن يتجمّد بسرعة أكبر من الماء البارد!

ئایا دەزانیت كە ئاوى گەرم لە هى سارد خێراتر دەیبەستێت!

[1811] هەروەها بە (حِرْم)یش دەبێت بە چاوگ.

حرَمَ يَحرِم

شَيْئان يحرِمانِنا مِن السَّعادَة: العَيش فِي المَاضِي ومُراقبة الآخَرين.

دوو شت هەن لەبەختەوەرى بێبەشمان دەكەن: ژیان لەڕابردوو و چاودێریكردنى خەڵك.

[1812] حب الوطن من الإيمان.

خۆشەویستیى نیشتمان لەباوەڕەوەیە.

لا توجد سعادة بالنسبة لي أكبر من حرية موطني.

بەنیسبەت منەوە، هیچ بەختەوەرییەك لەئازادیى وڵاتەكەم گەورەتر نیە.

[1813] بێگومان مەخسەوى شەریفم لە "هەڵخەڵەتان"، بریتییە لە "هەڵخەڵەتاند"ە، بەڵام بەهۆى زەروراتى شیعرەوە، پیتى دالەكەم نەنوسیوە.

منَّى الشّيطانُ الشاب.

شەیتان گەنجەكەى هەڵخەڵەتاند.

[1814] بەماناى جەژنى قوربان دێت. راستە مانا حەرفییەكەى "جەژنە گەورەكە"یە، بەڵام بێگومان مەبەست لێى جەژنى قوربانە.

[1815] كارەكەى (تبوَّلَ)یە.

قد تدل رؤية التبول في الحلم للمرأة الحامل على أنها ستمر بمشكلة صحية، أو الجنين سيولد مريضًا.

(نفَخَ) هەڵیکرد، (نَفْخ) هەڵکردن[1816]

**.738** (نفَخَ) فویتێکرد، هەم فویکرد لە[1817]

(وجَدَ على) تورەبوو لە[1818]

**.739** (استمنى) چیە؟ دەستپەڕیکرد[1819]

(نفَخَ) مانای توش غازاتیکرد[1820]

**.740** (وَبائيّ) چیە؟ پەتاییە[1821]

---

بینینی میزکردن لەخەودا بۆ ژنی دوگیان، ڕەنگە ئاماژەبێت بۆ ئەوەی کە توشی کێشەیەکی تەندروستی دەبێت، یان کۆرپەکەی بە نەخۆشی لەدایکدەبێت.

1816 کارو چاوگن

نفَخَتِ الرِّيح فخاف الطفل.

بایەکە هەڵیکرد بۆیە منداڵەکە ترسا. "بەڵام هەڵکردنێکی کتوپڕ".

1817 نفَخَ يَنفُخ، نَفْخًا، فهو نافخ، والمفعول منفوخ.

نفخ الطفل البالونة.

منداڵەکە فویکردە میزەڵانەکەوە.

نفخ الرماد.

فوی لەخۆڵەمێشەکە کرد.

1818 وجَدَ على يجِد، جِدْ، مَوجِدَةً، فهو واجِد.

وجَد على خادمه.

لەخزمەتکارەکەی تورەبوو.

1819 استمنى يستمني، اسْتَمْنِ، استمناءً، فهو مُستمنٍ.

قد تدلّ رؤية الاستمناء في المنام على كثرة الذنوب وعدم الطهارة.

بینینی دەستپەڕکردن لەخەودا ڕەنگە ئاماژە بێت بۆ گوناهباریی زۆرو پیسی.

1820 بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "توش غازاتی کرد" بریتییە لە "توشی غازاتی کرد"، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە پیتی یائەکەم لابردووە.

نفَخ الحمص الرجل.

نۆکەکە پیاوەکەی توشی غازاتکرد.

1821 پەتایی: خێرا بڵاودەبێتەوەو دەگوێزرێتەوە.

کورونا مرض وبائيّ.

کۆرۆنا نەخۆشییەکی پەتاییە.

(وَداع) وەك (وِداع) ماڵئاواییە[1822]

**741.** بەڵا (مِحْنَة)یە، (مُصیبة)و (بَلاء)[1823]

(شيء) واتە شت، کۆیەکەی (أشیاء)[1824]

**742.** (أنتجَ) چیە؟ "بەرهەمهێنا"یە[1825]

(حازَ)، هەم (نالَ) "بەدەستهێنا"یە[1826]

---

[1822] ماڵئاوایی: خواداحافیزیکردن، ماڵئاواییکردن.

دَفَعْتُ إليها في الوَداع وديعةً ... وقلتُ احفظيها إنَّني سأعودُ.

لەکاتی ماڵئاواییکردندا راسپاردەیەکم پێدا...و وتم هەڵیگرە بێگومان دەگەڕێمەوە.

الوداع فى المنام قد يدل على سفر قريب أو فراق، وقد يدل على تغيّر حال الشخص من حاله الذي هو فيه؛ فإذا كان فقيرًا ربما أصبح غنيًا، وإن كان عاطلًا عن العمل ربما وجد عملًا، وإن كان مريضًا ربما تعافى.

رەنگە ماڵئاواییکردن ئاماژەبێت بۆ گەشتێکی نزیك یان جیابونەوە، دەکرێ ئاماژەش بێت بۆ گۆڕانی دۆخی کەسەکە لەو حاڵەتەی کە تێیدایە، ئەگەر هەژاربوو رەنگە دەوڵەمەند ببێت، ئەگەر بێکاربوو رەنگە کارێك بدۆزێتەوە، ئەگەر نەخۆش بوو رەنگە چاکببێتەوە.

[1823] هەرسێکیان بەمانای بەڵا دێن.

محنة مرض السرطان تخيف العالم.

بەڵای نەخۆشیی شێرپەنجە جیهان دەترسێنێت.

{الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ}

ئەو کەسانەی کاتێك بەڵایەکیان توشدەبێت، دەڵێن ئێمە لەلای خوداوە هاتوین و بێگومان هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە.

رؤية إسرافيل في المنام نجاة لأهل الْخَيْر وبلاء لغَيرهم.

بینینی ئیسرافیل لەخەودا بۆ کەسی چاکەکار ئاماژەیە بۆ رزگاربون و بۆ کەسانی تر ئاماژەیە بۆ بەڵا.

[1824] الأشياء الثمينة لا تتكرّر، لذلك نحن لا نملك إلّا أمًا واحدة.

شتە گرانبەهاکان دوبارەنابنەوە، بۆیە ئێمە تەنها یەك دایکمان هەیە.

من يؤمن أن المال يفعل كل شيء، يفعل كل شيء من أجل المال.

هەرکەسێك بڕوای وابێت پارە هەموو شتێکی پێدەکرێت، ئەوە لەپێناو پارەدا هەموو شتێك دەکات.

ئەمە فەرمایشتی بینجامین فرانکلینە کە یەکێکە لەدیارترین کەسایەتییە مێژوویەکانی ئەمەریکا. رەحمەتی لەساڵی 1790ەوە عومری درێژی بۆ تۆ جێهێشتووە. تەنانەت ئەگەر لەکۆتا ساڵی ژیانیدا ئەم قسەیەی کردبێت، ئەوا زیاتر لە 230 ساڵ بەسەر وتنی ئەم قسەیەدا تێپەڕیوە، بەڵام سوبحانەڵڵا ئەڵێی بۆ ئەمڕۆی وتووە. باشترین بەڵگەش تیکتۆکە.

2024-1-27

[1825] أنتج الكاتب عملاً ممتازاً بعد طول انقطاع.

پاش دابڕانێکی زۆر نوسەرەکە کارێکی نایابی بەرهەمهێنا.

[1826] حاز إعجاب الآخرين.

**.743** (خَلاء) چيە؟ چۆڵەوانی[1827]

(جنَی) چنييەوە، ئەمركەی (اجْنِ)[1828]

**.744** (فَرْو) فەرووە، كۆكەی (فِراء)ە[1829]

ئاودەست بەمانای (بَيْتُ الخلاء)ە[1830]

**.745** (أصابَ) چيە؟ بەدەستهێنا[1831]

خوێندەوە، حەتمەن مانای (تمنَّى)[1832]

**.746** (أهَلَ) چيە؟ هاوسەرگيريكرد[1833]

---

سەرسامبونی خەڵكی بەدەستهێنا.

نال جائِزة ثمينة.

خەڵاتێكی گرانبەهای بەدەستهێنا.

1827 نام تلك الليلة في الخلاء.

ئەو شەوە لەچۆڵەوانيدا خەوت.

1828 رابردوو داخوازين.

جنَی يَجني، اجْنِ، جَنًى وجَنْيًا، فهو جانٍ، والمفعول مجنيّ وجَنِيّ.

إنّك لا تجني من الشَّوْك العِنبَ.

بێگومان لەدڕك ترێ ناچنيتەوە.

1829 المعطف مصنوع من فَرْو النَمِر.

قەمسەڵەكە لەفەروی پڵنگ دروستكراوە.

1830 يقول ابن سيرين في توضيح معنى بيت الخلاء في المنام أنه إذا رآه الشخص وكان قذراً وغير نظيف ولا وجود للماء بداخله للاغتسال، فإن هذا المنام يعني ارتكاب الرائي للعديد من الذنوب وأنه لا نية لديه بأن يتوب.

ئيبن سيرين لەميانەی رونكردنەوەی مانای ئاودەست لەخەودا دەڵێت، ئەگەر كەسێك بينی پيس و چەپەڵەو ئاوی لەناودا نيە بۆ شتن، ئەم خەوە مانای ئەنجامدانی چەندين گوناهـە لەلايەن خەوبينەكەوەو بەنيازيش نيە تۆبەبكات.

1831 من رأى في المنام أَنه يُجَامع ملكا فَإِن وجد لَذَّة أصَاب مَالا والأدل على مَوته.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بينی سەرجێيی لەگەڵ فريشتەيەكدا دەكات، ئەگەر چێژی لێبينی، ئەو سامان بەدەستدەهێنێت، زياتر ئاماژەشە بۆ مردنی. واتە بەگوێرەی راڤەكەی ئەگەری زياترە بمرێت نەك سامان بەدەستبهێنێت.

1832 يەكێك لەماناكانی ئەم وشەيە "خوێندەوە"يە.

تمنَّى الطالب الكتابَ.

خوێندكارەكە كتێبەكەی خوێندەوە.

1833 أهَلَ يَأهُل، اؤهُل/هُلْ، أَهْلاً وأُهولاً، فهو آهل.

(كتَب)، (فرَضَ) هەردوو فەرزكرد[1834]

**.747** (تَبَع) شوێنكەوتە[1835]، (تبِعَ) شوێنیكەوت[1836]

(انطرحَ)یە، بەمانای پاڵكەوت[1837]

**.748** (خذَلَ) گومڕاكرد، هەم پشتیتێكرد[1838]

(برَى) "دایدا"یە، لەگەڵ لاوازكرد[1839]

---

أهَل الشابُّ بعد أن أنهى دراسته.

پاش تەواوكردنی خوێندنەكەی، گەنجەكە هاوسەرگیریكرد.

1834 {كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ}.

رۆژوو لەسەرتان فەرزكرا هەروەك چۆن لەسەر كەسانی پێشوتان فەرزكرا.

فرَض الله علينا الصلاة.

خودا نوێژی لەسەرمان فەرزكرد.

1835 جمع أتباع

هل أنت من أتباع المذهب الشافعي؟

ئایا تۆ لەشوێنكەوتوانی مەزهەبی شافیعیت؟

1836 من رأى في المنام أنه يتبع النَّبِي صلى الله عَلَيْه وسلم ويقفو أَثَره فَإِنَّهُ يتبع سنته.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی شوێن پێغەمبەر "درودی خودای لەسەر بێت" دەكەوێت و شوێنپێی هەڵدەگرێت، ئەوە شوێن سوننەتەكانی دەكەوێت واتە سوننەتەكانی جێبەجێدەكات.

من يتبع المال يفقد نفسه.

ئەوەی شوێن پارە بكەوێت خۆی وندەكات.

1837 تەبعەن بیلامانێ!

سمع صوت الانفجار فانطرح على الأرض.

گوێی لەدەنگی تەقینەوەكە بوو، بۆیە لەسەر ئەرز پاڵكەوت. دەشتوانین بێژین خۆیدا بەزەویدا.

1838 خذَلَ عن يَخذُل ، خَذْلاً وخِذلانًا ، فهو خاذِل ، والمفعول مَخْذول.

خذله الله فلم يميِّز بين الحقِّ والباطل.

خودا گومڕایكرد، بۆیە راستی و ناڕاستی لێكجیانەكردەوە.

(المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِم لا يَظْلِمُهُ ولا يَخْذُلُهُ).

موسڵمان برای موسڵمانە، نە ستەمی لێدەكات، نە پشتیتێدەكات.

1839 برَى يَبرِي، ابْرِ، بَرْيًا، فهو بارٍ، والمفعول مَبْرِيّ وبَرِيّ.

من رأى في المنام أنه يبري قَلما وَأتم برايته يكون مُسَددًا فِي أُمُوره وَإِن عسرت عَلَيْهِ بَرَاءَته يكون بضد ذَلِك.

749. (دعة) چيه؟ خۆشگوزەرانی[1840]

(فيء)و (غنيمة)، (خباساء) تاڵانی[1841]

750. (طيلة) چيه؟ بەدرێژایی[1842]

(جَهلْ) نەزانی[1843]، (عرفَ) زانی[1844]

751. (يَحبِسُ) چيه؟ زيندانيدەكات[1845]

---

ئەگەر كەسێك لەخەودا بينی قەڵەمێك دادەدات و دادانەكەی تەواوكرد، ئەوە سەركەوتوو دەبێت لەكاروبارەكانيدا، خۆ ئەگەر دادانەكەی بەلاوە قوس بوو، ئەوە راڤەكەی پێچەوانە دەبێت.

بَرَى المرضُ الولد.

نەخۆشييەكە كوڕەكەی لاوازكرد.

[1840] يَعِيشُ فِي دَعَةٍ عالية.

لەخۆشگوزەرانييەكی بەرزدا دەژی.

[1841] هەرسێكيان بەمانای تاڵانيی دێن، بەڵام (غَنيمة)و (خباسَاء) زياتر هی كاتی جەنگن و (فَيْء) تاڵانيی بێجەنگە.

جمع غَنيمة= غنائم. جمع (فَيْء)= أفياء.

قُسِمِ الفَيءُ على الناس.

تاڵانييەكە بەسەر خەڵكدا دابەشكرا.

تقاسم الجنودُ الغَنَائِمَ.

سەربازەكان تاڵانييەكانيان دابەشكرد.

هل الخباسَاء حلال أم حرام؟

ئايا تاڵانی حەڵاڵە يان حەرامە؟

[1842] قيل أن الإنسان حيوان عاقل، وأنا أبحث طيلة حياتي عن أدلة يمكنها تأكيد ذلك!

وتراوە مرۆڤ گياندارێكی ژيرە، من بەدرێژايی ژيانم بۆ بەڵگەگەلێك دەگەڕێم كە ئەوە جەختبكاتەوە!

[1843] معرفتنا لا يمكن إلا أن تكون محدودة، أما جهلنا فغير محدود.

زانياريیمان ناكرێ سنوردار نەبێت، بەڵام نەزانيمان سنوردار نيە.

العلم يرفع بيتاً لا عماد له

والجهل يهدم بيتاً له عماد

زانست ماڵ بەرزدەكاتەوە ئەگەرچی خۆی كۆڵەكەی نەبێت

بەڵام نەزانی ماڵ دەڕوخێنێت ئەگەر كۆڵەكەشی هەبێت

[1844] عرَفَ يَعرِف ، عِرفانًا ، فهو عارِف ، والمفعول مَعْروف.

كلّ ما أعرفه هو أني لا أعرف شيئاً.

هەموو ئەوەی كە دەيزانم ئەوەيە كە من هيچ نازانم.

(عاري) واته رووت، جەمعەکەی (عُرَاة)[1846]

**752.** (حَبْس) هەم گرتن، هەم گرتوخانە[1847]

(مَلَكُ الموت) پەری، هی گیانکێشانە[1848]

**753.** (مَحْبِس) ئەڵقەیە، هی هاوسەرگیری[1849]

(نَعْرة) هەم بۆڕە، هەم دەمارگیری[1850]

---

[1845] حبَسَ يَحبِس ، حَبْسًا ، فهو حابِس ، والمفعول مَحْبوس وحبيس.

من رأى يُوسُف عليه السلام في المنام حبس ونال شدَّة ثمَّ نصر وَولي ولَايَة أَو رُبمَا يحصل لَهُ من قبل امْرَأَة وعاقبته إِلَى خير أَو رُبمَا دلّت رُؤْيَته على بشرى.

ئەگەر کەسێك لەخەودا یوسفی بینی (سڵاوی خودای لێبێت)، ئەوە زیندانیدەکرێت و توشی نارەحەتی دەبێت و پاشان سەردەکەوێت و دەسەڵات دەگرێتەدەست یان رەنگە لەلایەن ژنێکەوە توشی شتێك ببێت و کۆتاییەکەی باش دەبێت، یان رەنگە خەوەکەی ئاماژەبێت بۆ مژدەیەك.

[1846] بێگومان بە "عارون"یش کۆدەکرێتەوە.

لو خيّرت بين فتاة عارية جميلة وأخرى محجبة قبيحة، فأيهما ستختار للزواج؟

ئەگەر کچێکی رووتی جوان و یەکێکی داپۆشراو خرانە بەردەمت، کامیان هەڵدەبژێریت بۆ هاوسەرگیری؟

[1847] لەمانای یەکەمیاندا چاوگی "حبَسَ".

كان حبس المشتبه به أمراً ضرورياً.

گرتنی گومانلێکراوەکە کارێکی پێویست بوو.

هل زرته في الحبس؟

ئایا سەردانت کرد لەگرتوخانەکە؟

[1848] بەمانای پەریی گیانکێشان دێت. پەریی گیانکێشان= فریشتەی گیانکێشان= فریشتەی رۆحکێشان= عیزرائیل: ئەو فریشتەیەی کاتێك باڵانسی ژیانت تەواودەبێت، رۆحت دەکێشێت!

من يرى في منامه يقبل ملك الموت هذا يدل على أن صاحب الحلم سوف يرث ثروة طائلة من احد الاقارب.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی فریشتەی گیانکێشان ماچدەکات، ئەوە سامانێکی زۆری وەك میرات بۆ دەمێنێتەوە.

[1849] بەمانای ئەڵقەی هاوسەرگیری دێت. وشەکە لە "حبس"ەوە هاتووە کە بەمانای گرتن دێت، تەبعەن بیلامانێ. "مَحْبِس" بەمانای گرتوخانەش دێت. خوا پێم نەگرێ دیارە عەرەب هاوسەرگیرییان وەك چونەزیندان داناوە، بۆیە مانای ئەڵقەی هاوسەرگیرییان داوە بەم وشەیە.

ضاع محبسه ولكنه لم يحزن.

ئەڵقەی هاوسەرگیرییەکەی ونکرد بەڵام خەفەتی نەخوارد.

[1850] جمع نَعَرات ونَعْرات.

بەمانای بۆڕەو دەمارگیریش دێت.

**.754** (مَحْبِس) چیه؟ گرتوخانه[1851]

(حُبْسَة) ماناکەی زمانگیرانه[1852]

**.755** (رَأْس) سەرۆکه، دێش بەمانای سەر[1853]

(شَعرُ العانة)یه مانای توکەبەر[1854]

**.756** (نَهیق) سەڕینه، هەروەها سەڕە[1855]

(جَحْش) جاشەکەر[1856]، (حِمار)یش کەرە[1857]

---

استیقظ علی نَعْرةِ الثَّور.

به بۆڕەی گایەکه خەبەری بووەوه.

أکره النَّعرة الدِّینیّة.

رقم لەدەمارگیریی ئاینییه.

[1851] کانت زیارة السجین السیاسي في محبسه ممنوعة.

سەردانکردنی زیندانی سیاسی لەگرتوخانەکەیدا، قەدەغەبوو.

[1852] لا یصلح من یعاني من الحبسة أن یعین کمتحدث رسمي للحکومة.

کەسێك بەدەست زمانگیرانەوه بناڵێنێت، بۆ ئەوه ناشێت وەك وتەبێژی رەسمیی حکومەت دابمەزرێنرێت.

[1853] جمع أَرؤُس ورُءوس.

رأسه کبیر جداً.

سەری زۆر گەورەیه.

أعتقد بأن رأس الحکومة لا یقبل الاقتراح.

پێموایه سەرۆکی حکومەت پێشنیازەکه پەسەندناکات.

[1854]حلق شَعر العانة واجب دیني و صحّي.

تاشینی توکەبەر ئەرکێکی ئاینی و تەندروستییه.

[1855] لەمانای یەکەمیاندا چاوگی (نهَقَ)یه.

نهیق الحمار یزعج الکبیر والصغیر.

سەڕینی کەر گەورەو بچوك بێزاردەکات.

هل سعمت نهیق الحمار عن قرب؟

ئایا لەنزیکەوه گوێت لەسەڕەی کەر بووه؟

[1856]جمع أجحاش وجِحاش وجِحْشان وجُحوش، مؤ جحشة، جمع مؤ جِحاش.

جاشەکەر= بێچووەکەر.

رکب الفلاحُ جَحْشَه وذهب إلی الحقل.

757. (أمين) دەستپاکە[1858]، (صَادِق)ە ڕاستگۆ[1859]

(سُبُل) ڕێگایە، بەڵام تاك نا کۆ[1860]

758. (بسَطَ) دڵخۆشکرد، چاوگەکەی (بَسْط)ە[1861]

(عُنصُريّ) مانای ڕەگەزپەرستە[1862]

759. (خَشْم)و (أنْف) لوت، کۆی یەکەم (خُشُوم)[1863]

---

جوتیارەکە سوار جاشەکەرەکەی بوو و ڕۆشت بۆ کێڵگەکە.

[1857] جمع أَحمِرة وحُمْر وحُمُر وحمير، مؤ حِمارة، جمع مؤ حمائر

حمار مطيع خير من صديق جاهل و عنيد.

کەرێکی گوێڕایەڵ لەهاوڕێیەکی نەزان و ئینکار باشترە.

قرر طاغية إعدام الف شخص وحمار. فسأله الناس: ولماذا الحمار؟

فهمس لمستشاره الذي بجانبه: ألم أقل لك أنهم سيسألون عن إعدام الحمار ولن يسألوا عن إعدام الف شخص..

زۆردارێك بڕیاردەدات هەزار کەس و یەك کەر لەسێدارەبدات. خەڵکەکە لێی دەپرسن: باشە کەرەکە بۆ؟ لەم کاتەدا زۆردارەکە دەچرپێنێت بەگوێی ڕاوێژکارەکەی تەنیشتی و دەڵێت: پێم نەوتیت خەڵکەکە پرسیار سەبارەت بە کەرەکە دەکەن و سەبارەت بە مرۆڤەکان نایکەن؟!!!

[1858] زوجها رجل أمين.

مێردەکەی پیاوێکی دەستپاکە.

[1859] جمع صادقون وصُدُق، مؤ صادقة، جمع مؤ صادقات وصوادقُ.

لا تخف من الرجل الصادق.

لەپیاوی ڕاستگۆ مەترسە.

[1860] تاکەکەی (سبيل)ە. وشەی (سبيل) لەڕوی ڕێزمانییەوە بەدولا مەست و حەیرانە، بەو مانایە دەتوانرێت وەك نێرو مێش بەکاربهێنرێت.

سبيل الحرب خطرة أو خطر.

ڕێگای جەنگ مەترسیدارە.

[1861] بسَطَ يَبسُط، بَسْطًا، فهو باسِط، والمفعول مَبْسوط.

بسَطَ الحفلُ الحاضرين.

ئاهەنگەکە ئامادەبوانی دڵخۆشکرد.

[1862] صدام حسين كان رئيساً عُنصُريّاً.

سەدام حسێن سەرۆکێکی ڕەگەزپەرست بوو.

[1863] واتە ئەو دوو وشەیە بەمانای لوت دێن، کۆی وشەی یەکەمیان کە (خشم)ە دەبێتە (خشوم).

ضربه على وجهه حتَّى سال الدَّمُ من خَشْمه.

(قدِمَ) پێشكەوت، چاوگى (قُدُوم)[1864]

**.760** (عِجْل) گوێرەكە[1865]، (بَقَرة) مانگایە[1866]

(جاموس) گامێشە[1867]، (ثور) ماناى گایە[1868]

**.761** (قِطّة) لەگەڵ (هِرّ) هەردوو پشیلە[1869]

---

هێندە لەدەموچاوى دا كە خوێن لەلوتییەوە هات.

يدل رؤية الأنف العريض في المنام على أن صاحب الحلم سيتعرض للأذى والخيانة من بعض الأصدقاء.

بينینى لوتى پان لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەى كە خەوبینەكە توشى زیان و ناپاكى دەبێت لەلایەن هەندێك لەهاورێكانییەوە.

لك أنفٌ يا بن حربٍ ///أنِفت منه الأنوف

أنت في القُدسِ تصلي/// و هو في البيت يطوف!

كورى حەرب تۆ لوتێكت پێوەیە كە هەرچى لوتى ترە لێى رادەكات

هێندە گەورەیە كە كاتێك تۆ لە قودس نوێژدەكەیت، ئەو لەماڵەوە دەسورێتەوە!!!

1864 واتە چاوگى كارى (قدم)، (قدوم)ە.

قدم الطابورَ.

پێش ریزەكە كەوت.

1865 جمع عجاجيلُ وعُجول

ضحَّينا بِعِجْلٍ سَمِين.

گوێرەكەیەكى قەڵەومان كردە قوربانى.

1866 جمع بَقَرات وبَقَر، جمع الجمع أبْقار وأبْقُر.

أن البقرة السمينة في المنام تدل على الرزق.

مانگاى قەڵەو لەخەودا ئاماژەیە بۆ رۆزى.

1867 جمع الجمع جواميس، مفرد جاموسة.

إذا رأيت أنك تقوم بذبح الجاموسة فإن هذه الرؤية تمثل الحظ الجيد وتعني بداية حياة جديدة للرائي يحقق من خلالها الكثير من الأحلام والطموحات التي يسعى إليها في حياته.

ئەگەر لەخەودا بينیت گامێشێك سەردەبڕیت، ئەوە ئاماژەیە بۆ بەختى باش و سەرەتاى ژیانێكى تازە بۆ خەوبین كە تێیدا زۆرێك لەو ئاوات و بەرزخوازییانەى لەژیانیدا هەوڵیان بۆ دەدات، بەدیدەهێنێت.

1868 جمع ثِيران وثِيَرَة، مؤ بقرة وثورة.

أمسك الثَّور من قرنيه.

گایەكەى لەرێگەى شاخەكانییەوە گرت.

1869 القطة حيوان أليف.

پشیلە گیاندارێكى ماڵییە.

(فَأْرْ) واته مشك[1870]، (فِيل) ماناى فيله[1871]

762. (شارِب) سمێڵه[1872]، (لِحْيَة) ردێنه[1873]

---

أن مقدرة الحصان والهرّ والأرنب على السمع أكبر من مقدرة الانسان.

تواناى ئەسپ و پشیلەو کەروێشك لەڕوی بیستنەوە، لە هى مرۆڤ زیاترە.

[1870] جمع فئران وفِيران، مؤ فأرة، جمع مؤ فَأْرات.

قرض الفأر الشبكة.

مشکەکە تۆڕەکەی قرتاند.

دكتور ألماني في علم الأحياء وضع أمام طلابه قفص كبير.. فيه فأر ذكر في الوسط..

ووضع على طرف القفص قطعة من الجبن وعلى الطرف الآخر فأرة.

وحرر الفأر فركض ليأكل الجبن..

أعاد التجربه بأن وضع قطعة من الخبز ففعل الفأر نفس الشيء وركض ليأكل الخبز..

وأعاد التجربة عدة مرات بتغيير نوع الطعام والفأر في كل مرة يركض ناحية الطعام وليس لناحية الفارة.

فقال الدكتور للطلاب: الم نستنتج من هذه التجربة بأن حب الطعام أقوى من حب الأنثى؟!

وهنا رفع يده أحد الطلبه قائلا:

دكتور، الرجاء إعادة التجربة مع فأرة أخرى فقد تكون تلك الأنثى هي زوجته!

فرد عليه الدكتور: بالضبط. أنت الوحيد الذي فهم الدرس!

دکتۆرێکی ئەڵمانیی بواری زیندەوەرزانی، قەفەزێکی گەورەی لەبەردەم خوێندکارەکانی دادەنێت و مشکێکی نێر لەناوەڕاستی قەفەزەکەدا دادەنێت. پاشان لەسوچێکی قەفەزەکە پارچەیەك پەنیری داناو لەسوچێکی تردا مشکێکی مێیینەی دانا. لەم کاتەدا مشکە نێرەکەی بەرداو سەرنجیاندا مشکە نێرەکە بەپەلە رایکرد بەرەو پەنیرەکە بۆ ئەوەی بیخوات.

جارێکی تر ئەم تاقیکردنەوەیەی ئەنجامداو پەنیرەکەی گۆڕی بە نان، بە هەمان شێوە مشکە نێرەکە بەرەو نانەکە (نەك مشکە مێینەکە) رایکرد بۆ ئەوەی نانەکە بخوات.

چەند جارێك ئەم تاقیکردنەوەیەی ئەنجامداو خواردنەکەی گۆڕی، لەهەموو جارەکاندا مشکە نێرەکە بە ئاڕاستەی خواردنەکە رۆیشت نەك مشکە مێیەکە.

لەم کاتەدا دکتۆرەکە دەڵێت: ئایا لەمەوە نەگەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە خۆشەویستیی خۆراك لەخۆشەویستیی مێینە بەهێزترە؟!

یەکێك لەخوێندکارەکان دەست بەرزدەکاتەوەو دەڵێت: تکایە دکتور تاقیکردنەوەکە لەگەڵ مشکێکی مێینەی تردا ئەنجابمدە، چونکە رەنگە ئەم مشکە مێینە ژنی خۆی بێت!

دکتۆرەکە لەوەڵامدا دەڵێت: کتومت وایە. تۆ تەنها کەسیت کە لە دەرسەکە تێگەیشتیت!!!

[1871] جمع أفيال وفِيَلة.

أن وزن الفيل يصل إلى خمسة أطنان ومع ذلك تصل سرعته إلى 40 كيلومتراً في الساعة.

کێشی فیل دەگاتە پێنج تۆن، سەرباری ئەوەش خێراییەکەی دەگاتە 40 کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا.

(سَواد)، (حَدَقَة) هەردوو ڕەشێنە[1874]

**.763** (مَرارة) تاڵی، هەمیش زراوە[1875]

(بَیاضُ العَیْن)ە سپێنەی چاوە[1876]

**.764** (استحی) چیە؟ واتە شەرمیکرد[1877]

وشەی (حبَسَ) ئەی زیندانیکرد[1878]

---

[1872] جمع شوارِب.

شاربك جذّاب.

سمێڵت سەرنجڕاکێشە.

[1873] جمع لُحی ولِحی.

ردێن= ریش.

{قَالَ يَاابْنَ أُمَّ لاَ تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلاَ بِرَأْسِي}.

فەرمووی ئەی کوڕی دایکم، ریش و سەرم مەگرە.

[1874] هەردوکیان بەمانای ڕەشێنە (ی چاو) دێن.

سواد العین منطقة حساسة.

ڕەشێنەی چاو ناوچەیەکی هەستیارە.

لا تنظر الی حدقة عینیها.

سەیری ڕەشێنەی چاوەکانی مەکە.

[1875] جمع مرارات ومرائِر.

"مرارة الحیاة لا تكسرنا، بل تقوینا." - نیلسون ماندیلا

تاڵیی ژیان نامانشێکێنێت، بەڵکو بەهێزمان دەکات.

ما هي أعراض حصى المرارة؟

نیشانەکانی بەردی زراو چین؟

[1876] بیاض العین یشكل حوالي 55٪ من سطح العین.

سپێنەی چاو نزیکەی لەسەدا 66ی رووی چاو پێکدەهێنێت.

[1877] استحی یستحي، اسْتَحِ، استحیاءً، فهو مُسْتحٍ.

إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَافْعَلْ مَا شِئْتَ.

ئەگەر شەرمت نەکرد، چی ئەکەی بیکە.

[1878] بەمانای زیندایکرد دێت.

حبَسَ یَحبِس، حَبْسًا، فهو حابِس، والمفعول مَحْبوس وحبیس.

أصدر القاضي حكمًا بحَبْسه شهرًا.

.765 (عمَد إلى) واته رویكرده[1879]

(وَصید) حەوشەیە، كۆی (وصائِد)ە[1880]

.766 (حَظْوَة)و (مَنْزِلة) پلەوپایە[1881]

(عَمید) راگرو هی پێش لیوایە[1882]

.767 (عمَّدَ) واتە كرد بە سەرگەورە[1883]

(عَقُور) گازگرە، كۆكەی (عُقُر)ە[1884]

.768 (سُنونو) چیە؟ پەڕەسێلكە[1885]

---

دادوەر فەرمانی زیندانیكردنی بۆ ماوەی مانگێك دەركرد.

[1879] عمَد المسلم إلى المسجد.

موسڵمانەكە رویكردە مزگەوتەكە. بەمانای چوو بۆ مزگەوتەكە.

[1880] بە " وُصُد"یش كۆدەكرێتەوە.

نام الطفل في الوصيد.

منداڵەكە لەحەوشەكەدا خەوت.

[1881] إنّه ذو حَظْوة رفيعة عند الجمهور.

بێگومان ئەو خاوەنی پلەوپایەیەكی بەرزە لەلای جەماوەر.

له منزلة عالية عند أصحابه.

پلەوپایەیەكی بەرزی هەیە لەناو هاوڕێكانیدا.

[1882] مع عُمَداء.

دوان لەدیارترین ماناكانی راگر (ی كۆلێژ)و عەمید دێت كە پلەیەكی سەربازییەو دەكەوێتە نێوان عەقیدو لیواوە. بێگومان لەبەر زەروراتی شیعر لەبری وشەی عەمید نوسیومە "هی پێش لیوا".

زوجها عميد كُلِّيَّة الإدارة والإقتصاد.

مێردەكەی راگری كۆلێژی كارگێڕی و ئابورییە.

قاد القوات في المعركة عميد مقدام.

عەمیدێكی دلێر سەركردایەتیی هێزەكانی كرد لەجەنگەكەدا.

[1883] عمَّده رجال المنطقة.

پیاوانی ناوچەكە كردیان بە سەرگەورە.

[1884] نصح الطبيب الرجل بالتخلص من كلبه العقور.

پزیشكەكە ئامۆژگاریی پیاوەكەی كرد كە سەگە گازگرەكەی لەكۆڵ خۆی بكاتەوە.

[1885] السنونو طائر محبوب.

(باضَ) هێلکەیکرد[1886]، (بَیْضة)یە هێلکە[1887]

**.769** (مُستَوي) تەختە[1888]، (مُنحدِر) لێژە[1889]

(دائِخ) تاریکە، هەروەها گێژە[1890]

**.770** (ظاهِرة) دیاردە[1891]، (ظاهِر) واتە دیار[1892]

وشەی (لَیْلَة) شەو[1893]، (مُظلِم) مانای تار[1894]

---

پەڕەسێلکە باڵندەیەکی ڕۆحسوکە.

[1886] باضَ، یَبیض، بِضْ، بَیْضًا، فهو بائض.

باضت الدجاجة.

مریشکەکە هێلکەیکرد.

[1887] ج: بیْضات وبَیَضات وبَیْض وبِیضان. جمع الجمع: بُیوض.

وضَع البیض کلّها في سلَّة واحدة.

هەموو هێلکەکانی خستە یەك سەبەتەوە.

[1888] حاول أن لا تنحرف عن الطریق المستوي.

هەوڵبدە لەڕێگا تەختەکە لانەدەیت.

[1889] السیاقة في الطریق المنحدر تستهلك وقوداً أقل.

لێخوڕین لەڕێگای لێژدا سوتەمەنییەکی کەمتر بەکاردەبات.

[1890] اللیل الدائخ مخیف.

شەوی تاریك ترسناکە.

کنتُ دائخًا من الجوع وشدَّة السَّهَر.

بەهۆی برسێتی و شەونخونیی زۆرەوە، گێژ بوم.

[1891] جمع ظاهِرات وظواهِر.

ظاهرة التدخین تدمّر صحة الإنسان.

دیاردەی جگەرەکێشان تەندروستیی مرۆڤ لەناودەبات.

[1892] دیار= ئاشکرا، بینراو: پێچەوانەی نادیارو ون.

لحد الان الحزن ظاهر علی وجه رغم مرور سنة کاملة علی وفاة أبیه.

سەرباری تێپەڕبونی ساڵێکی تەواو بەسەر مردنی باوکی، تائێستاش خەفەت لەسەر دەموچاوی دیارە.

[1893] جمع لَیْلات ولَیَلات ولَیَالٍ.

قتل الملك في اللیلة الماضیة.

شەوی رابردوو پادشا کوژرا.

شەوی تاریك ترسناکە.

**.771** (حِذاء) پێڵاوە[1895]، (إسكاف) پینەچی[1896]

(صبَغَ) بۆیاخکرد[1897]، (صَبَّاغ) بۆیاخچی[1898]

**.772** (قارة) قاڕەیە، کەواتە کیشوەر[1899]

(حشرة) مێرووە، جەمعەکەی (حشر)[1900]

**.773** (حَمام) کۆترە[1901]، (طاووس)ە تاوس[1902]

---

[1894] تار= تاريك.

كلنا كالقمر، له جانب مظلم.

هەمومان وەك مانگ واین، لایەکی تاریکمان هەیە.

1895 الْحِذَاءِ أرفع قيمة من الملحد البذيء.

پێڵاو بەهای بەرزترە لەمولحیدی زمانپیس.

[1896] جمع أساكِفَة.

دخول محل الاسكاف في المنام يعني ان الرائي سوف يرتاح و ينسي مشكلة كبيرة.

چونە دوکانی پینەچی لەخەودا مانای ئەوەیە کە خەوبینەکە ئاسودەدەبێت و کێشەیەکی گەورەی لەبیردەچێتەوە.

[1897] صبَغَ يَصبَغ ويَصبُغ ويَصبِغ، صَبْغًا وصِبَاغةً، فهو صابِغ، والمفعول مَصْبوغ وصَبيغ.

صبغ الحائط خلال مدة وجيزة.

دیوارەکەی لەماوەیەکی کەمدا بۆیاخکرد.

[1898] كان الصَبَّاغ شاباً ماهراً.

بۆیاخچییەکە گەنجێکی لێهاتوو بوو.

[1899] القارة القطبية الجنوبية خالية تماماً من أي زواحف لأنها تحب الدرجات المعتدلة.

کیشوەری جەمسەری باشور هیچ زیندەوەرێکی خشۆکی تێدا نیە، لەبەرئەوەی ئەم جۆرە زیندەوەرە حەزی پلەی گەرمای مامناوەندە (نەك زۆر ساردی وەك هی ئەوێ).

[1900] هەروەها بە (حَشَرات)یش کۆدەکرێتەوە.

هل تعلم أنّ العنكبوت ليس من فصيلة الحشرات كما يعتقد البعض!

ئایا دەزانیت جاڵجاڵۆکە لەجۆری مێرووەکان نیە وەك ئەوەی هەندێك لەو بڕوایەدان!

[1901] جمع الجمع حمائِمُ، مفرد حمامة. (حمام) بەمانای کۆتر دێت بەگشتی بەڵام (حمامة) بۆ گوزراشتکردن لەکۆتر لەکاتی دیاریکردنی ژمارەکەی بەکاردەهێنرێت جا یەك دانەبێت یان زیاتر.

رجعت الحمامة الى عشها.

کۆترەکە گەڕایەوە بۆ هێلانەکەی.

منذ عام 2008، تم حظر إطعام الحمام في ساحة سان ماركو في البندقية. ويُغرم أي شخص يتم ضبطه وهو يطعم الحمام بغرامة تصل إلى 500 يورو.

(حامِل) دوگیانە، هەروەها ئاوس[1903]

**774.** (مُنتجَع)، (مَصْیف) هاوینەهەوار[1904]

(ثائِر) شۆڕشگێڕ، جەمعەکەی (ثُوّار)[1905]

**775.** (جزع) چیە؟ ئارامینەمان[1906]

(حیاة) لەگەڵ (عیش) هەردوکیان ژیان[1907]

---

لەساڵی 2008ەوە، پێدانی خواردن بە کۆتر لەگۆڕەپانی مارکۆ لەشاری بوندوقیەی ئەو ئیتالیایەی لای خۆمان، قەدەغەکراوە. هەرکەسێك بەو کارەوە بگیرێت، بە بڕێك کە دەگاتە 500 یۆرۆی ناسك، غەرامەدەکرێت.

[1902] جمع أطواس وطواويس.

إذا رأت العزباء في المنام الطاووس دل ذلك على الحظ الجيد، سواء على المستوى العملي أو الارتباط العاطفي.

ئەگەر کچی شونەکردوو لەخەودا تاوسی بینی، ئەوە ئاماژەیە بۆ بەختی باش، چ لەڕوی پراکتیکییەوە بێت یان پەیوەندیی سۆزدارییەوە.

[1903] ج: حوامِل.

بەمانای دوگیان (سکپڕ)و ئاوس دێت.

لا تتعاطى الحاملُ دواءً إلاّ بمعرفة الطَّبيب المختصّ.

بەبێ ئاگاداریی پزیشکی پسپۆڕ هیچ دەرمانێك نادرێت بە دوگیان.

البقرة الحامل تعرف قيمة العشب.

مانگای ئاوس نرخی گیا دەزانێت.

[1904] هاوینەهەوار= سەیرانگا.

أمضيت وقتاً طويلاً في منتجع أحمدآوا.

کاتێکی زۆرم لەهاوینەهەواری ئەحمەدئاوا بەسەربرد.

هل زرت منتجع دوكان؟

ئایا سەردانی هاوینەهەواری دوکانت کرد؟

[1905] بێگومان بە (ثائرون)یش کۆدەکرێتەوە.

"الثوار لا يموتون، بل يبقون أحياء في قلوب الناس." - نيلسون مانديلا.

شۆڕشگێڕان نامرن، بەڵکو بە زیندویی لەدڵی خەڵکدا دەمێننەوە.

[1906] چاوگی (جزِعَ)یە.هەروەها (جُزُوع)یش هەر چاوگیەتی.

الجزع عند المصيبة، مصيبة أخرى.

ئارامینەمان لەکاتی بەڵادا، بەڵایەکی ترە.

[1907] جمع حياة: حَيَوات

في الحياة، إن لم تتعلم من الضربة الأولى فأنت تستحق الثانية.

لەژیاندا ئەگەر لەیەکەم لێدانەوە فێرنەبویت، ئەوە شایانی لێدانی دووەمیت.

776. (مُنحنى) چيه؟ ماناى چەماوە[1908]

(زاوية قائمة) گۆشەی وەستاوە[1909]

777. (شَعْر) واتە قژ[1910]، (شِعْر) هۆنراوە[1911]

(صَليب) ماناى خاچ، لەخاچدراوە[1912]

778. (بَيْنا)و (بَينما) "لەكاتێكدا"يە[1913]

(طَقْس) سروت و كەشوهەوايە[1914]

---

القناعة أهم أسباب السعادة، لأنها تجعلك ترى الحياة جميلة.

قەناعەت گرنگترین هۆكارەكانی بەختەوەرین، لەبەرئەوەی وات لێدەكات ژیان بە جوانی ببینیت.

من رأى نوحاً عليه السلام في المنام فإنه يعيش عيشاً طويلاً وتصيبه شدة عظيمة وأذى من الناس ثم يظفر بهم ويرزق أولاداً من زوجة رديئة ويكون شكوراً.

ئەگەر كەسێك لەخەودا پێغەمبەر نوحی بینی (درودی خودای لەسەر بێت)، ئەوە ژیانێكی زۆر دەژی و توشی تەنگوچەڵەمەیەكی گەورەو ئازار دەبێت لەلایەن خەڵكەوە، پاشان بەسەریاندا زاڵدەبێت، هەروەها منداڵی لەژنی خراپ دەبێت و سوپاسگوزار دەبێت.

1908 چەماوە: زاراوەیەكی دیاری ئەندازەیە.

المنحنى هو خط غير مستقيم، ويُمكن أن يكون مفتوحًا أو مغلقًا.

چەماوە بریتییە لەهێڵێكی ناڕاست و دەكرێ كراوە یان داخراو بێت.

1909 الزاوية القائمة هي زاوية قياسها 90 درجة.

گۆشەی وەستاو ئەو گۆشەیەیە كە پێوانەكەی 90 پلەیە.

1910 عضبت و سحبت شعرها.

توڕەبوم و قژیم ڕاكێشا.

1911 ما الشِّعْر إلاّ شعورُ المرء يُرسلُه الى من يقصده.

هۆنراوە جگە لەهەستگەلێك كە مرۆڤ دەینێرێت بۆ ئەو كەسەی مەبەستیەتی، هیچی تر نیە.

1912 الصليب علامة من علامات المسيحيين.

خاچ یەكێكە لەنیشانەكانی مەسیحییەكان.

كان الصليب رجلاً بريئاً.

لەخاچدراوەكە پیاوێكی بێتاوان بوو.

1913 بَيْنا محمد في المكتبة إذ دخل عليه صديقه.

لەكاتێكدا محەمەد لەكتێبخانەكەدا بوو، كتوپڕ هاوڕێكەی چووە ژورەوە بۆ لای.

بينما أنا سائر رأيت حادثا في الطّريق.

لەكاتێكدا من دەڕۆشتم، ڕوداوێكم لەڕێگاكەدا بینی.

779. (مَسارِح) شانۆ، بەڵام تاك نا، کۆ[1915]

(انْكَفَأَ)یە مانای گەڕاوۆ[1916]

780. (حائِط) دیوارە، جەمعەکەی (حِیطان)[1917]

(مُتَحذلِق) مانای خۆبەزانازان[1918]

781. (حائِك) جۆڵایە، کۆکەی (حَوَكة)[1919]

(رُسْغ)و (مِعصَم) هەردوو مەچەکە[1920]

---

[1914] جمع طُقوس

تختلف الطقوس الدينية من دين إلى آخر.

سروتە ئاینییەکان لەئاینێکەوە بۆ یەکێکی تر، جیاوازە.

أحب الطقس البارد.

حەزم لەکەشو هەوای ساردە.

[1915] تاکەکەی " مَسْرَح"ە.

ذهبنا إلى المسرح وشاهدنا المسرحيّة الجديدة.

چوین بۆ شانۆو سەیری شانۆگەرییە تازەکەمان کرد.

[1916] گەڕاوۆ= گەڕایەوە.

انْكَفَأَ إلى زوجته القديمة.

گەڕایەوە بۆ لای ژنە کۆنەکەی.

[1917] هەروەها بە "حوائط"یش کۆدەکرێتەوە.

بنى حائطًا حول قصره.

دیوارێکی بە دەوری کۆشکەکەیدا دروستکرد.

[1918] حذرت صديقي من ذلك الشخص المتحذلق لأنه يتحدث كثيرًا ولا يفعل شيئًا.

هاوڕێکەم لەو کەسە خۆبەزانازانە ئاگادارکردەوە، چونکە زۆر دەڵێت و هیچیش ناکات.

[1919] هەروەها بە "حاكة"ش کۆدەکرێتەوە.

تعلمت من جدتي كيف تكون حائكة ماهرة.

لەداپیرەمەوە فێربوم کە چۆن دەبیتە جۆڵایەکی کارامە.

[1920] ينبغي عند الوضوء، أن تغسل يديك إلى الرُّسغين.

دەبێت لەکاتی دەستنوێژدا دەستت تا مەچەك بشۆیت.

كان معصم الرجل ضخمًا وقويًا.

مەچەکی پیاوەکە گەورەو بەهێز بوو.

**.782** (صحَّفَ) واته بەهەڵە خوێندۆ[1921]

(بَلابِل) بولبول، بەڵام تاك نا، كۆ[1922]

**.783** (صَحَفِيّ) ماناى رۆژنامەنوسە[1923]

زەنگ بە عەرەبى (جَرَس)، (ناقوس)ە[1924]

**.784** (صُحُفِيّ) چيە؟ رۆژنامەڤانە[1925]

(عَطْشى) تينوو"ى مێ"، واتە (عَطْشانة)[1926]

**.785** (مُصْحَف) قورئانە، هەروەها پەڕتوك[1927]

---

1921 بەهەڵە خوێندۆ= بەهەڵە خوێندەوە.

صحَّف المتحذلق الآية.

خۆبەزانازانەكە ئايەتەكەى بە هەڵە خوێندەوە.

1922 تاكەكەى "بُلْبُل"ە.

كان البلبل يقف على فرع الشجرة.

بولبولەكە لەسەر لقى درەختەكە دەوەستا.

1923 التقى الصحفي برئيس الوزراء لمناقشة آخر التطورات.

رۆژنامەنوسەكە چاويكەوت بە سەرۆك وەزيران بۆ گفتوگۆكردن لەسەر تازەترين پەرەسەندنەكان.

1924 سمعت صوت جرس الباب، فذهبت لأفتحه.

گوێم لەدەنگى زەنگى دەرگاكە بوو، بۆيە رۆشتم بۆ ئەوەى بيكەمەوە.

سمعت صوت ناقوس الكنيسة يرن، فعرفت أن الوقت قد حان للصلاة.

گوێم لەدەنگى زەنگى كڵێسەكە بوو لێيدەدا، بۆيە زانيم كە كاتى نوێژ هاتووە.

1925 كان الصحفيون حاضرين في جميع الأحداث المهمة.

رۆژنامەڤانەكان لەگشت روداوە گرنگەكاندا ئامادەبون.

1926 كانت البنت عَطْشى، فطلبت من أمها أن تسقيها.

كچەكە تينوو بوو، بۆيە داواى لەدايكى كرد ئاوى پێبدات.

كانت الأرض عطشانة جداً.

زەوييەكە زۆر تينوو بوو.

1927 جمع مَصاحِف.

أتممت قراءةَ المُصْحَف خلال أسبوع واحد.

لەماوەى يەك هەفتەدا قورئانم تەواو خوێندەوە.

جمع مقالاته في مصحف واحد.

(کُوَیْکب) مانای هەسارەی بچوک[1928]

**786.** (بالَ) میزیکرد[1929]، ئاودەست (مُسْتَراح)[1930]

پەلەپیتکەیە ماناکەی (مِقداح)[1931]

**787.** (سامٍ) باڵایە، جەمعەکەی (سامون)[1932]

(سُمول)، (سُمولة) هەردوکیان کۆنبون[1933]

**788.** (دقّ) لاوازبوو، هەروەها شکان[1934]

---

وتارەکانی لەیەك پەرتوكدا کۆکردەوە.

[1928] جمع كُوَيْكبات.

هەسارەی بچوك= هەسارۆچکە. هەسارە "کوکب"ی پێدەووترێت.

يمكن أن تتسبب الكويكبات في أضرار كبيرة على الأرض إذا اصطدمت بها.

ئەگەر هەسارۆچکە بەر زەوی بکەوێت، دەکرێ زیانگەلی گەورەی لێبکەوێتەوە.

[1929] بالَ يَبول، بُلْ، بَوْلاً، فهو بائل.

بال الطفلُ على نفسه.

منداڵەکە میزیکرد بە خۆیدا.

[1930] كان المستراح وسخاً جداً.

ئاودەستەکە زۆر پیس بوو.

[1931] لا تلمس مقداح البنقدية.

دەستمەدە لەپەلەپیتکەی تفەنگەکە.

[1932] باڵا بەمانای بەرز.

إذا تعرضت لإساءة، لا تفكر في أقوى رد، بل فكر في أفضل رد، الاخلاق السامية شيء رائع ! - جان جاك روسو

گوێی شەیتان کەڕ بێ و چاویشی کوێر بێ و هەر چوار پەلیشی بشکێ ئەگەر خراپەیەکت بەرامبەر کرا، بیر لەبەهێزترین کاردانەوە مەکەرەوە، بەڵکو بیر لەباشترین کاردانەوە بکەرەوە. رەوشتی باڵا شتێکی نایابە.

[1933] چاوگی "سمُلَ"ن.

سمُلَ يَسمُل ، سَمالةً وسُمُولةً ، فهو سَمِيل.

سمُلَ قميصه الجديد بسرعة لأنه كان رخيصاً.

کراسە تازەکەی زوو کۆنبوو لەبەرئەوەی هەرزان بوو.

[1934] دقَّ، دَققْتُ، يَدُقّ، ادْقُقْ/ دُقَّ، دَقًّا، دِقّ، دِقَّةً، فهو دقيق و دَاقّ، والمفعول مَدْقوق

بێگومان مەبەستم لەوشەی (شکان) لێرەدا (شکاند)ە، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە پیتی دالەکەم نەنوسیوە.

دَقَّ جِسْمُهُ بعد المرض.

(دِين) واتە ئاين، جەمعەکەی (أَديان)[1935]

**.789** (انجبرَ) چيە؟ خۆيگرتەوە[1936]

(فَوْز) بردنەوە[1937]، (فازَ) بردەوە[1938]

**.790** (حَفيد) کچەزا، کۆکەی (حَفَدة)[1939]

---

پاش نەخۆشييەکە جەستەی لاوازبوو.

دَقَّ الطفل التلفاز.

منداڵەکە تەلەفزيۆنەکەی شکاند.

1935 {إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلاَمُ}

بێگومان ئايين لەلای خودا ئيسلامە.

هدف الدين أن تُسيطر على نفسك، ليس على الآخرين.

ئامانجی ئاين کۆنترۆڵکردنی خۆتە نەك خەڵك.

1936 انجبر العظمُ المكسور.

ئێسکە شکاوەکە خۆيگرتەوە.

1937 فوز برشلونة أحزن جماهير النادي الملكي.

بردنەوەکەی بەرشەلۆنە، جەماوەری يانەی شاهانەی خەفەتبارکرد.

1938 فازَ يَفوز فُز فَوْزًا، فهو فائِز. لەکاتێکدا بەمانای بردەوە دێت کە بەدوايدا پيتی (ب) هەبێت.

اللاعب فاز بالجائزة للمرة الثالثة على التوالي.

ياريزانەکە بۆ جاری سێيەم لەسەر يەك، خەڵاتەکەی بردەوە.

1939 هەروەها بە "أَحفاد"و "حُفَداء"يش کۆدەکرێتەوە. بێگومان وشەی "حفيد" بە مانای کوڕەزاش دێت.

هناك رجل أراد أن ينتحر، فرأه الحكيم فقال له: لماذا تريد أن تنتحر؟

فقال الرجل : عندي مشكلة عائلية معقدة!!

فقال الحكيم : ما من مشكلة الا ولها حل .. وما هي مشكلتك ؟؟

قال الرجل : تزوجت آمراة ارملة ولها بنت، فلما رآها أبي" أحب أن يتزوج ببنت زوجتي الأرملة ... صار أبي زوج إبنتي وصرت أنا حمو أبي. ولما ولدت زوجتي صار الولد حفيد أبي !!! وبما أن ولدي هو أخ زوجة أبي التي هي حماتي صار ولدي خالي !! ولما ولدت زوجة أبي صار ولدها أخي من أبي وفي نفس الوقت حفيدي لأنه حفيد زوجتي من بنتها !!! وبما أن زوجتي صارت جدة أخي فهي بالتالي جدتي وانا حفيدها !! وبهذا أصير زوج جدتي وحفيدها لانها جدة أخي !! فانا أصير جد أخي وبنفس الوقت أصير جد نفسي وحفيد نفسي!!!

فقال الحكيم : توكل على الله وأنتحر " الله ياخذك " ويأخذ أبيك" واب الذي يسألك مرة ثانية!!!!..

پياوێك دەيەوێت خۆی بکوژێت. حەکيمێك دەيبينێت و پێيدەڵێت: بۆچی دەتەوێت خۆت بکوژيت؟

پياو: لەبەرئەوەی کێشەيەکی خێزانيی ئاڵۆزم هەيە.

(حَقْو) هەم (خَصْر) مانای ناوقەدە[1940]

**791.** (كَلام) چیە؟ قسەكردن[1941]

(أكَلَ) واتە خوارد، (أَكْل)یش خواردن[1942]

**792.** (سِیاسة) رامیاری، كەواتە سیاسەت[1943]

---

حەكیم: هیچ كێشەیەك نیە چارەسەری نەبێت، كێشەكەت چیە؟

پیاو: بێوەژنێكم هێناوە كە كچێكی هەیە. كاتێك باوكم كچەكەی بینی حەزیلێكردو هێنای. بۆیە باوكم بوو زاوام و منیش بوم بە خەزوری باوكم.

كاتێك ژنەكەم كوڕێكی بوو، كوڕەكە بوو بە كوڕەزای باوكم و لەبەرئەوەی كوڕەكەم برای ژنەكەی باوكمە كە ئەویش دەكاتە خەسوم، كوڕەكەم دەبێتە خاڵم. كاتێكیش باوەژنەكەم كوڕێكی بوو، كوڕەكەی بوو بە برام لەباوكەوە، لەهەمان كاتدا بووە كچەزام لەبەرئەوەی كچەزای ژنەكەمە لەكچەكەیەوە.

كورە جا هێشتا چیت دیوە، لەبەرئەوەی ژنەكەم بووە نەنكی براكەم، كەواتە نەنكی منیشەو منیش كچەزای ئەوم. بەو شێوەیە دەبمە مێردی نەنكی خۆم و كچەزاشی لەیەك كاتدا چونكە ئەو نەنكی براكەمەو من دەبمە باپیرەی براكەم و هاوكات دەبمە باپیرەی خۆشم و كچەزای خۆشم.

لەم كاتەدا حەكیمە مێشكی دەئاوسێ و دەڵێ: ناوی خوای لێبێنەو بڕۆ خۆت بكوژە. خوا خۆت و باوكت و باوكی ئەوەش بگرێت كە جارێكی تر پرسیارت لێدەكات!!!

[1940] ناوقەد= كەمەر.

لا تنظر الى حقوها.

سەیری كەمەری مەكە.

تزوجت فتاة دقيقة الخَصْر.

كچێكی ناوقەد باریكم هێنا.

[1941] الكَلام مزيجٌ من الصِّدق والكذِب، أمَّا السّكوت فصدقٌ لَا غشَّ فيه. ـــ ميخائيل نعيمة.

قسەكردن تێكەڵەیەكە لەڕاستی و درۆ، بەڵام بێدەنگی راستییەكی بێ فرتوفێڵە.

[1942] كارو چاوگن یەك لەدوای یەك.

أكَلَ يَأكُل، اؤْكُل/ كُلْ، أَكْلاً، فهو آكِل، والمفعول مَأْكول.

{وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِنْدَ مَتَاعِنَا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ}

یوسفمان لەلای كەلوپەلەكانمان جێهێشت، دواتر گورگەكە خواردی.

يأكلون على مائدة معاوية ويمدحون زهد علي!

لەسەر خوانی موعاویە نان دەخۆن و ستایشی دونیانەویستی عەلی دەكەن!

[1943] السياسة هي فن سرقة المال العام، وتحويله إلى مال خاص!

سیاسەت بریتییە لەهونەری دزینی سامانی گشتی و گۆڕینی بۆ سامانی تایبەت!

(سُكوت) بێدەنگبون، بێدەنگبوو (سَكَتْ)[1944]

**.793** (سريرة) دڵە، لەگەڵ نهێنی[1945]

(شاف) سەیرکرد، هەروەها بینی[1946]

**.794** (حَلّ) چارەسەر، جەمعەکەی (حُلول)[1947]

(وَصَلَ) گەیشت، چاوگەکەی (وُصول)[1948]

**.795** (عرَفَ) ناسی، چاوگەکەی (عِرفان)[1949]

---

[1944] چاوگ و کاری هەمان وشەن.

سكَتَ يَسكُت، سُكوتًا وسُكاتًا، فهو ساكت، والمفعول مسكوتٌ عنه.

إذا كان الكلامُ من فضّة فالسُّكوت من ذهب.

ئەگەر قسەکردن زیو بێت، ئەوا بێدەنگبون زێرە.

[1945] جمع سَرائِر

قد يكون أجمل الأرزاق من الله تعالى هو صديق صدوق نقي السريرة يحبني ويحفظني في غيابي ووجودي.

رەنگە جوانترین رۆزی لەلایەن خوداوە بریتیبێت لەهاوڕێیەکی راستگۆی دڵپاك كە خۆشی بوێم و لەکاتی ئامادەبون و ئامادەنەبونیشمدا بمپارێزێت.

إنّ الله مطّلع على سريرتك.

بێگومان خودا ئاگاداری نهێنییەکەتە.

[1946] شافَ يَشُوف ، شُفْ، شَوْفًا، فهو شائف، والمفعول مَشُوف.

بەمانای (سەیرکردو بینی) دێت.

شافَ الحادثَ بنفسه.

خودی خۆی سەیری روداوەکەی کردو بینی.

[1947] نطلب إيجادَ حَلٍّ للأزمة الفلسطينيّة

داوای دۆزینەوەی چارەسەرێك دەکەین بۆ قەیرانی فەلەستین.

[1948] هەروەها بە (صلة)ش دەبێتە چاوگ.

وصَلَ يصِل، صِلْ، صِلَةً ووُصولاً، فهو واصل.

تمتلك القطط حاسة شم قوية للغاية. يمكنها شم رائحة شيء على مسافة تصل إلى 100 متر.

هەستی بۆنکردنی پشیلە هێندە بەهێزە کە دەتوانێت لەدورییی سەد مەتری ناسکەوە بۆنی شت بکات.

ئێستا تێگەیشتی بۆچی کاتێك ماسیتان هەیە بەبێ ئەوەی دەعوەتنامەی بۆ بنێریت، دەبێتە میوانتان!!!

[1949] عرَفَ يَعرِف، عِرفانًا، فهو عارِف، والمفعول مَعْروف.

في كل إنسان تعرفه، إنسان لا تعرفه.

(ثَبُتَ) خۆیڕاگرت[1950]، (أثبت) سەلمان[1951]

796. (كلأً) پاراست[1952]، چاوگەکەی (كِلاء)[1953]

(جاهِل) نەزانە، کۆکەی (جُهَلاء)[1954]

797. (بلسمَ) چیە؟ واتە تیمارکرد[1955]

(تَلَمَّظَ)یە بەمانای تامکرد[1956]

---

لەناخی هەر کەسێکدا کە دەیناسیت، کەسێك هەیە کە نایناسیت!

هناك سببان وراءَ عدم ثقتنا بالنَّاس:

الأوّل: أننا لا نعرفهم. الثّاني: أننا نعرفهم!. أنطون تشيخوف

متمانەنەکردن بە خەڵك دوو هۆکاری هەیە:

یەکەم ئەوەیە کە نایانناسین. دووەمیش ئەوەیە کە دەیانناسین!

1950 ثبَت الرئيس أمام الشَّائعات.

سەرۆك لەبەرامبەر دەنگۆکاندا خۆیڕاگرت. واتە خۆڕاگر بوو و تێکنەشکاو ملی نەدا.

1951 سەلمان= سەلماند.

أثبت كلامه بأدلة ملموسة.

قسەکەی بە بەڵگەی بەرچاو سەلمان.

1952 كلأَ اللهُ عباده.

خودا بەندەکانی پاراست.

1953 هەروەها بە "كِلاءَة"ش دەبێتە چاوگ.

كلأَ اللهُ عباده.

خودا بەندەکانی پاراست.

1954 لدى البعض فتاة جميلة جذابة جاهلة خير من نظيرتها الذكية القبيحة.

لەلای هەندێك، کچێکی جوانی سەرنجڕاکێشی نەزان لەیەکێکی زیرەکی ناشرین باشترە.

من أخلاق الجاهل الإجابة قبل أن يسمع، والمعارضة قبل أن يفهم، والحكم بما لا يعلم. جعفر بن محمد

هەندێك لەڕەوشتەکانی نەزان: وەڵامدانەوە پێش ئەوەی شتەکە ببیستێت. دژبون پێش ئەوەی لەمەسەلەکە تێبگات. بڕیاردان لەسەر شتێك کە لێینازانێت.

1955 بلسم الحرقَ.

سوتاوییەکەی تیمارکرد.

سوتانەکەی تیمارکرد.

1956 ما تلمَّظتُ اليوم بشيءٍ

ئەمڕۆ تامی هیچ شتێکم نەکرد.

**.798** (أَصْلَم)و (أجدع) هەردوو گوێبڕاو[1957]

(لُجَّة) "زۆربەی"یە[1958]، (لَجَّة) ژاوەژاو[1959]

**.799** (شاهَ) چیە؟ ناشرینبوو[1960]

(لَقَحَ)، (حمَل) مانای دوگیانبوو[1961]

**.800** (يَرَقة)، (يَرَقانة) هەردوو كرمۆكە[1962]

(أُصْبُع) پەنجەیە[1963]، (ظُفْر) نینۆكە[1964]

---

[1957] والده رجل أصلم.

باوكی پیاوێكی گوێبڕاو بوو.

لا تستهزيء بالأجدع.

گاڵتە بە گوێبڕاوەكە مەكە.

[1958] لُجَّة الأخبار محزنة.

زۆربەی هەواڵەكان خەفەتهێنە.

[1959] سمعت لَجّة الناس.

گوێم لەژاوەژاوی خەڵكەكە بوو.

[1960] شاه وجهه بعد العملية.

پاش نەشتەرگەرییەكە، دەموچاوی ناشرینبوو.

[1961] لَقَحتِ المرأةُ.

ژنەكە دوگیانبوو.

لا تحمل المرأة دون زواج.

ژن بەبێ هاوسەرگیری دوگیان نابێت.

[1962] كرمۆكە: قۆناغی سەرەتای گەشەكردنی زیندەوەرانی وەك مێرووەكان و هتد.

يرقة الحيوان صغيرة جداً.

كرمۆگەی زیندەوەر زۆر بچوكە.

هل تُرى يرقانة الضفدع بالعين المجردة؟

ئایا كرمۆكەی بۆق بە چاو دەبینرێت؟

[1963] جمع أصابع

يوجد في العادة خمس أصابع في كل قدم.

بەگشتی هەر پێیەك پێنج پەنجەی تێدایە.

[1964] جمع أَظْفار وأظفُر. جمع الجمع أظافير.

801. (ربَّعَ) واته كرد به چوار بەشۆ[1965]

(فَلاسِفَة)یه فەیلەسوف، بەس كۆ[1966]

802. (رَبْع) هەم گەڕەك، هەم بەهارەماڵ[1967]

(مَثَلْ) واته پەند، جەمعەكەی (أمثال)[1968]

803. (ربَّعَ) چیه؟ واته كرد به چوار[1969]

(صُعلوك) مانای سوك، هەروەها هەژار[1970]

---

ظفر يدك طويل.

نینۆكی دەستت درێژه.

1965 كرد به چوار بەشۆ= كرد به چوار بەشەوه.

ربَّع الرغيف لأولاده الأربعة.

كولێرەكەی كرد به چوار بەشەوه بۆ چوار منداڵەكەی.

1966 واته بەمانای فەیلەسوف دێت، بەڵام وشەكه كۆیه نەك تاك. تاكەكەی (فَیْلَسوف)ه.

لا تعتبر نفسك فيلسوفاً.

خۆت به فەیلەسوف مەزانه.

1967 جمع أَرباع وأَرْبُع ورِباع ورُبُوع.

بەهارەماڵ: جۆره ماڵێكی تایبەت به وەرزی بەهارەو لەو وەرزەدا خەڵك تێیدا دەمێننەوه.

أهلاً بك في رَبعِنا.

بەخێربێیت بۆ گەڕەكەكەمان.

الربوع في الأرياف كثيرة.

بەهارەماڵ لەگوندەكاندا زۆره.

بەهارەماڵ له

1968 قل لی مثلاً علی الجار.

پەندێكم لەسەر دراوسێ پێ بڵێ.

1969 ربَّعَ الجماعة المكونة من ثلاثة رجال.

ئەو كۆمەڵەیەی له سێ پیاو پێكهاتبوو، كرد به چوار (بەوەی كه خۆشی چووه ناویان).

1970 بەمانای سوك و هەژاریش دێت.

سوك= خوێڕی.

قيل للمتنبي : فلان يهجوك.. أجاب المتنبي: هذا صعلوك يريد أن أرد عليه فيدخل التاريخ!!

به كەڵەشاعیری عەرەب موتەنەبی دەڵێن: فڵانه كەس به خراپه باستدەكات.

804. چوارشەم (أَرْبَعاء) لەگەڵ (أَرْبِعاء)[1971]

(وَديع) لەسەرخۆ، کۆکەی (وُدَعَاء)[1972]

805. (يَحمَدُ) چيە؟ سوپاسدەکات[1973]

(قاسي) دڵڕەقە، جەمعەکەی (قُساة)[1974]

806. (شَكْل) شێوەیە، کۆکەی (أشكال)ە[1975]

(قالَ) واتە وت، چاوگەکەی (قالْ)ە[1976]

807. (فكَّرَ) واتە بیریکردەوە[1977]

---

لەوەڵامدا دەڵێت: ئەوە کەسێکی سوکە. دەیەوێت من وەڵامی بدەمەوەو لەو ڕێگەیەوە ناوی بچێتە مێژووەوە!

كلّ صعلوك جوادٌ.

هەموو هەژارێك بەخشندەیە.

1971 جمع أربعاءات وأربعاوات وأرابيعُ، مث أربعاءان وأربعاوان.

چوارشەم= چوارشەممە. هەروەها (أَرْبُعاء)یشی پێدەووترێت.

أقابلك الأربعاءَ القادمَ.

چوارشەممەی داهاتوو دەتبینم.

1972 زوجها شَابٌّ وَدِيعٌ.

مێردەکەی گەنجێکی لەسەرخۆیە.

1973 حمِدَ يَحمَد، حَمْدًا، فهو حامد، والمفعول مَحْمود وحَميد.

لا تقل: فلان لا يعرفني إلا وقت الحاجة، بل قل: الحمد لله الذي أكرمني بقضاء حوائج الناس. فأحب الناس إلى الله أنفعهم للناس.

مەفەرموو فلانەکەس تەنها کاتێك دەمناسێت کە پێویستی پێمبێت، بەڵکو بفەرموو: سوپاس بۆ ئەو خودایەی بە جێبەجێکردنی پێویستییەکانی خەڵك ڕێزی لێناوم. چونکێکوم خۆشەویستترین کەس لای خودا بەسودترینیانە بۆ خەڵك.

1974 من رأى في المنام أن صدره تحوّل حجراً فإنه يكون قاسياً.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی سنگی بووە بە بەرد ئەوە دڵڕەق دەبێت.

1975 الأشخاص الذين يمتلكون شعوراً عميقاً بالذنب، يستطيعون التعرف بشكل أفضل على مشاعر واهتمامات الأشخاص الآخرين.

ئەو فەخامەتانەی بەقوڵی هەست بە گوناهـ دەکەن، دەتوانن بە شێوەیەکی باشتر لەکەسانی تر، لەهەست و گرنگیپێدانەکانی خەڵك تێبگەن.

1976 هەروەها بە (قول) و (قيل)و (قالة)یش دەبێتە چاوگ.

قالَ يقول، قُلْ، قولاً وقالاً وقِيلاً وقَالةً، فهو قائل، والمفعول مقول.

قال لصديقه إنّك ناجح.

بە هاوڕێکەی وت بێگومان تۆ سەرکەوتویت.

(انتفشَ)یە خۆی گیڤکردەوە[1978]

**808.** (عبَّرَ) دەربڕی، هەم لێکدایەوە[1979]

وشەی (سبَّلَ) ئەی بەردایەوە[1980]

**809.** (عبَرَ) لێکداوۆ، لەگەڵ تێپەڕان[1981]

(استعبرَ)یە فرمێسکی رژان[1982]

**810.** "باز" مانای (بازْ)ە هەروەها (بازي)[1983]

(مَطلَب) بابەتە، لەگەڵ داخوازی[1984]

---

[1977] أنا أفكر، إذاً أنا موجود.

من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم.

[1978] انتفش القِطُّ.

پشیلەکە خۆیگیڤکردەوە.

[1979] عبَّرَ عمَّا في نفسه بأسهل طريقة.

بائاسانترین شێواز ئەوەی دەربڕی کە لەناخیدایە.

عبَّر الرُّؤيا دون الرجوع الى أي كتاب.

بەبێ گەڕانەوە بۆ هیچ کتێبێك، خەوەکەی لێکدایەوە.

[1980] سبَّلت الفتاه شعرَها.

کچەکە قژی بەردایەوە.

[1981] لێکداوۆ= لێکدایەوە. تێپەڕان= تێپەڕاند.

عبَر الحُلْمَ معتمداً على إبن سيرين.

بە پشتبەستن بە ئیبنو سیرین خەوەکەی لێکدایەوە.

عبَر النَّهرَ بخوف شديد.

بە ترسێکی زۆرەوە روبارەکەی تێپەڕاند.

[1982] فرمێسکی رژان= فرمێسکی رشت.

استعبرت عينُها لفراق ابنها.

بۆ کۆچی کوڕەکەی، چاوی فرمێسکی رژان. واتە خەفەتی خوارد.

[1983] الباز (البازي) طائر لاحم يصيد عادة الثديات الصغيرة، وأحيانا الطيور والزواحف.

باز باڵندەیەکی گۆشتخۆرەو بەگشتی زیندەوەرە مەمکدارە بچوکەکان و هەندێجاریش باڵندەو خشۆکەکان راودەکات.

[1984] قضى ليلته يفكر في مطلب فيزيائيّ.

شەوەکەی بە بیرکردنەوە لەبابەتێکی فیزیایی بەسەربرد.

**.811** (مَطْلَع) سەرەتا، لەگەڵ ئاسانسۆر[1985]

(غدَقَ) تەڕبوو، بەس بە ئاوی زۆر[1986]

**.812** (وَهّاج) چیە؟ بریقەدار[1987]

وشەی (أربعَ) مانای بوو بە چوار[1988]

**.813** (رِمْشُ العين) برژانگ، جەمعەکەی (رُموش)[1989]

بێسود، (عَبَثاً) هەروەها (فَشوش)[1990]

**.814** (فُرْصة) واتە هەل، جەمعەکەی (فُرَص)[1991]

---

دفع رواتب الموظفين في وقتها مطلبُ الناس جميعهم.

پێدانی موچەی فەرمانبەران لەکاتی خۆیدا داخوازیی هەموو خەڵکە.

1985 ئاسانسۆر= ئاسانسوار= مەسعەد.

مَطْلَع الشَّباب مرحلة حساسة.

سەرەتای گەنجێتی قۆناغێکی هەستیارە.

أخاف من المطلع.

لەئاسانسۆر دەترسم.

1986 غدَقتِ الأرضُ.

زەوییەکە تەڕبوو بە ئاوی زۆر، واتە زۆر تەڕبوو.

1987 برقەدار= گەش.

هل السراج الوهاج يؤذي العين؟

ئایا چرای بریقەدار ئازاری چاو دەدات؟

1988 أربعت الجماعة بعد انضمامي اليها.

پاش پەیوەندیکردنم پێوەیان، کۆمەڵەکە بوو بە چوار.

1989 بێگومان جەمعەکەی (رموش العين)و (رموش العينين)ە بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر عەین و عەینەینەکەم لابردووە.

تسقط رُموشُ عينيها كل من يراها.

هەرکەسێك برژانگەکانی ببینێت، دەیخات.

1990 حاول عَبَثًا.

بێسود هەوڵیدا. واتە هەوڵەکەی بێسود بوو.

عمل فَشوش، حاول أن تجد عملاً آخر.

کارەکەت بێسودە، هەوڵبدە کارێکی تر بدۆزیتەوە.

1991 بێگومان بە (فُرْصات)یش کۆدەکرێتەوە.

(عبِثَ) ياريكرد، چاوگەكەی (عَبَثْ)[1992]

**.815** (نـهَشَ) پێوەیدا، هەروەها گەستی[1993]

"ئارەزوباز"ە، ماناكەی (حِسِّيّ)[1994]

**.816** (أُسلوب) شێوازە، كۆكەی (أساليب)[1995]

"وەجاخزادە"یە ماناكەی (حَسِيب)[1996]

**.817** بدُونَك) چیە؟ واتە بەبێ تۆ[1997]

(حُظوظ) مانای بەخت، بەڵام تاك نا كۆ[1998]

---

الفرصة الضائعة لا تعوّض.

هەلی لەدەستچوو قەرەبووناكرێتەوە.

1992 عبِث الطِّفلُ بالكتب.

منداڵەكە یاری بە كتێبەكان كرد.

1993 نهَشته أفعى سامة ولكنه نجا من الموت.

مارێكی ژەهراوی پێوەیدا، بەڵام لەمردن رزگارییوو.

نهَشه الكلبُ ولكنه لم يصب بأذى.

سەگەكە گەستی بەڵام زیانی پێنەگەیشت.

1994 مەخسەوی شەریفم لە "ئارەزوباز" لێرەدا بریتییە لەكەسێك كە نقومبوی چێژە هەستی و ئارەزوبازییەكانە.

زوجها رجل حِسِّيّ، لذا تطلب الطلاق.

مێردەكەی پیاوێكی ئارەزوبازە، بۆیە داوای جیابونەوە دەكات.

1995 لكلّ كاتب أسلوبُه في الكتابة.

هەموو نوسەرێك شێوازی خۆی هەیە لەنوسیندا.

1996 وەجاخزادە= خانەدان.

عريسنا الجديد رجل حَسِيب ولكنه غير وسيم وغني.

زاوا تازەكەمان پیاوێكی وەجاخزادەیە بەڵام نە قوزە، نە دەوڵەمەندە.

1997 بدونك كانت أنهري مثل لياليّ

ولما جئت طلعت الشمس

بەبێ تۆ رۆژم وەكو شەو وابوو

كە تۆ هاتی ئینجا خۆر هەڵات

1998 تاكەكەی (حَظّ)ە.

حظٌّ في السحاب وعقلٌ في التراب.

**.818** (أَرْبُعاء) چیه؟ واته چوار شەممە[1999]

(دُونَ) "لەژێر"ە، هەم "لەبەردەم"ە[2000]

**.819** (مُضارِع) چیه؟ رانەبردوو[2001]

تێدەپەڕێنیٚ ماناى (يَعبُر)[2002]

**.820** (جَنَّة) بەهەشت، باخ، كۆی (جَنّات)، (جِنان)[2003]

(عبَرَ) واته فرمێسكی رژان[2004]

**.821** (مَطْل) چیه؟ دەستی دەستی[2005]

---

بەختی لەناو هەوردایەو عەقڵی لەژێر خاكدایە. پەندێكە بۆ گوزارشتكردن لەكەسێك بەكاردەهێنرێت كە بەختی باش بێ و عەقڵی كەم بێت.

1999 الأربعاءٌ يومٌ مباركٌ، يومٌ تُفتح فيه أبواب الرزق، ويُغلق فيه أبواب الشيطان." الإمام جعفر الصادق

چوار شەممە رۆژێكی پیرۆزە، دەرگای رزقی تێدا دەكرێتەوەو دەرگای شەیتانی تێدا دادەخرێت.

2000 دون قدمك بساط.

بەڕەیەك لەژێر پێتدایە.

مشى رجل دونك.

پیاوێك بە بەردەمتدا رۆشت.

2001 يجب عليك أن تتعلم قواعد الفعل المُضارِع.

پێویستە یاساكانی كاری رانەبردوو فێرببیت.

2002 رابردووەكەی "عبَرَ"یە. تێدەپەڕێنیٚ= تێدەپەڕێنێت.

عبر النهر بسهولة.

روبارەكەی بە ئاسانی تێپەڕاند.

2003 من رأى في المنام أنه دخل الْجنَّة فَإِنَّهُ يعْمل عملا صَالحا يسْتَوْجب بِهِ الْجنَّة وَإِن كَانَ خَائفًا أَمن وَأَن كَانَ مَرِيضا انْتقل من الدُّنْيَا إِلَيْهَا.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی چووە بەهەشتەوە، ئەوە كارێكی چاكە دەكات كە بەهەشتی بۆ مسۆگەردەكات، ئەگەر خەوبینەكە ترسی هەبوو، ترسەكەی نامێنێت، ئەگەر نەخۆش بوو ئەوە لەدنیا كۆچدەكات و دەچێتە بەهەشت.

ما أكثر الجنان في الرِّيف المصريّ.

دێهاتەكانی میسر ژمارەیەكی ئێجگار زۆر باخیان تێدایە.

2004 عبَرت عينُها حين رأت الأيتامَ.

كاتێك هەتیوەكانی بینی، چاوی فرمێسكی رژان.

2005 وعدُ الكريم نقد وتعجيل ووعدُ اللَّئيم **مَطْلٌ** وتعليل.

(تَوحيد) بەمانای یەکتاپەرستی[2006]

**822.** (سُلْطان) پادشاو بەڵگەو دەسەڵات[2007]

(بَصْمَة) پەنجەمۆر، جەمعەکەی (بَصْمات)[2008]

**823.** (مَطْلُوب) چیە؟ داواکراو[2009]

(کلامُ شرف) مانای قسەی پیاو[2010]

**824.** (شرَّفَ) چیە؟ شکۆدارکرد[2011]

(ضاري) دڕندە، دێش بەمانای توند[2012]

---

بەڵێنی مرۆڤی بەڕێز کاش و پەلەکردنە، بەڵام هی بەدکار دەستی دەستی و بیانوهێنانەوەیە.

[2006] من رأى في المنام أَن بِيَدِهِ مِفْتَاح الْجنَّة فَإِنَّهُ يتوفى على التَّوْحِيد.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی کلیلی بەهەشتی بەدەستەوە، ئەوە بێگومان لەسەر باوەڕی یەکتاپەرستی دەمرێت.

[2007] من رأى في المنام نار جهنم فِي مَوضِع دلّ على أَن هُنَاكَ سُلْطَانا غشوما أَو رجلا مسلطا لَا يحل حَلَالا وَلَا يحرم حَرَامًا وَيكون فِي ذَلِك الْموضع حَرْب أَو جوع وارتفاع أسعار السلع.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی ئاگری دۆزەخ لەشوێنێکدایە، ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پادشایەکی ستەمکار لەو شوێنەدایە، حەڵاڵ حەڵاڵناکات و حەرام حەرامناکات و جەنگ یان برسێتی و بەرزبونەوەی نرخی شتومەکی تێدا رودەدات.

{يُجَادِلُونَ فِي ءَايَاتِ اللهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ}.

چەلەحانێ لەسەر ئایەتەکانی خودا دەکەن بەبێ بەڵگە.

ليس له سلطان على إبنه.

دەسەڵاتی بەسەر کوڕەکەیدا نیە.

[2008] هەروەها بە (بَصَمات)یش کۆدەکرێتەوە.

تُطلب من الأمّيين بَصماتهم على العقود.

نەخوێندەواران داوای پەنجەمۆریان لێدەکرێت لەسەر گرێبەستەکان.

[2009] زوجها مطلوب من المحكمة.

مێردەکەی داواکراوە لەلایەن دادگاوە.

[2010] ألبّي كل حاجاتك المادية، خذ هذا مني ككلام شرف.

هەموو پێداویستییە مادییەکانت دابیندەکەم. ئەمە وەك قسەی پیاو لەمن وەرگرە.

[2011] التواضع يشرّف الإنسان.

خۆبەکەمگری (خاکێتیی) مرۆڤ شکۆداردەکات.

[2012] لا تقترب من الحيوان الضاري.

لەئاژەڵی دڕندە نزیك مەبەرەوە.

**.825** (عبِثَ) واته سوكايەتيكرد[2013]

(أشرفَ على) سەرپەرشتيكرد[2014]

**.826** (أشرفَ) واته نزيكبووەوە[2015]

(انتفشَ)يە ماناى شيبووەوە[2016]

**.827** (أربعَ) چيە؟ "كەوتەبەهار"ە[2017]

(عدَّدَ) ژمارد[2018]، (عَدَدْ) ژمارە[2019]

---

واجه الجيش الإسرائيلي معركة ضارية ضد حماس.

سوپاى ئيسرائيل روبەڕوى جەنگێكى توند بووەوە لەدژى حەماس.

[2013] عبِث الملحد بالدِّينِ.

بێباوەڕەكە سوكايەتيكرد بە ئايين.

[2014] أشرف المدير نفسه على المشروع.

خودى بەڕێوەبەر سەرپەرشتى پرۆژەكەى كرد.

[2015] من رأى في المنام أنه نَازل مِن السماء فَإِنَّهُ يشرف على الْمَوْت ثمَّ ينجو.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بينى لەئاسمانەوە دابەزيوە، ئەوە لەمەرگ نزيكدەبێتەوە، پاشان رزگاريدەبێت. بەكورديیەكەى خۆمان لەسەر پەتەكە دەگەڕێتەوە!

[2016] انتفَش الصُّوفُ بسبب الريح.

خوريیەكە بەهۆى باوە شيبووەوە.

[2017] أربع سكان القرى، فانشغلوا بالزراعة.

دانيشتوانى گوندەكان كەوتنەبەهار، بۆيە سەرقاڵ بون بە كشتوكاڵ.

[2018] عدَّد نقودَه بدقة عالية.

زۆر بەوردى پارەكەى ژمارد.

عدد الأشخاص الذين يمتلكون هواتف محمولة يفوق عدد المراحيض.

ژمارەى ئەو كەسانەى لەجيهاندا مۆبايليان هەيە، لەژمارەى تەواليتەكانى جيهان زياترە.

[2019] كم كان عدد سكان مصر في عام 1950؟

ژمارەى دانيشتوانى ميسر لەساڵى 1950 چەند بووە؟ 22 مليۆن.

كم عدد السور المكية في القرآن الكريم؟ (90، 85، 114) 85

ژمارەى سورەتە مەكييەكان چەندە لەقورئانى پيرۆزدا؟

الأعداد من 3 إلى 10 تخالف المعدود تذكيرًا وتأنيثًا.

ژمارەكان لە سێوە تا 10 پێچەوانەى بژێردراوەكانن لەڕووى نێرو مێوە.

**.828** (دُونَ) کەمتر لە، هەمیش "لەدوای"یە[2020]

(تبخَّرَ)یە، مانای "نەما"یە[2021]

**.829** (طلَعتِ الشمس) واتە خۆر هەڵات[2022]

(قَطْرَة) تنۆکە، کۆکەی (قَطَرات)[2023]

**.830** (سريعًا) چيە؟ بەمزوانە[2024]

(واجِب) واتە ئەرك[2025]، (فرَضَ) "سەپان"ە[2026]

---

نمونە:

ثلاثة رجال شجعان. عشر فتيات جميلات.

سێ پیاوی ئازا. دە کچی جوان.

[2020] دوان لەماناکانی "کەمتر لە"و "لەدوای"ە.

عُمر ولدي دون خمس سنوات.

تەمەنی کوڕەکەم کەمتر لە پێنج ساڵە.

جلس الوزير دون الأمير.

وەزیرەکە لەدوای شازادەوە دانیشت.

[2021] مانایەکی مەجازییە، مانا حەقیقییەکەی "بوو بە هەڵم"ە.

تبخَّر الكتاب في السوق بعد مدة قصرة من نشره.

پاش ماوەیەکی کەم لەبڵاوکردنەوە، کتێبەکە لەبازاڕدا نەما.

[2022] من رأى في المنام أن الشَّمْس طلعت فِي بَيته فَإِن كَانَ عزباً تزوج من أهل بَيت السُّلْطَان ونال من سُلْطَانه بِقدر مَا رأى من ضوئها.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی خۆر لەماڵی ئەوەوە هەڵهات، ئەگەر ئەو کەسە سینگڵ بوو، هاوسەرگیری لەگەڵ خزمێکی پادشادا دەکات و بەقەدەر ئەو روناکیی خۆرەی لەخەوەکەدا بینی، دەسەڵاتی دەستدەکەوێت.

[2023] بێگومان بە (قَطْرات)یش کۆدەکرێتەوە.

قطرة خير من لا شيء.

تنۆکێك لەهیچ باشترە.

[2024] بێگومان بەمانای "بەخێرایی"ش دێت.

من رأى في المانم نجما سقط عَلَيْهِ مَاتَ سَرِيعاً.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی ئەستێرەیەك کەوت بەسەریدا، ئەوە بەمزوانە عومری درێژی بۆ تۆ جێدەهێڵێت!

[2025] جمع واجبات

القيام بأركان الإسلام الخمسة واجبٌ دينيّ.

جێبەجێکردنی پێنج کۆڵەکەکەی ئیسلام ئەرکێکی ئاینییە.

**.831** (عزَلَ) چيه؟ لەسەر كار لادا[2027]

(استحثَّ)يە بەمانای هاندا[2028]

**.832** (شرِبَ) خواردەوە، (يَشرَبْ) دەخواتۆ[2029]

(نِساء) واتە ژن، بەڵام تاك نا كۆ[2030]

**.833** (مِسْطَرة) راستە[2031]، (خَطّ) نوسين و هێڵ[2032]

---

[2026] فرَضَ يَفرِض ، فَرْضًا ، فهو فارِض ، والمفعول مَفْروض.

بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی "سەپان" بریتییە لەسەپاند بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە، پیتی دالەکەم نەنوسیوە.

فرَضت الحكومة حَظْرَ التجول في المنطقة عقب اغتيال الوزير.

پاش تیرۆرکردنی وەزیرەکە، حکومەت قەدەغەکردنی هاتوچۆی لەناوچەکەدا سەپاند.

[2027] من رأى في المنام أَن السَّحَاب غطى الشَّمْس فَإِن الْملك يَمُوت أَو يقهر أَو يعْزل.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی هەور خۆی داپۆشی، ئەوە پادشا دەمرێت یان زاڵدەبن بەسەریدا یان لەسەرکار لادەبرێت.

[2028] يستحثّ الأستاذُ طُلابَه على السّعي الجادّ.

مامۆستا خوێندکارەکانی هاندەدات بۆ هەوڵدانی شێلگیرانە.

[2029] رابردوو رانەبردووی هەمان کارن. دەخواتۆ= دەخواتەوە.

من رأى في المنام أَنه يشرب من مَاء الْمَطَر فَإِن كَانَ صافيا أصَاب خيرا وَإِن كَانَ كدرا مرض بِقدر مَا شرب.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی ئاوی باران دەخواتەوە، ئەگەر ئاوەکە روون بوو ئەوە توشی خێر دەبێت، ئەگەر لێڵیش بوو، ئەوە بەقەدەر لێڵیی ئاوەکە نەخۆشدەکەوێت. واتە تا لێڵتر بێت نەخۆشییەکەی خراپتر دەبێت.

[2030] تاکەکەی (امرأة)يە.

"النساء هن نصف المجتمع، وإذا فسد نصفه فسد المجتمع كله." — أفلاطون

ژنان نیوەی کۆمەڵگان، ئەگەر نیوەی کۆمەڵگاش خراپبوو، ئەوا تەواوی کۆمەڵگاکە خراپدەبێت.

[2031] جمع مِسْطرات ومَساطِر

نسيت المسطرة في البيت.

راستەکەم لەماڵەوە بیرچوو.

[2032] جمع خُطوط

بەمانای نوسین (بەدەست نەك بە کۆمپیوتەر) و هێڵیش دێت.

خطّك جميل.

نوسینت جوانە. واتە دەسخەتت جوانە.

هل تستطيع رسم خطّ مستقيم بدون إستخدام المسطرة؟

ئایا دەتوانیت هێڵێکی راست بکێشیت بەبێ بەکارهێنانی راستە؟

(كدُرَ) لێڵبوو[2033]، (كَدِرْ) واته لێڵ[2034]

**.834** (دَيْن) واته قەرز[2035]، (مَديون) قەرزدار[2036]

(أربعت) منداڵیبوو لەبەهار[2037]

**.835** لەشپیسی چیە؟ واته (جَنابة)[2038]

وشەی (أَب)و (أبّ) هەردوكیان "باب"ە[2039]

---

[2033] كدُرَ يَكدُر، كدارةً وكُدُورةً، فهو كدير.

كدُر الماءُ بسبب المعمل.

ئاوەكە بەهۆی كارگەكەوە لێڵبوو.

[2034] إن رأى مريض في المنام مَطَرا شَدِيدا كدرا متواترا هلك فِي ذَلِك الْمَرَض.

ئەگەر نەخۆشێك لەخەودا بارانبارینێكی توندی لێڵی بەردەوامی بینی، ئەوە ئەو كەسە بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە عومری درێژی بۆ تۆ جێدەهێڵێت!

[2035] جمع دُيُون

ابن المقفع: "من عاش بالدين مات بالهم."

ئەوەی بە قەرزەوە بژی، بە خەفەتەوە دەمرێت.

[2036] من رأى في المنام أَنه يتَوَضَّأ بِمَاء صَاف وَأتم وضوءه فَإِن كَانَ مهموما فرج الله همه أَو خَائفًا أَمنه الله أَو مَرِيضا شفَاه الله أَو مديونا قضى الله دينه أَو ذَا ذنُوب كفر الله عَنهُ.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی بە ئاوێكی روون دەستنوێژ دەگرێت و دەستنوێژەكەی تەواوكرد، ئەوە ئەو كەسە ئەگەر خەفەتێكی هەبێت، خودا لەكۆڵیدەكاتەوە، ئەگەر ترسی لەشتێك هەبێت، ترسەكەی ناهێڵێت، ئەگەر نەخۆش بێت، چاكیدەكاتەوە، ئەگەر قەرزدار بێت، خودا قەرزەكەی بۆ دەداتەوە، ئەگەر گونهاكاریش بێت، خودا لێی خۆشدەبێت.

[2037] أربعت الحاملُ.

دووگیانەكە لەبەهار منداڵیبوو.

[2038] من رأى في المنام أَنه اغْتسل من الْجَنَابَة وَأتم غسله فَإِنَّهُ يتم لَهُ الْأَمر الَّذِي يُرِيدهُ وَإِن لم يتم غسله لم يتم أمره.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی خۆشتنی لەشپیسی ئەنجامداو خۆشتنەكەی تەواوكرد، ئەوە مانای وایە ئەو كارە تەواودەكات كە بەنیازە بیكات، بەڵام ئەگەر خۆشتنەكەی تەواونەكرد، ئەوە ئەو كارەی بۆ تەواونابێت.

[2039] باب= باوك

يعيش أبي في القرية.

باوكم لەگوند دەژی.

خيرُ الأبِ من ربَّى ولدَهُ على عِلمٍ وأدبٍ.

باشترین باوك ئەو كەسەیە كە منداڵەكەی لەسەر زانست و ئەدەب پەروەردەدەكات.

**.836** (مَلاك) و (مَلَك) هەردوو فریشتە[2040]

(سَهْل) ئاسانە، هەروەها دەشتە[2041]

**.837** (غالي) گرانە[2042]، (مَجّانيّ) بەلاش[2043]

(سَيِّء) خراپە[2044]، (جَيِّد) واتە باش[2045]

---

كان لي نعم الأبّ.

باشترین باوکم هەبوو.

[2040] هەردوکیان بە (مَلائِكَة) و (مَلائِك)یش کۆدەکرێتەوە.

فریشتە= پەری.

زوجتها جميلة ملاك بمعنى الكلمة.

ژنەکەی فریشتەیە بەمانای وشە.

نزل المَلَك على النّبي ﷺ في الغار.

لەئەشکەوت، فریشتە بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) دابەزی.

[2041] ئەگەر بەمانای دەشت بێت، جەمعەکەی (سُهول)ە.

سؤالك سهل ولكنني رغم ذلك لا أجيب عنه.

پرسیارەکەت ئاسانە، بەڵام سەرباری ئەوەش وەڵامی نادەمەوە.

الأستاذ: ما رأيكم يا أولادي بأسئلة الامتحان؟

تلميذ: الأسئلة سهلة جداً، لكن الأجوبة كانت صعبة!

مامۆستا: رۆڵەکانم پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکە چۆن بوون بەلاتانەوە؟

قوتابی: پرسیارەکان زۆر ئاسان بون، بەڵام وەڵامەکان قورس بوون!

ذلك السهل الشاسع ملك أبي.

ئەو دەشتە فراوانە موڵکی باوکمە.

[2042] لا استطيع شراء اللباس الغالي.

ناتوانم جلوبەرگی گران بکڕم.

[2043] بەلاش= خۆڕایی= بێبەرامبەر.

الاشتراك في الدورة مَجّانيّ.

بەشداریکردن لەخولەکە بێبەرامبەرە.

[2044] زوجها سَيِّئُ السُّمْعَةِ.

ناوبانگی مێردەکەی خراپە.

[2045] حاول أن ترفع مستواك الدراسي من الجيّد إلى الأجود.

هەوڵبدە ئاستی خوێندت لەباشەوە بۆ باشترین بەرزبکەیتەوە.

838. (مُطَّلِع) چیه؟ تێگەیشتوو[2046]

نەخۆشدەکەوێت، مانای (یمرَضُ)[2047]

839. (یَسجُدُ) چیه؟ کڕنوشدەبات[2048]

(سَجْدة) کڕنوشە، کۆکەی (سَجَدات)[2049]

840. (نسِيَ) چیه؟ بیریچووەوە[2050]

(انشقَّ الفجرُ) واتە ڕۆژ بووەوە[2051]

841. (سَعَة) چیه؟ خۆشگوزەرانی[2052]

(استصعبَ)یە بە قورس زانی[2053]

842. (حذَقَ) تیژبوو، چاوگ (حَذَاقة)[2054]

---

[2046] زوجها ناقد مطَّلع.

مێردەکەی ڕەخنەگرێکی تێگەیشتووە.

[2047] من رأى في المنام أنه يُصَلِّي بِغَيْر وضوء فَإِنَّهُ يمرض.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی بەبێ دەستنوێژ نوێژدەکات، ئەوە نەخۆشدەکەوێت.

[2048] من رأى في المنام أَنه يسْجد لله تَعَالَى فَإِنَّهُ شكر لله وَطول حَيَاة للرائي.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی کڕنوش بۆ خودای باڵادەست دەبات، ئەوە ئاماژەیە بۆ سوپاسکردنی خوداو تەمەندرێژیی خەوبین.

[2049] هەروەها بە (سَجْدات)یش کۆدەکرێتەوە.

عبّر المؤمنون عن شكرهم لله بِسُجْدةٍ طويلة.

بڕوادارەکان لەڕێگەی کڕنوشێکی درێژەوە، سوپاسی خۆیان بۆ خودا دەربڕی.

[2050] من رأى في المنام أَنه يقْرَأ شَيْئا من الْقُرْآن وَلَا يعرف مَا قَرَأَهُ أَو نَسيَه فَإِن كَانَ مَرِيضا شفَاه الله أَو مهموما فرج الله همه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی کەمێك لەقورئان دەخوێنێتەوەو نازانێت چی خوێندەوە یان لەبیریچووەوە، ئەوە ئەو کەسە ئەگەر نەخۆش بێت خودا چاکیدەکاتەوەو ئەگەر خەفەتێکی هەبێت خودا لەکۆڵی دەکاتەوە.

[2051] انشقَّ الفجرُ وبدأَت الطّيورُ تغرّدُ في الأشجارِ.

ڕۆژبووەوەو باڵندەکان لەسەر درەختەکان دەستیانکرد بە جریواندن.

[2052] قراءة سورة الْفَاتِحَة في المنام تدل على حج أَو دُعَاء يُسْتَجَاب أَو تسهيل الْأُمُور الصعاب وَحُصُول الْخَيْر وَالسعَة.

خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە لەخەودا ئاماژەیە بۆ حەجکردن یان دوعای قبوڵکراو یان ئاسانکاری لەکاروباری سەخت و گەیشتن بە خێرو خۆشگوزەرانی.

[2053] بە قورس زانی= بە قورس دانا.

استصعب الخروجَ في المطر لذا بقي في البيت.

(رِزْق) رۆزییە، کۆکەی (أرزاق)ە[2055]

**.843** (قرَّبَ) واتە نزیککردەوە[2056]

(حنِث بِـ) مانای هەڵوەشاندەوە[2057]

**.844** (قِرْبَة) مەشکەیە، کۆکەی (قِرَب)ە[2058]

بە نزیك زانی ئەی (استقرَبَ)[2059]

**.845** (بدُنَ)، (سَمِنَ) هەردوو قەڵەوبوو[2060]

---

چونەدەرەوەی لەکاتی باراندا بەقورس زانی، بۆیە لەناو ماڵدا مایەوە. واتە بەلایەوە قورس بوو.

2054 هەروەها بە (حِذْق)یش دەبێتە چاوگ.

بێگومان دەبوو لەبری "چاوگ (حَذَاقة)" بمنوسیایە "چاوگەکەی (حَذَاقة)یە" بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر، واملێکردووە.

حذَقَ الخلُّ بشدة فلم أستطع شربه.

سرکەکە زۆر تیژبوو، بۆیە نەمتوانی بیخۆمەوە.

2055 من رأى في المنام أنه يقْرَأُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ خاصَّة فَإِنَّهُ يسْأَل الله الْبركَة فِي مَاله وَالزِّيَادَة فِي رزقه وَرُبمَا يُجَاب دعاؤه ببركتها.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی بەتایبەتی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) دەخوێنێتەوە، ئەوە داوا لەخودا دەکات بەرەکەت بخاتە سامانی و رۆزی زیادبکات، رەنگە بەهۆی بەرەکەتی ئەو ئایەتەشەوە، دوعاکەی گیرا ببێت.

2056 قرَّب الكسرَ إلى أقرب عدد صحيح.

کەرتەکەی بۆ نزیکترین ژمارەی تەواو نزیککردەوە.

2057 حنِث بوعده لذا لا أصدقه من اليوم فصاعداً.

بەڵێنەکەی هەڵوەشاندەوە، بۆیە لەمڕۆ بەدواوە، بڕوای پێناکەم.

2058 هەروەها بە (قِرْبات)یش کۆدەکرێتەوە.

ملأت الفلاحةُ القِرْبةَ بالماء.

ژنەجوتیارەکە مەشکەکەی پڕکرد لەئاو.

2059 بە نزیك زانی= بە نزیك دانا

استقرب المنزلَ فلم يركب السيّارةَ.

ماڵەکەی بە نزیك زانی، بۆیە سوار ئۆتۆمبێل نەبوو.

2060 بدُن الرجلُ مِن كثرة الأكل.

پیاوەکە بەهۆی زۆر خواردنەوە قەڵەوبوو.

سمِن بعد شفائه من مرضه.

پاش چاکبونەوەی لەنەخۆشییەکە، قەڵەوبوو.

(استصعبَ)یە مانای قورسبوو[2061]

**.846** (عِفَّة) چیە؟ داوێنپاکی[2062]

وشەی (نُور) و (ضَوْء) هەردوو روناکی[2063]

**.847** (عصَبَ) چیە؟ پێچایەوە[2064]

(انشقَّ) مانای هەڵگەڕایەوە[2065]

**.848** (عُضْو) ئەندامە[2066]، (خَلِيَّة) خانە[2067]

---

[2061] استصعبَتْ المسألةُ الحسابيّةُ بعد طرحها من قبل مدرس مزعج.

پاش پێشکەشکردنی لەلایەن مامۆستایەکی بێزارکەر، پرسیارە حسابییەکە قورسبوو.

[2062] العِفَّة تاج رأس الإنسان.

داوێنپاکی تاجی سەری مرۆڤە.

قراءة سورة الحج في المنام تدل على حج وعفة وأفعال مرضية فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَة وَنَجَاة من بلَاء إِن كَانَ الرَّائِي صَحِيحا وَإِن كَانَ مَرِيضا فَإِنَّه يَمُوت عَن قريب.

خوێندنەوەی سورەتی حەج لەخەودا ئاماژەیە بۆ حەجکردن و داوێنپاکی و کردەوەی دنیایی و قیامەتیی خوداڕازیکەر و رزگاربون لەبەڵا، ئەگەر خەوبینەکە لەشساغ بێت، بەڵام ئەگەر نەخۆش بوو، ئەوە عومری درێژی بۆ تۆ جێدەهێڵێت.

[2063] للمصباح نورٌ برّاق.

گڵۆپەکە روناکییەکی بریقەداری هەیە.

ضوء القنديل قليل لايكفي.

روناکیی چراکە کەمەو بەشناکات.

[2064] عصَب السجّادة بعد صلاة العشاء.

پاش نوێژی خەوتن بەرماڵەکەی پێچایەوە.

[2065] انشقَّ نائب رئيس الحزب عن حزبه بعد مشادة كلامية مع رئيسه.

پاش دەمەقاڵەیەك لەگەڵ سەرۆکی حزب، جێگری سەرۆك لەحزبەکە هەڵگەڕایەوە. واتە جیابووەوەو چووە پاڵ لایەنێکی دژ بە حزب.

[2066] جمع أعضاء.

الكبد عضوم مهم في الجسم.

جگەر ئەندامێکی گرنگە لەلەشدا.

أسرع عُضْو في جسم الإنسان هو العين. يُقدر أن تتلقى العين إشارات وترسلها للدماغ بمعدل يصل إلى ١٠٠ مرة في الثانية.

خێراترین ئەندام لە لەشی مرۆڤدا چاوە. ئەم ئەندامە دەتوانێت لەهەموو چرکەیەکدا 100 ئاماژە وەربگرێت و بینێرێت بۆ دەماخی شەریفت.

[2067] جمع خَليّات وخلايا.

(عاتِق)و (كَتِف) هەردوكیان "شان"ە[2068]

**849.** (شُكوك) گومانە، بەڵام تاك نا كۆ[2069]

(تنزَّهَ)یە ماناى دوركەوتۆ[2070]

---

الخلية السرطانية قاتلة أن لم تعالج بسرعة.

خانەى شێرپەنجەیى كوشندەیە ئەگەر بەزویى چارەسەر نەكرێت.

خلايا الدم الحمراء لديها عمر محدد، حيث تعمل لمدة تقريبية من 100 إلى 120 يومًا قبل أن تتلاشى. هذا يعني أن جسمك يقوم بإنتاج ما يقرب من 2.4 مليون خلية دم حمراء جديدة كل ثانية.

خانەكانى خڕۆكە سورەكانى جیسمى شەریفت تەمەنێكى دیاریكراویان هەیە كە 100 بۆ 120 رۆژى ناسكە، دواى ئەوە نامێنن. ئەمەش ماناى وایە كە لاشەت هەموو چركەیەك نزیكەى دوو ملیۆن و 400 هەزار خانەى خڕۆكەى سور بەرهەمدەهێنێت. ئەگەر بڕواش ناكەیت بیژمێرە!!!

[2068] جمع عاتق: عاتقون وعواتِق

جمع كتف: أكتاف وكُتوف

حملت الأمُّ طفلَها على عاتقها.

دایكەكە منداڵەكەى خستە سەر شانى.

"لا تضع عبء همومك على عاتق غيرك، فلكلّ إنسان همومه الخاصة." - علي بن أبي طالب

خەفەتەكانت لەسەر شانى هیچ كەسێكى تر دامەنێ، هەركەسەو خەفەتى تایبەت بە خۆى هەیە.

كتف الخروف لذيذ جداً.

شانى بەرخ زۆر بەچێژە.

ألم الكتف في المنام يدل على خلافات بين الرائي وزوجته أو امرأةٍ من أهله.

ئازارى شان لەخەودا ئاماژەیە بۆ بونى ناكۆكى لەنێوان خەوبین و ژنەكەى یان ژنێكى تر لەخزمەكانى.

[2069] تاكەكەى (شكّ)ە.

أوقعه الحادث في الشَّكّ.

رودواوەكە خستییە گومانەوە.

"الشك هو الموت البطيء لكل شيء جيد وجميل في الحياة. فإذا لم تثق بنفسك، فمن المستحيل أن يثق الآخرون بك" - أنايس نين.

گومان مردنى هێواشى هەموو شتێكى باش و جوانە لەژیاندا. ئەگەر فەخامەتى جەنابت متمانە بەخۆت نەكەیت، مەحاڵە خەڵك متمانەت پێبكەن.

[2070] دوركەوتۆ= دوركەوتەوە.

تنزَّه عن النظر الى النساء بعد الزواج.

پاش هاوسەرگیرى، لەسەیركردنى ژن دوركەوتەوە. واتە وازى لێهێنا.

قراءة سورة الشعرَاء في المنام تدل على التَّنَزُّه عَن الْكَلَام الْقَبِيح وَالْكذب وَالْفَوَاحِش وَرُبمَا تدل على عسر رزق الْقَارئ.

**.850** (بَدَنْ) جەستەیە، جەمعەکەی (أَبْدَان)[2071]

(تنزَّهَ)یە، ئەی چوو بۆ سەیران[2072]

**.851** (مُتَنَزَّه) چیە؟ سەیرانگایە[2073]

(بنَی) دروستکرد، چاوگ (بِناية)[2074]

**.852** (بَحْر) دەریایە[2075]، (ماء) بەمانای ئاو[2076]

---

خوێندنەوەی سورەتی شوعەرائـ لەخەودا ئاماژەیە بۆ دورکەوتنەوە لەقسەی ناشرین و درۆو گوناهـ، رەنگە ئاماژەش بێت بۆ کەوتنەتەنگانەی خەوبین لەڕوی رزق و رۆزییەوە.

2071 هەروەها بە (أبدُن)و (بُدون)یش کۆدەکرێتەوە.

أُجْريتْ له أشعة على بَدَنه.

پشکنینێکی تیشك بۆ لاشەی ئەنجامدرا.

العقل السليم في البدن السليم.

عەقڵی ساخ لە لەشی ساخدایە.

2072 تنزّه مع أصدقائه.

لەگەڵ هاوڕێکانیدا چوو بۆ سەیران.

2073 لنذهب اليوم الى مُتَنَزّه جديد.

ئەمڕۆ با بڕۆین بۆ سەیرانگایەکی تازە.

2074 بێگومان دەبوو ئەم نیوە بەیتەم بەم شێوەیە بنوسیایە: "(بنَی) دروستکرد، چاوگەکەی (بِناية)". بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر، چەند پیتێکم تیرۆرکردووە!!!

بە(بناء)و (بُنيان)یش دەبچێتە چاوگ.

يبني قصرًا ويهدم مصرًا.

کۆشکێك دروستدەکات و وڵاتێك خاپوردەکات.

يبني الرِّجالَ وغيره يبني القرى ... شتان بين قرى وبين رجالِ

ئەم پیاو دروستدەکات و ئەو گوندان.... ئای چەندە جیاوازە گوندان لەپیاوان

2075 ج بحر: أَبْحُر وبِحار وبُحور.

تكوّن البحار والمحيطات والأنهار أكثر من ثلثي مساحة الكرة الأرضية.

دەریاو زەریاو روبارەکان زیاتر لە دوو لەسەر سێی روبەری گۆی زەوی پێکدەهێنن.

أين يقع بحر المرجان؟

دەریای مەرجان دەکەوێتە چ وڵاتێکەوە؟ ئوستراليا

2076ج: أَمْواه و مياه

(بِرْكَة) گۆماوە[2077]، (مُستَنقَع) زەلكاو[2078]

**853.** (مَشَطَ) داهێنا[2079]، (مُشْط) مانای "شانە"[2080]

(لَوْن) واتە رەنگ، کۆکەی (ألوان)ە[2081]

**854.** (نشِقَ) بۆنکرد، چاوگ (نَشَقْ)ە[2082]

"یاوەریکرد"ە مانای (رافقَ)[2083]

**855.** (أَسلَمَ) چیە؟ موسڵمانبوو[2084]

---

یتجمَّد الماء عند درجة الصفر المئويّ.

ئاو لەپلەی سفری سەدیدا دەیبەستێت.

[2077] ج: بِرْكات و بِرَك

الأطفال يسبحون في بِرْكة نظيفة.

منداڵەکان لەگۆماوێکی پاکدا مەلەدەکەن.

[2078] جمع مُستَنْقعات

لا تسبح في المستنقع.

لەزەلکاودا مەلە مەکە.

[2079] مَشَطَ شعره، ثم خرج لموعده.

قژی داهێنا، پاشان چووەدەرەوە بۆ ژوانەکەی.

[2080] مُشْطك غير نظيف.

شانەکەت پاك نيە.

[2081] ما هي ألوان علم إيران؟ الأحمر والأخضر والأبيض.

ئاڵای ئێران لە چ رەنگێك پێکهاتووە؟ سورو سەوزو سپی.

[2082] بێگومان لەبەر پاراستنی کێشی شیعرەکە پاشگری "ەکەی"م لەوشەی "چاوگ" کردووەتەوە، ئەگینا دەبوو بمنوسیایە چاوگەکەی...

نشِق الأزهارَ وهو يتجول داخل الحديقة.

لەکاتی گەڕان بەناو باخچەکەدا، بۆنی گوڵەکانی کرد.

[2083] من هو الصحابي الذي رافق النبي أثناء رحلة الهجرة من مكة إلى المدينة؟ أبو بكر الصديق

ئەو هاوەڵە کێبوو کە یاوەری پێغەمبەری کرد لەکاتی کۆچکردنیدا لە مەککەوە بۆ مەدینە؟ ئەبوبەکری سدیق

[2084] أسلمَ يُسلم، إسلامًا، فهو مُسلِم

ما هي السورة التي كانت سببًا في إسلام عمر بن الخطاب؟ سورة طه

چ سورەتێك بووەهۆی موسڵمانبونی عومەری کوڕی خەتاب؟ تەها

(البحرُ الميّت) دەریاکەی مردوو[2085]

**856.** (صعَّبَ) چیە؟ واتە قورسکرد[2086]

(اِتَّهَمَ)یە ئەی تۆمەتبارکرد[2087]

**857.** (غابَ) ئاوابوو، هینەکەی (یَغیبْ)[2088]

(أَنبوب) بۆرییە، کۆی (أنابیب)[2089]

**858.** (صَحِیفة) چیە؟ واتە رۆژنامە[2090]

"بەڕۆژوو بوو"ە ماناکەی (صامَ)[2091]

**859.** ویلایەت چیە؟ مانای (وِلایة)[2092]

---

[2085] بێگومان لەبەر زەروراتی شیعر لەبری "دەریای مردوو" نوسیومە "دەریاکەی مردوو"، ئەگینا شوکر هۆشیارە والی!!!

أين يقع البحر الميت؟ الأردن

دەریای مردوو دەکەوێتە چ وڵاتێکەوە؟ ئوردون

[2086] صعَّب المعلّمُ الامتحانَ.

مامۆستاکە تاقیکردنەوەکەی قورسکرد.

[2087] اتَّهَمَ يتَّهم، اتِّهامًا، فهو مُتَّهِم، والمفعول مُتَّهَم

ئەی تۆمەتبارکرد واتە دێت بەمانای تۆمەتبارکرد. وشەی ئەی "أي" عەرەبییەو بەمانای "واتە" دێت. لەبەر زەروراتی شیعر بەکارمهێناوە.

ما هو الحيوان الذي تم اتهامه بأنه هو من قتل يوسف الصديق؟ الذئب.

ئەو ئاژەڵە چیە کە بە کوشتنی حەزرەتی یوسف تۆمەتبارکراوە؟ گورگ

[2088] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "هینەکەی" بریتییە لە "رانەبردووەکەی" بەڵام لەبەر کێشی شیعرەکە نوسیومە هینەکەی. واتە رانەبردووی " غابَ" بریتییە لە "يغيب".

ما هي الدولة التي كانت تطلق عليها الإمبراطورية التي لا تغيب عنها الشمس؟ بريطانيا

ئەو وڵاتە کوێیە کە لەڕابردوودا پێیدەوترا ئەو ئیمپراتۆریەتەی خۆری لێ ئاوانابێت؟

[2089] هەروەها بە (أُنبوب)یش دەنوسرێت. واتە دەتوانرێت هەمزەکە فەتحە یان زەممەی لەسەر بێت.

أنابيب الماء مكسورە.

بۆرییەکانی ئاوەکە شکاون.

[2090] في أي دولة يتم إصدار صحيفة اليوم السابع؟ مصر

رۆژنامەی "اليوم السابع" لەچ وڵاتێك دەردەچێت؟ میسر

[2091] من هو أول من صام من الأنبياء؟ سيدنا آدم عليه السلام

یەکەم پێغەمبەر کە بەڕۆژوو بووە کێیە؟ ئادەم

(جَناح) واته باڵ، هەروەها سایە[2093]

**.860** (مِنْ أَجْلِ) چیە؟ "لەپێناو"ە[2094]

(فَصیل) "گوێرەکەی لەشیربڕاوە"[2095]

**.861** (سُرْعة) خێرایی[2096]، (سَرِیع) خێرایە[2097]

(اِنحَرَفَ)یە مانای "لایدا"یە[2098]

---

[2092] هەروەها بە (وَلایة)یش دەنوسرێت واتە دەتوانرێت پیتی واوەکە کەسرەی لەژێر بێت یان فەتحەی لەسەر بێت.

ما هي أصغر ولاية أمريكية من حيث عدد السكان؟ بايومينغ

یچوکترین ویلایەتی ئەمەریکا لەڕوی ژمارەی دانیشتوانەوە کوێیە؟ بایۆمینگ

[2093] جمع أجْنُح وأجنحة

لا يطيرُ طائرٌ بجناحٍ واحدٍ.

باڵندە بە تەنها باڵێك نافڕێت.

الشاب يعيش في جناح والده الشهيد.

گەنجەکە لەسایەی باوکە شەهیدەکەیدا دەژی.

[2094] تركت الدنيا من أجلك.

لەپێناو تۆدا وازم لەدونیا هێنا.

من أجلِ الوصولِ إلى القمةِ، يجبُ عليكَ أن تُصعدَ الدرجَ خطوةً بخطوةٍ

لەپێناو گەیشتن بە لوتکە، پێویستە هەنگاو بە هەنگاو بەسەر قادرمەکەدا سەربکەویت.

من أجلِ أن تُسعدَ الآخرينَ، يجبُ عليكَ أن تُسعدَ نفسَكَ أولاً.

لەپێناو بەختەوەرکردنی کەسانی تر، پێویستە سەرەتا خۆت بەختەوەر بکەیت.

[2095] جمع فِصال وفُصْلان وفِصْلان.

بێگومان بەمانای بێچووەحوشتری لەشیربڕاوەش دێت.

لا تقترب من الفصيل، إنه مجنون.

لەگوێرەکە لەشیربڕاوەکە نزیك مەبەرەوە. شێتە.

[2096] يجب على سائقي السيارات الالتزام بحدود السرعة.

پێویستە شۆفیری ئۆتۆمبێلەکان پابەندی سنورەکانی خێرایی بن.

[2097] الطيارة أسرع من الصوت.

فڕۆکەکە لەدەنگ خێراترە.

[2098] انحرف عن دينه وصار ملحداً.

لەئاینەکەی لایداو بوو بە بێباوەڕ.

**862.** (رائِحة) بۆنه، كۆى (روائِح)ه[2099]

ئامۆژگارییه ماناى (نَصيحة)[2100]

**863.** (عالِم) زانايه[2101]، (عالَم) جيهانه[2102]

---

[2099] الماء عديم اللَّون وعديم الرائحة.

ئاو بێڕەنگ و بێبۆنه.

[2100] جمع نصائِح

من سمع النصيحة نجا من الفضيحة.

هەر كەسێك گوێ لەئامۆژگارى بگرێت، لەحەياچون رزگارى دەبێت.

النصيحةُ تُهدى ولا تُفرض.

ئامۆژگارى وەك ديارى پێكەشدەكرێت، ناسەپێنرێت.

[2101] ألبيرت آينشتاين عالِم مشهور.

ئەلبێرت ئاينشتاين زانايەكى بەناوبانگە.

قال الامام الشافعي رحمة الله "ما جادلت عالما الا وغلبته وما جادلت جاهلا الا وغلبنى".

ئيمامى شافيعى رەحمەتى خوداى لێبێت دەفەرمێت: مشتومڕم لەگەڵ هەر زانايەكدا كردبێت، لێمبردووتەوەو لەگەڵ هەر نەزانێكدا كردبێتم، لێيبردومەتەوە.

سأل رجل أحد علماء اللغة ما الكموج؟

فقال أين قرأتها؟

قال في قول امرؤ القيس:

وليل كموج البحر

فقال الكموج دابة تقرأ ولا تفهم!

پياوێك لەزانايەكى بوارى زمانەوانى دەپرسێت: ئەرێ "كموج" يانى چى؟ زاناكە دەڵێت: لەكوێ ئەو وشەيەت خوێندووەتەوە؟

پياو: لەشيعرێكى ئيمرەئولقەيس كە دەڵێت: "وليل كموج البحر ."

زانا: ئەها، "كموج" حەيوانێكە شت دەخوێنێتەوە بەڵام لێى تێناگات!!!

[2102] العالم يعاني من فايروس كورونا.

جيهان بەدەست ڤايرۆسى كۆرۆناوە دەناڵێنێت.

اغلى مشروب في العالم هو الشاي الذي تشربه حينما تخطب زوجتك، لأنك ستدفع ثمنه طيلة حياتك!!!

گرانترين خواردنەوە لەجيهاندا ئەو چايەيە كە لەكاتى خوازبێنيكردنى ژنەكەتدا خواردوتەتەوە، لەبەرئەوەى بەدرێژايى ژيانت باجەكەى دەدەيت!!!

وَلَيتَ الَّذي بَيني وَبَينَكَ عامِرٌ

وَبَيني وَبَينَ العالَمينَ خَرابُ

"جەستەی مرۆڤ"ە، (جسمُ الإنسان)ە[2103]

**864.** (مَنْفى) تاراوگەه، کۆی (منافي)یە[2104]

تەندروستییە مانای (عافية)[2105]

**865.** (رَقاعة) چیە؟ بێئەدەبییە[2106]

(دُعاء) نزایە، کۆکەی (أدعية)[2107]

**866.** (أعيا) پەکیخست، لەگەڵ پەکیکەوت[2108]

---

خۆزگە نێوان من و تۆ ئاوەدان بوایە

و نێوانی من و هەموو جیهان وێران بوایە. واتە ئەگەر نێوانی من و تۆ ئاوەدان بوایە، کێشە نەبوو ئەگەر نێوان من و هەرچی خەڵکە وێران بوایە.

[2103] جەستەی مرۆڤ= لاشەی مرۆڤ

أكبر عضو في جسم الإنسان هو الجلد. تبلغ مساحة سطح جلد الشخص البالغ حوالي مترين مربعين، ويزن حوالي 4.5 كيلوجرام.

گەورەترین ئەندام لەجەستەی مرۆڤدا پێستە. ڕوبەری پێستی کەسێکی پێگەیشتوو دەگاتە نزیکەی دوو مەتر دوجا. کێشەکەشی نزیکەی چوار کیلۆگرام و نیو دەبێت.

[2104] قضى المُعارِض السّياسيّ سنواتٍ في المنفى.

نەیارە سیاسییەکە ساڵانێکی لەتاراوگەدا بەسەربرد.

[2105] قراءة سورة الشورى في المنام تدل على علم وَعمل وَطول عمر فِي خير وعافية وينجو يَوْم الْقِيَامَة من عَذَاب النَّار ويسهل الله عَلَيْهِ الْحساب وَإِن كَانَ مَرِيضا عافاه الله.

خوێندنەوەی سورەتی شورا لەخەودا ئاماژەیە بۆ زانست و کارو تەمەندرێژی لەچاکەو تەندروستی و خەوبین لەڕۆژی قیامەتدا لەئاگری دۆزەخ ڕزگایدەبێت و خودا لێپێچینەوەی لەسەر ئاساندەکات. خۆ ئەگەر خەوبینەکە نەخۆش بوو، ئەوە خودا چاکیدەکاتەوە.

[2106] الرقاعة تذلّ المرء.

بێئەدەبی مرۆڤ ڕسوادەکات.

[2107] قراءة سورة الفتح في المنام تدل على دُعَاء يُسْتَجَاب وَخُرُوج من ضيق إِلَى سَعَة وظفر بِمَا يطْلب وَعزة وَقُوَّة رَجَاء فِي الله وَحشر مَعَ الْمُصْطفى ﷺ أَو يفتح الله لَهُ أَبْوَاب الْخيرَات وَيغْفر لَهُ ذنُوبه وينال مأموله أَو يوفق للْجِهَاد.

خوێندنەوەی سورەتی فەتح لەخەودا ئاماژەیە بۆ نزایەك كە گیرادەبێت و دەرچون لەتەنگانەوە بۆ خۆشگوزەرانی و بردنەوەی ئەوەی کاری بۆ دەکات و سەربەرزی و بەهێزیی هیوابون بە خوداو کۆبونەوە لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) لەڕۆژی قیامەت یاخود خودا دەرگای خێری بۆ دەکاتەوەو لەتاوانەکانی خۆشدەبێت و بە ئاواتی دەگات یان دەچێتە جیهاد.

[2108] أعيا الرجل الصَّومُ.

ڕۆژووەکە پیاوەکەی پەککخست.

أعيا المسافرُ بسبب الحرّ.

(اتَّبعَ)یە مانای شوێنیکەوت[2109]

**867.** (حَرارة) گەرمی[2110]، ساردی (بُرودَة)[2111]

ئامانج (مُراد)ە، هەمیش (مَقْصود)ە[2112]

**868.** (ضَرَّ) بەمانای زیانی پێگەیان[2113]

(غنِيٌّ عن التَّعريف) حەتمەن مانای بەناوبان[2114]

**869.** (إنجاء) چیە؟ رزگارکردنە[2115]

---

گەشتیارەکە بەهۆی گەرماوە پەکیکەوت.

[2109] اتَّبعَ يتَّبع، اتِّباعًا، فهو متَّبِع، والمفعول متَّبَع

قراءة سوره الحجرات في المنام تدل على اتِّبَاع مَا أَمر الله تَعَالَى أَو على أَن صَاحب الرُّؤْيَا يزدري النَّاس أَو يقْصد ضررهم.

خوێندنەوەی سورەتی حوجورات لەخەودا ئاماژەیە بۆ شوێنکەوتنی ئەوەی خودا فەرمانی پێکردووە، یان ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خەوبینەکە سوکایەتی بە خەڵك دەکات و دەیەوێت زیانیان پێبگەیەنێت.

[2110] شعر بحرارة في رأسه.

هەستی بە گەرمییەك کرد لەسەریدا.

[2111] استقبل صديقه بِبُرودَة.

بە ساردی پێشوازی لەهاوڕێکەی کرد.

[2112] أَخْفَى مُراد مشاعره خوفاً منْ ردةِ فعلِها.

لەترسی کاردانەوەی، ئامانجی هەستەکانی شاردەوە.

قراءة سورةالطور في المنام تدل على حُصُول مَقْصُود وَعلم وَعمل صَالح ومجاورة بِمَكَّة أَو نصر على الْأَعْدَاء أَو يكون الرَّائِي معينا للحق مجتنبا عَن الْبَاطِل وَقيل إِن كَانَ لَهُ غَائِب يَأْتِي وَرُبمَا يغلط بِكَلَام ثمَّ يرجع إِلَى الصَّوَاب.

خوێندنەوەی سورەتی (الطور) لەخەودا ئاماژەیە بۆ بەدەستهێنانی ئامانج و زانست و کاری چاك و چونەخەڵوەت لە مەککە یان سەرکەوتن بەسەر دوژمن یان خەوبین دەبێتە یارمەتیدەری حەق و خۆی لەناحەق بەدوردەگرێت. هەندێکیش دەڵێن ئەگەر خەوبین کەسێکی بێسەروشوێنی هەبێت، ئەوە دێتەوە، رەنگە خەوەکە ئاماژەش بێت بۆ ئەوەی کە خەوبین بە قسە هەڵەیەك دەکات و دواتر دەچێتەوە سەر رێی راست.

[2113] بێگومان مەبەستی شەریفم لە "پێگەیان" بریتییە لە "پێگەیاند"، بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر پیتی دالەکەم لابردووە.

ضرّ الحصارُ البلاد.

ئابڵوقەکە زیانی بە وڵات گەیاند.

[2114] مەبەستم لە "بەناوبان" بریتییە لە "بەناوبانگ"، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعر پیتی گافەکەم لابردووە.

مانای حەرفی ئەم دەستەواژەیە بریتییە لە "پێویست بە ناساندن ناکات" بەڵام مەبەست لێی ئەوەیە کە بەناوبانگە.

شيخ محمود الحفيد غني عن التعريف.

(كاذِب) هەم درۆ، هەم درۆزنە[2116]

**870.** (اِنسلى) چيە؟ واتە رەوييەوە[2117]

(اكتشفَ)يە ماناى دۆزييەوە[2118]

**871.** (غنِيَ) چيە؟ دەوڵەمەندبوو[2119]

(أخصبَ) بەپيتكرد، لەگەڵ بەپيتبوو[2120]

**872.** (خافَ) "ترسا"يە، (يخافْ) دەترسێ[2121]

---

شێخ مەحمودى حەفيد بەناوبانگە. واتە پێويست بە ناساندن ناكات.

[2115] چاوگى (أنجى)يە.

من أطاع العقلَ أنجاه ومن عصاه أرداه.

هەركەسێك گوێرايەڵى عەقڵ بكات، رزگاريدەكات، هەركەسێكيش لێى ياخى ببێت، لەناوى دەبات.

[2116] بە ماناى درۆ (پێچەوانەى راست)و درۆزن دێت.

الكاذب عدو نفسه.

درۆزن دوژمنى خۆيەتى.

أغلب أخبار قنوات السلطة كاذبة.

زۆربەى هەواڵەكانى كەناڵەكانى دەسەڵات درۆيە.

[2117] رەوييەوە: نەما

انسلى عنه الهمُّ بعد إسلامه.

پاش موسڵمانبونى، خەفەتەكەى لێ رەوييەوە.

[2118] اكتشف كُولُومْبُوس أمريكا سنة 1492م.

كۆلۆمبۆس ساڵى 1492ى زاينى ئەمەريكاى دۆزييەوە.

[2119] غنِيَ الشاب بعد موت أبيه.

گەنجەكە پاش مردنى باوكى، دەوڵەمەند بوو.

[2120] أخصبَ اللهُ المكانَ.

خودا شوێنەكەى بەپيتكرد.

أخصبتِ الأرضُ بعد المطر.

پاش بارانەكە، زەوييەكە بەپيتبوو.

[2121] كارى رابردوو رانەبردون. دەترسێ= دەترسێت.

خافَ يخاف، خَفْ، خَوْفًا وخِيفةً، فهو خائف.

"لا تخف من الفشل، بل خف من عدم المحاولة" - وينستون تشرشل

(كرةُ القدم) ماناى تۆپى پێ[2122]

**.873** (بُرْج) تاوەرە، كۆى (بُروج)، (أَبْرَاج)[2123]

(لَجَّ) پێیداگرت، چاوگەكەى (لَجَاج)[2124]

**.874** (نادِراً) چیە؟ واتە بە دەگمەن[2125]

(جُنَّة) قەڵغانە، جەمعەكەى (جُنَن)[2126]

**.875** (قصَمَ) لەناوبرد، هەروەها شكان[2127]

(رخُصَ) نەرمبوو، چاوگەكەى (رُخصان)[2128]

---

لەشكست مەترسە، بەڵكو لەهەوڵنەدان بترسە.

[2122] لعبة كرة القدم رياضة عالمية.

یاریی تۆپی پێ وەرزشێكی جیهانییە.

أكبر فوز في تاريخ لعبة كرة القدم هو فوز منتخب سيراليون ضد نظيره الغيني الاستوائي عام 2002 الذي فاز بنتيجة 149-0.

گەورەترین بردنەوە لەمێژوى یاریی تۆپی پێدا بردنەوەى هەڵبژاردەى سیرالیۆنە لەهەڵبژاردەى غینیاى ئیستیوائى لەساڵى 2002 كە بە ئەنجامى 149 گۆڵى خاوێن بۆ سیرالیۆن كۆتاییهات.

[2123] ما اسم البرج الأطول الذي بناه الإنسان طِوال حياة البشرية حتّى الآن؟

(برج إيفل، برج التجارة العالمي، برج خليفة في الإمارات)

درێژترین تاوەر كە مرۆڤ بە درێژایی ژیانی مرۆڤایەتی دروستیكردووە، ناوى چیە؟ تاوەرى خەلیفە لە ئیمارات

[2124] هەروەها بە (لجَج)و (لَجَاجة)ش دەبێتە چاوگ.

لجَّ عليه في تعيينه موظَّفًا بالشَّركة.

پێیداگرت لەسەرى بۆ دامەزراندنى وەك كارمەند لەكۆمپانیاكە. واتە سوربوو لەسەرى بۆ ئەو مەبەستە.

[2125] نادراً ما يلاحظ الناس ملابسك القديمة لو كنت ترتدي ابتسامة كبيرة.

ئەگەر زەردەخەنەیەكى گەورە لەبەربكەیت، خەڵك بە دەگمەن سەرنجى جلوبەرگە كۆنەكانت دەدەن.

[2126] الصَّوْمُ جُنَّةٌ.

رۆژوو قەڵغانە.

[2127] بێگومان مەخسەوى شەریفم لە "شكان" بریتییە لە "شكاند" بەڵام بەهۆى زەروراتى شیعرەوە پیتى دالەكەم لابردووە.

قصَمَ اللهُ صدام بسبب جرائمه.

خودا سەدامى بەهۆى تاوانەكانییەوە لەناوبرد.

إن الضربات التي لا تقصم ظهرك تقويه. عمر المختار

بێگومان ئەو لێدانانەى پشتت ناشكێنن، بەهێزى دەكەن.

[2128] هەروەها بە (رَخاصة)و (رُخوصة)ش دەبێتە چاوگ.

**876.** (عَدُوّ) دوژمنه[2129]، (لَدود) خوێنەخوێ[2130]

(أيْنَ) "لەکوێ؟"یه[2131]، (مَنْ؟) به مانای "کێ؟"[2132]

**877.** (هُتّاف) تەلەفۆن، بەس تاك نا کۆیه[2133]

(يَمين فاجرة) سوێندی درۆیه[2134]

---

رخُصت بشرتُها بسبب العملية الجراحية.

بەهۆی نەشتەرگەرییەکەوە پێشتی نەرمبوو.

[2129] جمع أعداء وعِدًى، جمع الجمع أعادٍ، مؤ عدوّ وعدوّة.

لا تكن عَدوًّا لوالديك.

مەبە بە دوژمنی دایك و باوکت.

الناس أعداء ما جَهلوا. على بن أبي طالب

خەڵك دوژمنی ئەوەیە کە نایزانێت. عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب

[2130] جمع أَلِدَّة.

خوێنەخوێ: کەسێك کە زۆر دژایەتیت بکات و بەخوێنی سەرت تینوو بێت.

الشيطان عدو لدود للإنسان.

شەیتان دوژمنێکی خوێنەخوێی مرۆڤە.

[2131]أين كنت أمس؟

دوێنێ لەکوێ بویت؟

[2132] ناوی پرسیارکردنه لەعاقڵ.

من هو الرجل الوسيم الذي جلس بجانبك؟

ئەو پیاوە قۆزە کێیە کە لەتەنیشتدا دانیشت؟

[2133] تاکەکەی "هاتِف"ە. هەروەها بە "هاتفون"و "هواتف"یش کۆدەکرێتەوە.

اتصل بالهاتف.

بە تەلەفۆن پەیوەندیکرد.

جرت أول مكالمة هاتفية في العام 1876 بين ألكسندر جراهام بيل ومساعده توماس واتسون.

یەکەم پەیوەندیی تەلەفۆنی لەساڵی 1876دا ئەنجامدراوە کە لەنێوان ئەلیکساندەر گراهام بێڵ و تۆماس واتسۆنی یاریدەدەریدا بووە.

[2134] کۆیەکەی "أيمان فاجرة"یە.

قراءة سورة الْقِيَامَة في المنام تدل على أَن موت قَارِئهَا يكون على الشَّهَادَة أَو خَوفه من عَذَاب الله وعَلى السخاء وتجنب الْأَيْمَان الْفَاجِرَة وَقيل يَظْلمه إِنْسَان وَيكون عاقبته النَّصْر وَالظفر.

**878.** (باطِلاً) چیە؟ "بەخۆڕایی"ە[2135]

(إیثار) ماناکەی خەڵکخوابیە[2136]

**879.** (نَجا) چیە؟ رزگاربیوو[2137]

(تَلا) خوێندەوە، هینەکەی (یَتلو)[2138]

**880.** (قدَرَ علی) بەمانای توانی[2139]

(استرخصَ)یە بە هەرزان زانی[2140]

---

خوێندنەوەی سورەتی قیامەت لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوە بە شایەتومانەوە دەمرێت یان لەئەشکەنجەی خودا دەترسێت و ئاماژەیە بۆ بەخشندەیی و دورکەوتنەوە لەسوێندی درۆ. هەندێکیش دەڵێن ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە لەلایەن کەسێکی ترەوە ستەمی لێدەکرێت بەڵام ئەنجامەکەی سەرکەوتنی ئەم دەبێت.

[2135] ذهَب دمه باطِلاً.

خوێنەکەی بەخۆڕایی رۆشت. واتە کوژرا بەبێ ئەوەی تۆڵەی بکرێتەوە یان حەقەکەی وەربگیرێت.

[2136] خەڵکخوایی: پێچەوانەی خۆپەرستی: دانانی بەرژەوەندیی خەڵك لەپێش هی خۆتەوە.

لا يمكن تحقيق السلام الحقيقي إلا من خلال الإيثار. نيلسون مانديلا

ئاشتیی راستەقینە تەنها لەڕێگەی خەڵکخواییەوە بەدیدێت.

قراءه سوره الْإِنْسَان فى المنام تدل لِقَارِئِهَا على حسن الْخلق وزهد وورع وإيثار على نَفسه وَخَوف من الله تَعَالَى وَنَجَاة من عَذَاب الله يَوْم الْقِيَامَة وسرور.

خوێندەوەی سورەتی ئینسان لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خوێنەرەکە لەسەر رێگای رەوشتی جوان و دونیانەویستی و خواپەرستی و خەڵکخواییەو ئاماژەشە بۆ رزگاربون لەئەشکەنجەی خودا لەڕۆژی قیامەت و دڵخۆشی.

[2137] نجا يَنجُو، انْجُ، نَجاءً ونَجاةً، فهو ناجٍ، والمفعول مَنْجوّ منه.

الحاوي لا ينجو من الحيَّات.

مارەوان لە مار رزگاری نابێت.

[2138] تلا يَتلُو، اتلُ، تِلاوَةً، فهو تالٍ، والمفعول مَتْلُوّ.

بێگومان مەخسەوی شەریفم لە"هینەکەی" بریتییە لە"رانەبردووەکەی" بەڵام لەبەر کێشی شیعرەکە گۆڕیومە.

تَلا آيات من القرآن.

چەند ئایەتێکی لەقورئان خوێندەوە.

قراءة سورة المرسلات في المنام تدل لتاليها على حُصُول أَمن وسعة رزق وسلوك طَرِيق الْحق.

خوێندەوەی سورەتی مورسەلات لەخەودا ئاماژەیە بۆ بەدەستهێنانی ئارامی و زۆریی رۆزی و گرتبەری رێگای راست لەلایەن خوێنەرەکەوە.

[2139] قدَر على الصعود إلى الجبل.

**.881** دامەزراند چیە؟ واتە (أسَّسَ)[2141]

هەرزانکرد، حەتمەن مانای (رخَّصَ)[2142]

**.882** (نسَلَ) چیە؟ نەوەی زۆربوو[2143]

(تكدَّرَ)یە لێڵبوو، هەم تاڵبوو[2144]

**.883** (يَترَحُ) چیە؟ دڵتەنگدەبێ[2145]

(صعُبَ) قورسبوو، (يَصعُبْ) قورسدەبێ[2146]

---

توانی سەرکەوێت بەسەر شاخەکەدا.

[2140] استرخص المشتري السِّلعةَ.

کڕیارەکە کاڵاکەی بە هەرزان زانی.

[2141] متى أسست منظمة المؤتمر الإسلامي؟ 1971

ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی کەی دامەزرێنرا.

أسَّستِ الدولة مستشفى جديدًا.

وڵات نەخۆشخانەیەکی نوێی دامەزراند.

[2142] رخَّص ثَمنَ البضاعة بسبب شهر رمضان.

بەهۆی مانگی رەمەزانەوە نرخی کاڵاکەی هەرزانکرد.

[2143] نسل الرجل بعد زواجه الثاني.

پاش هاوسەرگیریی دووەمی، پیاوەکە نەوەی زۆربوو.

[2144] تكدَّر الماءُ بسبب المعمل.

بەهۆی کارگەکەوە، ئاوەکە لێڵبوو.

تكدَّرت حياتُه بعد موت أبيه.

پاش مردنی باوکی، ژیانی تاڵبوو.

قراءة سورة المدثر في المنام تدل على أن قَارِئهَا يعْمل الصَّالِحَات وتحسن سيرته بَين النَّاس وَرُبمَا تدل على تعسر الرزق وتكدر الْعَيْش.

خوێندنەوەی سورەتی ئەلمودەسیر لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خوێنەرەکە کردەوەی چاکە دەکات و هەڵسوکەوتی لەناو خەڵکدا جواندەبێت و رەنگە ئاماژەش بێت بۆ نارەحەتی لەرۆزی و تاڵبونی ژیان.

[2145] ترِحَ يَترَح، تَرَحًا، فهو تَرِح.

ترِح المسلم بعد سماع خبر غزه.

موسڵمانەکە پاش بیستنی هەواڵی غەززە، دڵتەنگبوو.

[2146] رابردوو رانەبردوون.

صَعُب الدَّرس بعد التغييرات الجديدة في المنهج الدراسي.

**.884** (أرخصَ) هەرزانکرد، هەروەها سووککرد[2147]

(تهاونَ)یە کەمتەرخەمیکرد[2148]

**.885** (اِرعَوَى) چیە؟ وازیلێهێنا[2149]

(بخَسَ عینَه) چاوی دەرهێنا[2150]

**.886** (یَمین) دەستی راست، دێش بە مانای سوێن[2151]

---

پاش گۆڕنکارییە نوێکان لەپرۆگرامی خوێندن، وانەکە قورسبوو.

[2147] أرخص سعر السيارة للفقير.

نرخی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ هەژارەکە هەرزانکرد.

إن أرخصت نَفْسَك أرخصك الناسُ.

ئەگەر خۆت خۆت سوکبکەیت، خەڵکیش سوکتدەکەن.

[2148] يتهاون بعضُ الموظَّفين في أداء واجباتهم.

هەندێ کارمەند کەمتەرخەمی لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا دەکەن.

قراءة سورة الانفطار في المنام تدل للقارئ على زَوَال الشدائد أَو الْقرب من السُّلْطَان أَو على أنه متهاون بِالتَّوْبَةِ فليبادر إِلَيْهَا أَو يكون رَاغِبًا فِي الدُّنْيَا وَنَعِيمهَا.

خوێندنەوەی سورەتی ئینفیتار لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی خوێنەر لەتەنگانە رزگاری دەبێت یان بۆ نزیکبونەوە لەپادشا یان ئاماژەیە بۆ ئەوەی خوێنەر کەمتەرخەمە لەتوبەکردن، بۆیە با پەلەی لێبکات یان ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە حەزی لەدونیاو نیعمەتەکانیەتی.

[2149] ارعوى الشاب عن الكذب من أجل إضحاك الناس.

گەنجەکە وازی لەدرۆکردن لەپێناو خستنەپێکەنینی خەڵك، هێنا.

[2150] بخَسَ الجلاد عينَ السجين البرىء.

پیاوکوژەکە چاوی زیندانییە بێتاوانەکەی دەرهێنا.

[2151] بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی سوێن بریتییە لە "سوێند" بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر، پیتی دالەکەم لابردووە.

{وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَامُوسَى}

ئەوە چیە بە دەستی راستتەوە ئەی موسا؟

قراءة سورة الانشقاق في المنام تدل على أَن من قَرَأَهَا أُوتِيَ كِتَابه بِيَمِينِهِ أَو يهون عَلَيْهِ النَّحْو وَالْأَدب أَو قرا مِنْهَا شَيْئا فَإِنَّهُ يكون حَرِيصًا على الدُّنْيَا وأشغالها وَيطْلب الشُّهْرَة وَالثنَاء فِي الْخلق.

خوێندنەوەی سورەتی ئەلئینشیقاق لەخەودا ئاماژەیە بۆ ئەوەی خوێنەر نامەی کردەوەکانی دەدرێتە دەستی راستی یان نەحو و ئەدەبی بۆ ئاسان دەبێت. ئەگەر لەخەودا کەمێکی لێخوێندەوە ئەوە خوێنەر دەبێتە کەسێکی چاوچنۆك بۆ دونیاو پێوەی سەقاڵ دەبێت و بەدوای ناوبانگ و ستایشی خەڵك دەگەڕێت.

الْبَيِّنَةُ عَلَى مَنِ ادَّعَى وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ.

(صقَّرَ) راوكرد، بەڵام بە شەهێن[2152]

**887.** (اللَّهُمَّ)یە مانای "خودایە"[2153]

دەوڵەمەندییە واتای (غِنی)یە[2154]

**888.** (مُدْمِن) چیە؟ ئاڵودەبوو[2155]

(بەتاڵدەبێ)یە، مانای (يَفْرَغُ)[2156]

**889.** (فرَّغَ) چیە؟ مانای بەتاڵكرد[2157]

(ترخَّصَ) داوای ئیزنی كرد[2158]

---

بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەو كەسەیە كە بانگەشەی شتێك دەكات و سوێندیش لەسەر ئەو كەسەیە كە رەتیدەكاتەوە.

[2152] بەمانای "بە شەهێن راوكرد" دێت.

صقَّر الصیاد الأرنب.

راوكەرەكە كەروێشكەكەی بە شەهێن راوكرد.

[2153] بۆ بانگكردن و پاڕانەوە بەكاردەهێنرێت.

اللّهم انصر المستضعفین في غزة.

خودایە بێدەسەڵاتەكانی غەززە سەربخەیت.

[2154] غنى النفس أفضل من غنى المال.

دەوڵەمەندیی دەرون لە هی سامان باشترە.

[2155] المدمن لا یستطیع أن یرضى بالقلیل، فهو دائماً یبحث عن المزید.

ئاڵودەبوو ناتوانێت بە كەم رازی بێت، بەڵكو هەمیشە بەدوای زیاتردا دەگەڕێت.

[2156] فرَغَ یَفْرَغ ویَفرُغ، فَراغًا وفُروغًا، فهو فارغ وفَرِغ.

بەتاڵدەبێ= بەتاڵدەبێت= هیچی تیانەما

فرَغ الإناءُ بسرعة لأن الضیف كان أكولاً.

دەفرەكە خێرا بەتاڵبوو لەبەرئەوەی میوانەكە چڵێس بوو.

[2157] بەتاڵكرد= تیانەهێشت.

فرّغَ الفلاح مستودعه من القمح استعدادًا للموسم الجدید.

جوتیارەكە كۆگاكەی لەگەنم بەتاڵكرد، وەك خۆئامادەكردنێك بۆ وەرزی نوێ.

[2158] داوای ئیزنی كرد= داوای مۆڵەتی كرد

ترخَّص الموظف من مدیره.

كارمەندەكە داوای مۆڵەتی لەبەڕێوەبەرەكەی كرد.

**890.** (نَدَامة)و (نَدَم) هەر پەشیمانی[2159]

(بإمكانكَ) واتە دەتوانی[2160]

**891.** (ندَّمَ) واتە پەشیمانکردۆ[2161]

(عُلُوج)و (أَعلاج) کەرن بەڵام کۆ[2162]

**892.** (لِهِمَ) قوتدا، چاوگەکەی (لَهَمْ)[2163]

---

[2159] هەردوکیان چاوگی (ندِمَ)ن.

الندامة على السكوت خير من الندامة على القول.

پەشیمانی لەبێدەنگی باشترە لەپەشیمانی لەقسەکردن.

العجلة في المنام ندامة، كما أن الندامة عجلة. فمن رأى أنه يعجل في أمر فإنه يندم فيه وأن رأى أنه ندم فإنه يتعجل في أمر.

پەلەکردنی لەخەودا پەشیمانییەو پەشیمانیش لەخەودا پەلەکردنە. هەر کەسێك لەخەودا بینی لەشتێکدا پەلەدەکات ئەوە لێی پەشیماندەبێتەوە، ئەگەر بینیشی پەشیمانبووەوە، ئەوە لەشتێکدا پەلەدەکات.

إذا كنت تشعر بالندم على ماضيك، فهذا يعني أنك قد تعلمت شيئًا جديدًا اليوم.

ئەگەر سەبارەت بە رابردوت هەستت بە پەشیمانی کرد، ئەوە مانای وایە ئەمڕۆ شتێکی نوێ فێربویت.

قراءة سورة الشَّمْس في المنام تدل لِقَارِئِهَا على التَّوْبَة والندم على فعله أَو يكون ميله إِلَى الْعلمَاء أَو يكون ذَا فهم وعالما عَاملا أَو يسكن فِي الأَرْض ملك عَادل.

خوێندنەوەی سورەتی ئەلشەمس لەخەودا ئاماژەیە بۆ تۆبەو پەشیمانیی خوێنەر لەکارەکەی، یان حەز لەنزیکبونەوە لەزانایان دەکات یان دەبێتە کەسێکی تێگەیشتوو و زانایەك کە کار بە زانستەکەی دەکات یان پادشایەکی دادوەر لەسەر زەوی جێگیردەبێت.

[2160] دەتوانی= دەتوانیت.

بإمكانك أن تدور العالم كله دون أن تخرج من بيتك، بإمكانك أن تتعرف على الكثير من الشخصيات الفريدة دون أن تراهم، بإمكانك أن تسافر إلى كل الأزمنة، بإمكانك أن تفعل كل هذه الأشياء وأكثر عبر شيء واحد وهو القراءة.

دەتوانیت بەبێ ئەوەی لەماڵ دەرچیت، هەموو دنیا بگەڕێیت، دەتوانیت زۆرێك لەکەسایەتییە دەگمەنەکان بناسیت بەبێ ئەوەی بیانبینیت، دەتوانیت گەشتبکەیت بۆ هەموو سەردەمەکان، دەتوانیت هەموو ئەم شتانەو زیاتریش بکەیت لەڕێگەی یەك شتەوە کە ئەویش خوێندنەوەیە.

[2161] پەشیمانکرۆد= پەشیمانکردەوە.

ندَّمَه على أقواله السابقة.

لەقسەکانی پێشوی پەشیمانکردەوە.

[2162] تاکەکەیان "عِلج"ە.

حين أقول أنك علج لا أحتقرك لا سمح الله، لأنك فعلاً علج!

کات پێت ئەڵێم تۆ کەریت، خوا نەخواستە سوکایەتیت پێناکەم، چونکە بەڕاستی کەریت!

پەشیمانکردۆ ماناکەی (أندَمْ)[2164]

**893.** (حَدَأَة) هەم (حِدَأَة) هەردوو کۆلارە[2165]

ئاسانی و دەستی چەپیش (یَسار)ە[2166]

**894.** (بَیْتُ المال) واتە گەنجینەی دەوڵەت[2167]

---

[2163] بەمانای "قوتدا" دێت، بەڵام قوتدان بە یەکجار نەك کەم کەم.

لهم قطعةَ الحلوى الكبيرة فضحك الحاضرون.

پارچە شیرینییە گەورەکەی بە یەکجار قوتدا، بۆیە ئامادەبوان پێکەنین.

[2164] پەشیمانکردۆ= پەشیمانکردەوە.

أندمه صوتُ ضميره.

دەنگی ویژدانی، پەشیمانیکردەوە.

[2165] کۆلارە: جۆرە باڵندەیەکە، لەخێزانی هەڵۆکانە.

الحَدَأَة طائر سريع.

کۆلارە باڵندەیەکی خێرایە.

هل رأيت تلك الحِدَأَة؟

ئەو کۆلارەیەت بینی؟

تُعدّ أجنحة الحِدَأَة من أقوى أجنحة الطيور، حيث تُمكّنه من الطيران لمسافاتٍ طويلةٍ تصل إلى 100 كيلومترٍ في اليوم دون الحاجة إلى التوقف.

باڵی کۆلارە بە یەکێك لەبەهێزترین جۆرەکانی باڵی باڵندە دادەنرێت کە بەهۆیەوە ئەم باڵندەیە دەتوانێت بۆ ماوەی نزیکەی 100 کیلۆمەتر بفڕێت لەڕۆژێکدا بەبێ ئەوەی پێویستی بە وەستان بێت.

تُمارس الحِدَأَة بعض السلوكيات الغريبة، مثل حمل أغصانٍ محترقةٍ في مخالبها وإلقائها في أماكن أخرى لإشعال النيران.

کۆلارە هەندێك رەفتاری سەیر ئەنجامدەدات، لەوانە هەڵگرتنی لقەدرەختی ئاگراوی بە چنگەکانی و فڕێدانی لەشوێنی تر بە مەبەستی گڕتێبەردان.

[2166] واتە وشەی (یَسار) بەمانای ئاسانی و دەستی چەپیش دێت.

يسار وسائل التنقل جعلني شخصاً أحب السياحة.

ئاسانیی هۆکارەکانی گواستنەوە کردمی بە کەسێك کە حەزم لەگەشتکردن بێت.

حاول الكتابة بيساره.

هەوڵیدا بەدەستی چەپی بنوسێت.

[2167] "إن أعظم ما يكون في الدنيا ذنبًا أن يتولى بَيْتُ المال غير صاحبه." ـ الجاحظ.

گەورەترین گوناهـ لەدونیادا ئەوەیە کە کەسێك کاروباری گەنجینەی دەوڵەت بگرێتەدەست کە خاوەنی گەنجینەکە نەبێت.

(أَلْو) هەم (أَلى) بەمانای نیعمەت[2168]

**895.** سەرمایە چیە؟ واتە (رأسُ المال)[2169]

(مالْ) سامانە، جەمعەکەی (أموال)[2170]

**896.** (باطِل) ناڕەوا، کۆکەی (أباطیل)[2171]

(مالَ) "لاربوو"ە، هینەکەی (یمیلْ)[2172]

**897.** (كذَّبَ) واتە بەدرۆخستۆ[2173]

(دَمالیج) بازنە، بەڵام تاك نا كۆ[2174]

---

[2168] کۆی هەردوکیان (آلاء)ە.

أشكر الله على آلاءه.

سوپاسی خودا دەکەم لەسەر نیعمەتەکانی.

[2169] "رأس المال الحقيقي في العصر الحديث هو العلم والتكنولوجيا والابتكار." ستيف جوبز.

سەرمایەی ڕاستەقینە لەسەردەمی نوێدا بریتییە لەزانست و تەکنەلۆژیاو داهێنان.

[2170] من قَرَأَ سورة الهمزة في المنام يكون كثير الْكَلَام وَيكون عِنْد الْخلق مَعْرُوفا أَو يكون حَرِيصًا على المَال وأشغال الدُّنْيَا وَلم يتفكر فِي عواقب الْأُمُور أَو يصرف مَاله فِي سَبِيل الله أَو يغتاب قرَابَته فليتب.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی سورەتی ئەلهومەزە دەخوێنێتەوە، ئەوە قسە زۆر دەکات و لەلای خەڵك ناسراو دەبێت یان دەبێتە کەسێك کە زۆر هەڵپەدەکات بۆ سامان و کاروباری دونیاو بیر لەئەنجامی کارەکان ناکاتەوە یان سامانەکەی لەپێناو خودادا خەرجدەکات یان غەیبەتی خزمی دەکات، بۆیە با تۆبە بکات.

[2171] اتّهامك باطل.

تۆمەتبارکردنەکەت ناڕەوایە.

[2172] هینەکەی واتە ڕانەبردووەکەی.

مال الحائِطُ بسبب الهزة الأرضية.

بەهۆی زەمینلەرزەکەوە دیوارەکە لاربوو.

[2173] كذَّبَ يكذّب، تكذيبًا وكِذّابًا، فهو مُكذّب، والمفعول مُكذَّب.

من قَرَأَ سورة الماعون في المنام يكون قَلِيل الصَّلَاة أَو يُصَلِّي فِي غير وَقت الصَّلَاة أَو يصاحب أَقْوَامًا فاسدي الدّين ويظفر على الأعادي القليلي الدّين وَيحصل للنَّاس مِنْهُ مَنْفَعَة وَأمن أَو يرتكب كل مَا فِي السُّورَة من منع الزَّكَاة وَترك الصَّلَاة والتكذيب بِيَوْم الدّين.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی سورەتی ئەلماعون دەخوێنێتەوە، ئەوە دەبێتە کەسێکی کەمنوێژ یان نوێژ لەکاتی خۆیدا ناکات یان هاوڕێیەتی کەسانی ئاینخراپ دەکات و بەسەر دوژمنانی کەمدیندا سەردەکەوێت و خەڵك سودو ئارامیان لێدەستدەکەوێت یاخود هەموو ئەو گوناهانە ئەنجامدەدات کە لەسورەتەکەدا هاتون وەك زەکاتنەدان و وازهێنان لەنوێژو بەدرۆخستنەوەی ڕۆژی قیامەت.

[2174] تاکەکەی "دُملُج"ە. هەروەها بە "دمالج"یش کۆدەکرێتەوە.

**.898** (نَدِمَ) چیە؟ پەشیمانبوو[2175]

(انجرحَ)یە ئەی بریندار بوو[2176]

**.899** (دخَلَ) چووەناو، چاوگەکەی (دُخول)[2177]

(حِمْل) واتە بار، کۆی (أحمال)، (حُمُول)[2178]

**.900** (مُتْعَة) واتە چێژ، جەمعەکەی (مُتَع)[2179]

(قطَعَ) بڕی، هینەکەی (يَقطَعْ)[2180]

**.901** سەرکەشی چیە؟ (مُغامَرة)[2181]

(عِبْرَة) واتە پەند، کۆکەی (عِبَرْ)ە[2182]

---

اشتريت دُملُجاً جيملاً لخطيبتي.

بازنەیەکی جوانم کڕی بۆ دەزگیرانەکەم.

2175 ندِم الرجل على ما فعل.

پیاوەکە پەشیمانبوو لەوەی کردی.

2176 بەمانای "بریندار بوو" دێت.

انجرح السائقُ في الحادث.

شۆفێرەکە لەڕووداوەکەدا بریندار بوو.

2177 دخَل البيت خلسة.

بەدزییەوە چووەناو ماڵەکەوە.

2178 الشهرة حمل ثقيل.

ناوبانگ بارێکی قورسە.

2179 هەروەها بە " مُتُعات"و "مُتْعات"یش کۆدەکرێتەوە.

المتعة الدائمة ليست متعة.

چێژی بەردەوام چێژ نیە.

2180 مەخسەوی شەریفم لە "هینەکەی" لێرەدا بریتییە لە "رانەبردووەکەی".

2181 حياته مليئة بالمغامرات.

ژیانی پڕە لەسەرکەشی.

2182 هەروەها بە "عِبْرات"یش کۆدەکرێتەوە.

جعله عِبْرةً لغيره.

کردی بە پەند بۆ کەسانی تر.

**902.** (بذَّرَ) چیه؟ بەفیڕۆدا[2183]

(أطالَ) مانای درێژەی پێدا[2184]

**903.** (جرَحَ) چیه؟ بریندارکرد[2185]

(اِستَطالَ)یه دەستدرێژیکرد[2186]

**904.** (کِیان) قەوارە، کۆی (کِیانات)ە[2187]

(طالَ) "گەیشت"ە، (یطولْ) "دەگات"ە[2188]

**905.** (طائِفة) بەشە، هەروەها کۆمەڵ[2189]

(مِرجَل) شانەیە، ماناشی مەنجەڵ[2190]

---

2183 بذَّرَ مالَه خلال أقل من سنة.

لەماوەی کەمتر لەساڵێکدا سامانەکەی بەفیڕۆدا.

2184 أطالَ حديثَه حول الديمقراطية.

درێژەیدا بە قسەکانی سەبارەت بە دیموکراسی.

2185 جرح إصبعَه.

پەنجەی بریندارکرد.

2186 استطال عليه بالقول والعمل.

بە قسەو کردەوە دەستدرێژیکردە سەری.

2187 جمع كِيانات

الكِيان الصهيونيّ دولة محتلة.

قەوارەی زایۆنی دەوڵەتێکی داگیرکەرە.

2188 رابردوو و رانەبردون.

طالَ القصفُ المنطقةَ.

بۆردومانەکە گەیشتە ناوچەکە.

2189 أعطيت الفقير طائفة من مالي.

بەشێك لەپارەکەم دا بە هەژارەکە.

سلّمت على طائفة من الحجّاج.

سڵاوم لەکۆمەڵێك حاجی کرد.

2190 نظّف مرجلك قبل الإستخدام.

شانەکەت پێش بەکارهێنان پاکبکەرەوە.

906. (مالَ علی) ستەمیکرد لە[2191]

(سألَ) مانای پرسیاریکرد لە[2192]

907. (قَرِبَ) واتە نزیکبووەوە لە[2193]

(شغَلَ) مانای نیشتەجێبوو لە[2194]

908. (شكَّلَ) چیە؟ واتە پێکهێنا[2195]

(شغَلَ) گرتەدەست، ئەی بەدەستهێنا[2196]

909. (شغَّلَ) خستەکار، هەم خستەسەرکار[2197]

هەڵبژاردنە مانای (اِختیار)[2198]

---

يغلي من الغضب كاللحم في المِرْجَل.

لەتوڕەییدا وەك گۆشت لەناو مەنجەڵدا، دەکوڵێت.

2191 مال الرجل على أخيه.

پیاوەکە ستەمی لەبراکەی کرد.

2192 سألَه عن صحَة أبيه.

سەبارەت بە تەندروستیی باوکی پرسیاریلێکرد.

2193 قرِب المنزِلَ.

لەماڵەکە نزیکبووەوە.

2194 شغَلَ المستأجرُ الدّارَ.

کرێچییەکە لەماڵەکە نیشتەجێبوو.

2195 شكّل الحكومة لجنةً.

حکومەت لیژنەیەکی پێکهێنا.

2196 شغَلَ وظيفَةَ بعد تخرجه من الجامعة.

پاش دەرچونی لەزانکۆ کارێکی گرتەدەست (بەدەستهێنا) .

2197 شغّلَ المولدة بعد انقطاع الكهرباء الحكومي.

پاش بڕانی کارەبای حکومی، مۆلیدەکەی خستەکار واتە ئیشپێکرد.

شغَّلتِ الشَّركةُ عمّالاً.

کۆمپانیاکە چەند کرێکارێکی خستەسەرکار.

2198 حُرّيَّة اختيار الزوج حق لكل إنسان.

ئازادیی هەڵبژاردنی هاوسەر مافی هەموو مرۆڤێکە.

910. (سَأَمْ) بێزاری، (سئِمَ) بێزاربوو[2199]

(انشغلَ) واتە سەرقاڵبوو[2200]

911. (مُتوسِّط) چیە؟ واتە ناوەڕاست[2201]

(توبةُ نَصوح) مانای تۆبەی ڕاست[2202]

912. (تَرَحْ) خەفەتە، جەمعەکەی (أتراح)[2203]

(نجَحَ) سەرکەوت، مەسدەری (نَجاح)2204

913. (رُخْصة) مۆڵەتە، جەمعەکەی (رُخْصات)[2205]

(تعوَّدَ)یە بەمانای ڕاهات2206

914. (بَکی) "گریا"یە، "گریان"ە (بُکاء)2207

---

[2199] چاوگ و کاری هەمان وشەن.

سئِمَ يَسأَم، سآمَةً وسَأْمًا، فهو سَئِم

سئِمَ الوالد من قول ولده.

پیاوەکە لەقسەی کوڕەکەی بێزاربوو.

[2200] انشغل الكاتب بتأليف كتاب جديد.

نوسەرەکە بە دانانی کتێبێکی نوێ سەرقاڵبوو.

[2201] كم هو عرض البحر الأبيض المتوسِّط؟

پانیی دەریای سپیی ناوەڕاست چەندە؟

[2202] كلنا بحاجة الى توبة نصوح.

هەمومان پێویستمان بە تۆبەیەکی ڕاست هەیە.

[2203] نعوذ بالله من الترح بعد الفرح.

پەنادەگرین بە خودا لەخەفەتی پاش خۆشی.

[2204] نجح في الامتحان.

لەتاقیکردنەوەکەدا سەرکەوت.

[2205] بێگومان بە " رُخُصات "یش کۆدەکرێتەوە.

هل عندك رخصة قيادة السيارة؟

ئایا مۆڵەتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلت هەیە؟

[2206] التعوّد على اليأس أسوأ من اليأس نفسه.

ڕاهاتن لەسەر نائومێدی لەخودی نائومێدی خراپترە.

(سَفیر) باڵیۆزە، کۆکەی (سُفراء)2208

**915.** "بەپیتکرد" چیە؟ واتە (خصَّبَ)[2209]

(صبَّ) واتە رشت، چاوگەکەی (صَبّ)ە[2210]

**916.** (جرَّحَ) چیە؟ برینداركرد[2211]

(استكملَ)یە مانای تەواوكرد[2212]

**917.** (بعَثَ) واتە نارد، هەم زیندوکردۆ2213

---

[2207] کارو چاوگن.

من رأى في المنام أنه قد مَاتَ وَالنَّاس يَبْكُونَ عَلَيْهِ أَو غسلوه وكفنوه أَو حملوه على النعش أَو دفنوه فِي الْقَبْر فجملة ذَلِك يدل على فَسَاد دينه ويرجى لهَذَا الْمَيِّت صَلَاح دينه مَا لم يدْفن فَإِن دفن لَقِي الله على غير التَّوْبَة إِلَّا أَن يرى أَنه عَاشَ وَخرج من الْقَبْر بعد الدّفن فَإِنَّهُ يَتُوب.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی مردو خەڵك لەسەری دەگرین یان شۆردیان و کفنیانکرد یان لەسەر دارمەیت هەڵیانگرت یان لەگۆڕردا ناشتیان، هەموو ئەوانە ئاماژەن بۆ خراپیی ئەو کەسە لەڕوی ئاینەوەو ئەو کەسە ئومێدی باشبونی ئاینەکەی لێدەکرێت ئەگەر بە خاك نەسپێردرێت، بەڵام ئەگەر بەخاکسپێردرا ئەوە بەبێ تۆبە دەمرێت لەو حاڵەتەدا نەبێت کە پاش بەخاکسپاردنەکە بژی و پاش ناشتنی، لەگۆڕەکە بێتە دەرەوە، لەم حاڵەتەدا مانای وایە تۆبەدەکات.

[2208] تبادلت الدول السفراء.

وڵاتەکان باڵیۆزیان ئاڵوگۆڕکرد.

[2209] خصَّب الأرضَ بطرق شتى.

زەوییەکەی بە چەندین رێگای جیاواز بەپیتکرد.

[2210] صبَّ الطفل الماءَ.

منداڵەکە ئاوەکەی رشت.

[2211] جرَّح وجه صديقه.

دەموچاوی هاوڕێکەی برینداركرد.

[2212] استكمل عملَه خلال ساعة واحدة.

لەماوەی سەعاتێکدا کارەکەی تەواوکرد.

[2213] زیندوکردۆ= زیندوکردەوە.

"إنما بُعِثتُ لأُتممَ مكارمَ الأَخلاقِ"

بێگومان من تەنها بۆ تەواوکردنی رەوشتی جوان نێردراوم.

بعَث اللهُ الأموات.

خودا مردووەکانی زیندوکردەوە.

(قوارِع) بەڵا، بەڵام تاك نا كۆ[2214]

918. (عتَق) ئازادبوو، مەسدەر (عَتاقة)[2215]

(عُنْق) گەردنە، كۆكەی (أعناق)ە[2216]

919. (فرَّ) "رایكرد"ە، هینەكەی (یَفِرّ)[2217]

(باخِرة) پاپۆڕ، كۆكەی (بَواخِر)[2218]

920. (انشقَّ) چیە؟ "درزیبرد"ە[2219]

(أمرَد) كۆسەیە، جەمعەكەی (مُرْد)ە[2220]

921. (ترَّحَ) چیە؟ خەفەتباركرد[2221]

---

[2214] تاكەكەی "قارِعَة"یە. بێگومان بە (قارعات)یش كۆدەكرێتەوە.

اللَّهُمَّ لا تختبرنا بقوارع شديدة.

خودایە بە بەڵای توندی تاقیمان نەكەیتەوە.

[2215] دەبوو ئەم نیوە بەیتەم بەمشێوەیە بنوسیایە:

(عتَق) ئازادبوو، مەسدەرەكەی (عَتاقة)یە، بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر سەروگوێلاكم كردووە!

بێگومان "عتَق" بە (عِتْق)و (عَتْق)یش دەبێتە چاوگ.

عتَق الرجل بعد سنوات من الرق.

پیاوەكە پاش چەندین ساڵ كۆیلایەتی، ئازادبوو.

[2216] بە سپێڵی "عُنُق"یش دەنوسرێت.

أمر الخليفة أن يضرب عنق المرتد.

خەلیفە فەرمانیكرد لەگەردنی هەڵگەڕاوەكە بدرێت.

[2217] بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی "هینەكەی" لێرەدا بریتییە لە "رانەبردووەكەی".

من رأى في المنام أنه يفرّ وَلَا يخَاف فَإِنَّهُ يَمُوت.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی رادەكات و ناترسێت، ئەوە دەمرێت.

[2218] بێگومان بە (باخِرات)یش كۆدەكرێتەوە.

تَحْمِلُ الباخرة أعدادًا كبيرةً من المسافرين.

پاپۆڕەكە ژمارەیەكی زۆر گەشتیار هەڵدەگرێت.

[2219] انشقّ الحائطُ بسبب الهزة الأرضية الأخيرة.

دیوارەكە بەهۆی زەمینلەرزەكەی ئەمدواییە درزیبرد.

[2220] زوجها شاب أمرد.

مێردەكەی گەنجێكی كۆسەیە.

(استولدَ)یە واتە دوگیانکرد[2222]

**922.** (حثَّ) هاندا، وشەی (حاثّ) هاندەر[2223]

(وَقَعَ) رویدا[2224]، (وَقْعة) مانای شەڕ[2225]

**923.** (أدخِنَة) دوکەڵ، بەس تاك نا، کۆیە[2226]

(أهوى) ماناکەی "خستەخوارۆ"یە[2227]

**924.** (جرَحَ) چیە؟ تانەیلێدا[2228]

وشەی (اِستهوی) مانای فریودا[2229]

**925.** (هَويّة) چیە؟ واتە بیری قوڵ[2230]

---

[2221] ترَّحَه فقدُ أبيه.

لەدەستدانی باوکی خەفەتباریکرد.

[2222] استولد الرَّجلُ زوجتَه.

پیاوەکە ژنەکەی دوگیانکرد.

[2223] کارو بکەرن.

كان يَحُثُّه دائمًا.

هەمیشە هانیدەدا.

[2224] وقع الحادثُ ليلةَ أمس.

روداوەکە شەوی رابردوو رویدا.

[2225] وَقْعة بدر حدث هامّ في التأريخ الإسلامي.

شەڕی بەدر روداوێکی گرنگە لەمێژوی ئیسلامدا.

[2226] تاكەكەی "دُخَان"ە.هەروەها بە "دواخن"و "دواخين"یش کۆدەکرێتەوە.

دُخان السيجارة خطير للصحة.

دوکەڵی جگەرە مەترسیدارە بۆ تەندروستی.

[2227] خستەخوارۆ= خستەخوارەوە.

أهوى الرجل حجرة من الجبل.

پیاوەکە بەردێکی لەشاخەکەوە خستەخوارەوە.

[2228] جرَح المتهم الشَّاهدَ.

تومەتبارەکە تانەی لەشایەتحاڵەکە دا.

[2229] استهواه الشَّيطان بعد ترك الصلاة.

پاش وازهێنان لەنوێژکردن، شەیتان فریویدا.

(طالَ) درێژبوو، هینەکەی (يَطولْ)[2231]

**926.** (مُرَكَّب) چیە؟ واتە ئاوێتە[2232]

(وقَعَ في) مانای "لەخۆدەگرێت"ە[2233]

**927.** (طَفِقَ) دەستپێکرد، مەسدەری (طُفوق)[2234]

(شِقّ) "نیوە"و "لا"یە، جەمعەکەی (شُقوق)[2235]

**928.** (خصِبَ) بەپیتبوو، (خَصِبْ)ە بەپیت[2236]

---

[2230] ئەگەر وابزانیت (هَويّة) بەمانای ناسنامە دێت، ئەوا دیارە گا بە گونا دەناسیتەوە نەك بە شاخیدا، چونکە ئەوەی بەمانای ناسنامە دێت "هُويَّة"یە نەك (هَويّة)!

وقع الطفل في هَويّة.

منداڵەکە کەوتە بیرێکی قوڵەوە.

[2231] مەبەستم لە "هینەکەی" لێرەدا بریتییە "رانەبردووەکەی".

طالَ عُمرُه بسبب تركه للتدخين.

بەهۆی وازهێنانی لەجێگەرەکێشان، تەمەنی درێژبوو.

[2232] هل عندك أي معلومات حول المُرَكَّبات الكيمائية؟

ئایا هیچ زانیارییەکت هەیە سەبارەت بە ئاوێتە کیمیاوییەکان؟

[2233] وقَع الكتابُ في مائة صفحة.

کتێبەکە سەد لاپەڕە لەخۆدەگرێت.

[2234] هەروەها بە (طَفَق)یش دەبێتە چاوگ.

طفِق يصلي.

دەستیکرد بە نوێژکردن یان نوێژکردنی دەستپێکرد.

[2235] خذْ شِقّ هذا الطعام.

نیوەی ئەم خواردنە بەرە.

من رأى رُؤْيا وَهُوَ مستلق على ظَهره فَهِيَ صَحِيحَة وَكَذَلِكَ على شقَّه الْأَيْسَر، هَذَا قَول الْحُكَمَاء.

ئەگەر کەسێك لەکاتی راکشان لەسەر پشت خەوی بینی یان لەکاتی خەوتن لەسەر لای چەپ، ئەوە خەوەکەی راستە. ئەمە قسەی دانایانە.

شقّ في إطار السيَّارة ألغى رحلتنا.

درزێك لەتایەی ئۆتۆمبێلەکە گەشتەکەمانی هەڵوەشاندەوە.

[2236] خصِبت الأرضُ بعد المطر.

پاش بارانەکە زەوییەکە بەپیتبوو.

(بإذنكَ)یە ئەی "بە یارمەتیت"[2237]

**929.** (أذِنَ) رێپێیدا، مەفعولی (مأذون)[2238]

وشەی (فَضیحة) مانای ئابڕوچون[2239]

**930.** (مَمْلوك) بەندەیە، کۆی (مَماليك)ە[2240]

(بەیارمەتیت)ە ئەی (عن إذنكَ)[2241]

**931.** (أَذِن إِليه) ئەی گوێی بۆ شلکرد[2242]

(تكلّمَ)یە مانای قسەیکرد[2243]

**932.** (هوِيَ) چیە؟ حەزیلێکرد[2244]

(أذِنَ لهُ) ئەی گوێی بۆ شلکرد[2245]

**933.** (اِستهوى) چیە؟ (سەرسامکرد)ە[2246]

---

[2237] بإذنكَ أغادر الإجتماع.

بە یارمەتیت کۆبونەوەکە جێدەهێڵم.

[2238] أذِن له في الدخول.

رێپێیدا بچێتەژورەوە.

[2239] أدَّت الفضيحة إلى استقالة الحكومة.

ئابڕوچونەکە بووەهۆی دەستلەکارکێشانەوەی حکومەت.

[2240] لا تكن مملوكاً لأحد.

مەبە بە بەندەی هیچ کەسێك.

[2241] عن إذنك أغادر القاعة.

بەیارمەتیت هۆڵەکە جێدەهێڵم.

[2242] خۆی لەخۆیدا رستەیەکی تەواوە، بۆیە پێویست بە رستەی تر ناکات.

[2243] من تكلَّم بما لا يعنيه سمِع ما لا يرضيه.

هەرکەسێك قسەی لەسەر شتێك کرد کە پەیوەندی پێوەی نیە، شتێك دەبیستێت کە لێی رازی نیە.

[2244] هويَ الموظف زميلته.

کارمەندەکە حەزی لەهاوکارەکەی کرد.

[2245] خۆی لەخۆیدا رستەیەکی تەواوە.

[2246] استهواه جمالُ عيني حبيبته.

جوانیی چاوەکانی خۆشەویستەکەی، سەرسامیکرد.

(أذَنَ) "لوتی بریندارکرد"ه[2247]

**934.** (طرَح) پێشکەشکرد، هەڵدا، لەباربرد[2248]

(استهبلَ)یە خۆی شێت و گلێکرد[2249]

**935.** (أشاحَ) وەرگێڕا، (أشِحْ) "وەرگێڕ"ه[2250]

(مِلْح) واتە خوێ، هەروەها سوێره[2251]

**936.** (يَسْر)، (سُهُولة) هەردوو ئاسانی[2252]

---

[2247] أذَن خصمَه أثناء اللعبة.

لەکاتی یارییەکەدا لوتی رکەبەرەکەی بریندارکرد.

[2248] طرَحَ يطرَح، طَرْحًا، فهو طارح، والمفعول مَطْروح وطريح.

طرَح وجهةَ نظره بصراحة.

بۆچونی خۆی بەڕاشکاوی پێشکەشکرد.

طرَح حجرًا في النَّهر.

بەردێکی هەڵدایە ناو روبارەکە.

طرحت الأم جنينها بسبب مرض عضال.

دایکەکە کۆرپەکەی بەهۆی نەخۆشییەکی کوشندەوە لەباربرد.

[2249] واتە بەمانای خۆیشێتکردو خۆیگێلکرد دێت. خۆیشێتکرد بەمانای خۆی بەشێت نیشاندا. خۆیگێلکرد بەمانای خۆی بەگێل نیشاندا.

استهبل المتهم خوفاً من العقوبه.

تۆمەتبارەکە لەترسی سزا خۆیشێتکرد.

استهبل المدرس أما البائع.

مامۆستاکە لەبەردەم فرۆشیارەکە خۆیگێلکرد.

[2250] رابردوو و داخوازیی هەمان کارە.

أشاح وجهَه بسبب عداوة قديمة.

بەهۆی دوژمنایەتییەکی کۆنەوە، رووی وەرگێڕا.

[2251] يُستخدم الملح لإذابة الثلج على الطرقات في فصل الشتاء.

لەوەرزی زستاندا خوێ بۆ تواندنەوەی بەفر لەسەر رێگاکان، بەکاردەهێنرێت.

الدُّنيا كالماء الملح الذي كلما ازداد منه صاحبه شرباً ازداد عطشاً.

دونیا وەك ئاوی سوێر وایە، تا زیاتر بخۆیتەوە زیاتر تینوتدەبێت.

[2252] هەروەها (يُسْر)یشی پێدەووترێت.

أطلبي من الله يسر الولادة.

(استملحَ)یە ئەی "بەخۆشزانی)[2253]

**937.** (أملحَ) چیە؟ قسەی خۆشیكرد[2254]

هەر هەمان وشە "سوێربوو"، هەم "سوێركرد"[2255]

**938.** (لعِقَ) لێساوۆ، چاوگەكەی (لَعْق)[2256]

(خاتَم)و (خاتِم) هەردوكیان ئەڵقە[2257]

**939.** (أحْصَى) وەك (عَدَّ) بەواتای ژمارد[2258]

---

داوای ئاسانیی منداڵبون لەخودا بكە.

السُهولة في الكلام إحدى سمات المثقفين.

ئاسانیی لەقسەكردندا یەكێكە لەسیماكانی رۆشنبیران.

[2253] استملح صوتَ القارئ الكردي.

دەنگی قورئانخوێنە كوردەكەی بەخۆشزانی.

[2254] يجتمع الناسُ في الليل حول الرجل المسنّ لأنّه يُملحُ.

لەشەودا خەڵك لەدەوری پیاوە بەساڵاچووەكە كۆدەبنەوە، لەبەرئەوەی قسەی خۆشدەكات.

[2255] واتە وشەی (أملحَ) ئەو دوو مانایەی تریشی هەیە.

أملح الطعام بسبب تدخل أكثر من شخصين في طبخه.

بەهۆی دەستوەردانی زیاتر لەدوو كەس لەلێنانی، خواردنەكە سوێربوو.

أملح اللحم كي لا يأكله المصابون بمرض إرتفاع ضغط الدم.

گۆشتەكەی سوێركرد بۆ ئەوەی توشبوانی بەرزەفشاری خوێن نەیخۆن.

[2256] لێساوۆ= لێسایەوە.

لعِق إناءَ العسل.

دەفری هەنگوینەكەی لێسایەوە.

[2257] إنه كالخاتَم في إصبع زوجته.

ئەو وەك ئەڵقەیەك وایە لەپەنجەی ژنەكەیدا.

باع خاتِم زواجه بسبب الفقر.

بەهۆی هەژارییەوە ئەڵقەی هاوسەرگیرییەكەی فرۆشت.

2258هەردوكیان بەمانای "ژمارد" دێن و لەم مانایەدا موراديفن.

أحصى يُحصي، أحْصِ، إحصاءً، فهو مُحصٍ، والمفعول مُحصًى.

المحاسب أحصى الأشياء بدقة.

ژمێریارەكە شتەكانی بەوردی ژمارد.

(قَمْح) گەنمە[2259]، (طَحين) ماناى ئارد[2260]

**.940** (آخِرة) چیە؟ رۆژى دوایى[2261]

(خاتِمة) حەتمەن ماناى كۆتایى[2262]

**.941** خۆپەرست چیە؟ واتە (أَنانيّ)[2263]

(قُرْبان)، (ذَبیحة)، هەردوو قوربانى[2264]

**.942** (یلهَمُ) چیە؟ واتە قوتدەدا[2265]

---

عَدَّ عَدَدْتُ، يَعُدّ، اعْدُدْ فهو عادّ، والمفعول مَعْدود.

عَدَدْتُ الضيوف قبل ذهابي للسوق.

پێش رۆشتنم بۆ بازاڕ، میوانەكانم ژمارد.

2259 جمع الجمع قُمُوح، مفرد قَمْحة.

تهتمّ الدولةُ بزراعة القمح.

دەوڵەت گرنگى بە چاندنى گەنم دەدات.

2260 يُصنع الخبزُ من الطحين.

نان لەئارد دروستدەكرێت. (ئەم زانیاریيە زۆر موهیمە، پێموایە یەكەمجارتە بیزانیت!!!).

2261 العاقل حقيق أن لا يُغفل أمر آخرته والتزود لها، فإن الموت يأتي بغتة وليس بينه وبين أحد أجل معلوم.

مرۆڤى ژیر سورە لەسەر پێشتگوێنەخستنى رۆژى دوایى و توێشوخستن لەبۆ ئەو رۆژە. چونكە بێگومان مردن لەپڕ دێت و لەنێوان مەرگ و هیچ كەسێكدا كاتێكى زانراو بونى نیە.

2262 جمع خاتمات وخَواتِمُ وخَواتِيمُ.

خاتمة القصة جذابة جداً.

كۆتایى چیرۆكەكە زۆر سەرنجڕاكێشە.

2263 إنه رجل أناني، لا أحبّ صحبته.

بێگومان پیاوێكى خۆپەرستە، حەزم لەهاوڕێیەتیى نیە.

2264 هەروەها (ضحيّة)ش بەماناى قوربانى دێت.

{إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ}

كاتێك ئەو دوانە قوربانییان پێشكەشكرد، لەیەكێكیان وەرگیراو لەوى تریان وەرنەگیرا.

وزّع لحومَ ذبيحته على الفقراء.

گۆشتى قوربانییەكەى بەسەر هەژاراندا دابەشكرد.

قدّم ماعزاً ضحيّة بعد أن شفي من مرضه.

پاش چاكبونەوەى لەنەخۆشییەكەى بزنێكى وەك قوربانى پێشكەشكرد.

(فرَجَ) لابرد، (يَفرِجْ) لادەبا[2266]

**943.** (فَرْج) عەورەتە، هەروەها كەلێن[2267]

(تصقَّرَ)یە راوكرد بە شەهێن[2268]

**944.** (عَظيم) گەورەیە، هەروەها مەزن[2269]

(فَرْجان) ماناكەی عەورەت پیاوو ژن[2270]

**945.** (أذَّنَ) قوقانی، لەگەڵ بانگیدا[2271]

---

[2265] بەمانای "قوتدەدا" دێت، بەڵام قوتدان بە یەكجار نەك كەم كەم.

رانەبردوی "لهِمَ"یە.

لهِم الكعكة.

پارچە كێكەكەی بە یەكجار قوتدا.

[2266] رابردوو و رانەبردوی هەمان كارن.

فرَجَ اللهُ غمَّه.

خودا خەفەتەكەی لابرد. واتە نەهێشت.

[2267] يعدّ من البهائم من لم يكن له همّة إلا بطنه أو فرجه.

هەر كەسێك هەوڵ و كۆششی تەنها بۆ سك یان عەورەتی بێت، ئەوە بە ئاژەڵ دادەنرێت.

بين النافذتين فرْج.

كەلێنێك لەنێوان دوو پەنجەرەكەدا هەیە.

[2268] تصقَّرَ يتصقَّر، تصقُّرًا، فهو مُتصقِّر.

يُعدُّ التصقّرُ رياضةً تقليديةً تُمارسُ في العديدِ من الدولِ العربيةِ.

راوكردن بە هەڵۆ بە وەرزشێكی كلاسیكی دادەنرێت كە لەزۆرێك لەوڵاتە عەرەبییەكاندا ئەنجامدەدرێت.

[2269] جمع عِظام وعُظَماءُ، مؤ عظيمة، جمع مؤ عظيمات وعظائمُ (لغير العاقل).

ذبحت بقرة عظيمة في عيد الأضحى.

لەجەژنی قورباندا مانگایەكی گەورەم سەربڕی.

الإمام الشافعي شخصية عظيمة في التأريخ الإسلامي.

پێشەوا شافیعی كەسایەتییەكی مەزنە لەمێژوی ئیسلامدا.

[2270] بێگومان دەبوو لەبری "عەورەت پیاوو ژن" بنوسم "عەورەتی پیاوو ژن" بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە پیتی یائەكەم ئیعدامكردووە!!!

لا تنظر الى الفرجين.

سەیری عەورەتی پیاوو ژن مەكە.

(فرَّجَ على) واته پيشاندا[2272]

**.946** (سَيِّدة) خاتون[2273]، (إمرَأة) ژنه[2274]

(حَياة) ژيانه[2275]، (مَوت) مردنه[2276]

**.947** (مَنارة) چيه؟ واته مناره[2277]

---

[2271] قوقانی= قوقاندی

أذَّن الدِّيكُ.

کەڵەشێرەکە قوقاندی.

وَمن أذن على حَائِط فَإِنَّهُ يَدْعُو رجلا إِلَى الصُّلْح.

[2272] فرَّجه على النسخة القديمة من كتابه.

نوسخەی کۆنی کتێبەکەی پیشاندا.

[2273] رأيت سيدة في السوق محاطة بحرّاسها.

خاتونێکم بینی لەبازاڕ کە بە پاسەوانەکانی دەورەدرابوو.

[2274] جمع نِساء ونسوة.

في الحقيقة هي إمرأة ذكية.

لەڕاستیدا ئەو ژنێکی زیرەکە.

إمرأة قبيحة المنظر تقول لزوجها: قلت لك ألف مرة أن تصلحي شباك الحمام، أخاف أن يراني جاري وأنا أستحم. فيجيبها الزوج قائلا: لا تخافي، هو يصلحه فور ما يراك!!!

ژنێکی ناشرین بە مێردەکەی دەڵێت: پیاوەکە هەزار جارم پێ وتیت، پەنجەرەی گەرماوەکە چاکبکە، دەترسم دراوسێکەمان لەکاتی خۆشتندا بمبینێت. مێردەکەی لەوەڵامدا دەڵێت: هیچ مەترسە، پیاوەکە هەر کە بینیتی، خۆی پەنجەرەکە چاکدەکات!!!!

وراء كل رجل عظيم امرأة عظيمة. توماس كارليل، مؤرخ اسكتلندي

لەپشت هەموو پیاوێکی مەزنەوە، ژنێکی مەزن هەیە.

[2275] هل تعتقد بالحياة بعد الموت؟

بڕوات بە ژیانی پاش مردن هەیە؟

[2276] موت العالِم موت العالَم.

مردنی زانا مردنی جیهانە.

وما عجبي موت المحبين في الهوى

ولكن بقاء العاشقين عجيب

مردنی عاشق بەهۆی عیشقەوە سەیر نیە بەلامەوە

ئەوەی سەیرە بەلامەوە ئەوەیە کە عاشق بمێنێت و نەمرێت لەعیشقا

[2277] من أذّن على مَنَارَة في المنام فَإِنَّهُ يَدْعُو النَّاس إِلَى منهاج الدّين.

(ماشِطة) مانای ئارایشتکاره[2278]

948. (دوّنَ) چیه؟ واته تۆمارکرد[2279]

(سطَحَ) راخست، لەگەڵ تەختکرد[2280]

949. (یُضني) چیه؟ شەتەکدەکات[2281]

(سَلَّة) سەبەتە، کۆی (سِلال)، (سَلاّت)[2282]

950. (عانقَ) واته باوەشیکرد بە[2283]

(خصَبَ) بەپیتبوو، چاوگەکەی (خِصْب)[2284]

951. (سلِمَ) چیه؟ رزگاریبوو[2285]

---

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی لەسەر منارەیەك بانگدەدات، ئەوە خەڵك بانگدەکات بۆ پەیڕەوی ئایین.

2278 ذهب بعروسه الى ماشطة لتزيّنها فعشق الماشطة!

بوکەکەی برد بۆ لای ئارایشتکارێك بۆ ئەوەی بیرازێنێتەوە، بەڵام لەوێ عاشقی ئارایشتکارەکە بوو!

2279 دوّن أحداث حياته في السجن من الألف الى الياء.

رووداوەکانی ژیانی لەزیندان لە ئەلفەوە تا یاء، تۆمارکرد.

2280 سطَحَ يَسطَح، سَطْحًا، فهو ساطِح، والمفعول مَسْطوح وسَطيح.

سطَح السجادة لوالدته.

بەرماڵەکەی بۆ دایکی راخست.

سطَح المُصارعُ خَصْمَه.

زۆرانبازەکە رکەبەرەکەی تەختکرد، واته دای بەزەویداو لەسەر زەوی وەك فەرش رایخست.

2281 رانەبردوی (أضنى)یە.

أضناه المَرضُ في أواخر حياته.

لەکۆتاییەکانی ژیانیدا نەخۆشی شەتەکیکرد. واته زۆر ماندویکرد.

2282 اشتريت سلّة من العنب للضيوف.

سەبەتەیەك ترێم کڕی بۆ میوانەکان.

2283 عانق الأبُ ولدَه العائِدَ من حرب غزّة.

باوکەکە باوەشیکرد بە کوڕەکەیدا کە لەجەنگی غەززە گەڕابووەوە.

2284 خصَبتِ الأرضُ بعد الأمطار الأخيرة.

پاش بارانەکانی ئەمدواییە زەوییەکە بەپیتبوو.

2285 ثلاثة أمور لا يجترئ عليها الا أهوج ولا يسلم الا قليل؛ صحبة السلطان وركوب البحر وشرب السم للتجربة.

(أملحَ) سوێرکرد، هەروەها سوێربوو[2286]

**.952** (مَعدَن) کانزایە، کۆکەی (معادِن)[2287]

(وضَنَ) چنی، هینەکەی (یضِنْ)[2288]

**.953** (سَرِیر) تەختی خەو، کۆکەی (سُرَر)ە[2289]

(عُقْبُ سیجارة) ئاغزەجگەرە[2290]

**.954** (هُويَّة) چیە؟ واتە ناسنامە[2291]

"نیشتەجێبون"ە مانای (مُقام)ە[2292]

---

سێ شت هەیە تەنها کەسانی هەڵەشە خۆی لێدەدەن و کەم کەس هەیە لێی رزگار بێت: هاوڕێیەتیکردنی پادشاو چونەناو دەریاو خواردنەوەی ژەهر بۆ تاقیکردنەوە.

2286 أملح الماءُ بسبب قربه من البحر.

بەهۆی نزیکی لەدەریاوە، ئاوەکە سوێربوو.

أملح الطبّاخ الجديد الطعامَ.

چێشتلێنەرە تازەکە خواردنەکەی سوێرکرد.

2287 المعدن مادَّة صلبة.

کانزا ماددەیەکی رەقە.

2288 هینەکەی واتە رانەبردووەکەی.

وضَنت الثوب خلال ساعتين فقط.

پۆشاکەکەی لەماوەی تەنها دوو سەعاتدا چنی.

2289 هەروەها بە (أسِرَّة)و (سُرُر)یش کۆدەکرێتەوە.

تەختی خەو= تەختی خەوتن= بێدی نوستن.

بقى على السرير طوال النهار بسبب الكسل.

بەهۆی تەممەڵییەوە، بەدرێژایی رۆژەکە لەسەر تەختی خەوتنەکەی مایەوە.

2290 جەمعەکەی (أعقاب السجائر)ە.

أعقاب السجائر ليست نفايات عادية، فهي تحتوي على مواد كيميائية ضارة.

ئاغزەجگەرە پاشەڕۆی ئاسایی نیە، بەڵکو ماددەی کیمیایی زیانبەخشی تێدایە.

2291 طلبت الشرطة هُويَّة الرجل المرتبك.

پۆلیس داوای ناسنامەی پیاوە شڵەژاوەکەی کرد.

2292 مەسدەری میمییە.

المقام في بعض عواصم الدول الأمريكية الجنوبية يعرّض حياتك للخطر.

955. (عقَبَ) چیە؟ بەدوایداهات[2293]

(غَزْوة) واتە جەنگ، کۆکەی (غَزَوات)[2294]

956. (یعقِّبْ) چیە؟ کۆمێنتدەدات[2295]

(قُدْرة) توانایە، کۆکەی (قُدُرات)[2296]

957. (کافِر) بێباوەڕ، کۆکەی (کَفَرَة)[2297]

(عَقِبُ السِّیجارة) ئاغزەجگەرە[2298]

958. (بِنت)و (اِبنة) کچ[2299]، (نَجْل)و (وَلَد) کوڕ[2300]

---

نیشتەجێبون لەهەندێك لەپایتەختەکانی وڵاتانی ئەمریکای باشور ژیانت دەخاتە مەترسییەوە.

2293 عقَبَ یَعقُب، عَقْبًا وعُقوبًا، فهو عاقِب وعقیب، والمفعول مَعْقوب.

یَعقُب العاصفةَ هدوءٌ.

ئارامی بەدوای گەردەلولدا دێت. واتە پاش گەردەلول ئارامی دێت.

2294 هەروەها بە (غَزْوَات)یش کۆدەکرێتەوە.

شارك الرسول صلـى الله علیه وسلم في 27 غزوة خلال حیاته.

پێغەمبەر درودی خودای لەسەر بێت، لەماوەی ژیانیدا بەشداری لە 27 جەنگدا کردووە.

2295 رانەبردوی (عقَّبَ)یە.

عقَّب على خطاب الرئیس.

کۆمێنتی لەسەر وتارەکەی سەرۆك دا. واتە قسەی لەسەرکرد.

2296 هەروەها بە (قُدْرات)یش کۆدەکرێتەوە.

أظهر قُدْرته الممتازة في مجال الترجمة.

توانا نایابەکەی لەبواری وەرگێڕاندا دەرخست.

2297 هەروەها بە (کافرون)و (کُفّار)یش کۆدەکرێتەوە.

الکافِرُ یعیش لذاته، والمؤمن یعیش لدینه ولغیره.

بێباوەڕ بۆ خۆی دەژی، بەڵام باوەڕدار بۆ ئایین و کەسانی تر دەژی.

2298 رمى الرجل عَقِبُ السِّیجارة على الأرض دون أن یطفئه.

پیاوەکە ئاغزە جگەرەکەی فڕێدایە سەرزەوی بەبێ ئەوەی بیکوژێنێتەوە.

2299 هەردوکیان بەمانای کچ دێن و کۆی هەردوکیشیان (بنات)ە.

لدي ولد وبنت فقط.

تەنها کچ و کوڕێکم هەیە.

سارة ابنتي الکبرى.

(عَين) لەگەڵ (جاسوس) هەردوکیان سیخوڕ[2301]

**959.** (مُعَسْكر) چیە؟ واتە سەربازگە[2302]

(مِعْلاق)، (عَلاّقة) هەردوو هەڵواسگە[2303]

**960.** "نوێژیکرد" واتە (أقامَ الصلاة)[2304]

---

سارە کچە گەورەکەمە.

[2300] نجلي الأكبر طبيب ماهر.

کوڕە گەورەکەم پزیشکێکی کارامەیە.

ذهب ولدي الصغير الى السوق.

کوڕە بچوکەکەم رۆشت بۆ بازاڕ.

تم إلقاء قنبلة ذرية على مدينة هيروشيما اليابانية في 6 أغسطس عام 1945. كانت القنبلة تُعرف باسم "الولد الصغير"، وكان أول سلاح نووي يتم استخدامه في الحرب. أدت القنبلة إلى مقتل ما يقدر بنحو 80000 شخص على الفور، وتوفي عشرات الآلاف الآخرون لاحقًا من أمراض الإشعاع.

لە 6-8-1945 بۆمبێکی ئەتۆمی درا لەشاری هێرۆشیمای ژاپۆن. ئەم بۆمبە کە بە ناوی "کوڕە بچوکەکە" ناسراوە، یەکەم چەکی ناوکی بوو کە لەجەنگدا بەکاربهێنرێت. ژمارەی ئەو کەسانەی دەسبەجێ لەئەنجامی ئەم هێرشە ئەتۆمییەدا گیانیان لەدەستدا بە نزیکەی 80 هەزار کەس دەخەمڵێنرێت. دواتر دەیان هەزاری تر بەهۆی نەخۆشیگەلی پەیوەست بە تیشکدانەوە، ژیانیان لەدەستدا.

[2301] لەم مانایەدا هەردوکیان موڕادیفن. جەمعی (عین) (عیون)ەو جەمعی (جاسوس)، (جواسیس)ە.

بێگومان وشەی (عین) بەمانای چاویش دێت.

العدو زرع عيناً في قواتنا المسلحة.

دوژمن سیخوڕێکی لەناو هێزە چەکدارەکانماندا چاند.

عقوبة الجاسوس في بعض الدول الاعدام.

لەهەندێك لەوڵاتان، سزای سیخوڕ لەسێدارەدانە.

[2302] أعمل في معسكر التَّدريب.

لەسەربازگەی مەشقکردنەکە کاردەکەم.

[2303] بێگومان لەکوردییەکەشدا زیاتر پێیدەوترێت عەلاگە کە لەعەرەبییەکەوە وەرگیراوە.

أين مِعْلاق الملابس؟

هەڵواسگەی جلهەڵواسینەکە لەکوێیە؟

اشتريت عَلاّقة ملابس جديدة لغرفتي.

هەڵواسگەیەکی نوێم کڕی بۆ ژورەکەم.

[2304] من رأى فى المنام أنه اقام الصَّلَاة على بَاب أَو سَرِير فَإِنَّهُ يَمُوت.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی لەسەر دەرگا یان لەجێگەی خەوتن، نوێژدەکات، ئەوە عومری درێژی بۆ تۆ جێدەهێڵێت! واتە دەمرێت.

(صَفْحة) لاپەڕە، جەمعەکەی (صَفْحات)[2305]

**961.** (علِمَ) زانی، دەزانێ (يَعلَمْ)[2306]

"تۆمەتبارکرد"ە مانای (اتَّهَمْ)[2307]

**962.** (ساقَ) لێخوڕی[2308]، (سِياقة) لێخوڕين[2309]

(واسِع)و (ضَخْم) هەردوکيان بەرين[2310]

**963.** (حَصْبَة) سورێژە[2311]، (جُدَرِيّ) ئاولە[2312]

---

[2305] بێگومان بە (صَفَحات)يش دەخوێنرێتەوە.

قرأت الصَّفحةَ الأولى من الكتاب.

يەکەم لاپەڕەی کتێبەکەم خوێندەوە.

[2306] رابردوو و رانەبردوی هەمان کارن.

من يعلم قيمة الوقت لا يضيعه.

هەر کەسێك نرخی کات بزانێت بەفیڕۆی نادات.

[2307] اتَّهمه ظلمًا.

بە ناحەق تۆمەتباريکرد.

[2308] ساقَ يَسوق، سُقْ، سَوْقًا وسِياقًا وسِوَاقةً وسِياقةً، فهو سائِق، والمفعول مَسُوق.

ساق السَّيَّارةَ بسرعة خطيرة.

ئۆتۆمبێلەکەی بە خێراييەکی مەترسيدار لێخوڕی.

[2309] چاوگی (ساقَ)يە.

لا أجيد سياقة السيارات الكبيرة.

ليخوڕينی ئۆتۆمبێلی گەورە بەباشی نازانم.

[2310] بەرين= فراوان.

الطريق الضَخْم يقلل حوادث المرور.

رێگای بەرين روداوی هاتوچۆ کەمدەکات.

بنيتُ غرفة واسعة للضيوف.

ژورێکی بەرينم بۆ ميوان دروستکرد.

[2311] مرض الحصبة غير قاتل.

نەخۆشيی سورێژە کوشندە نيە.

[2312] إن الجُدَرِيّ مرضٌ معدٍ ومميت.

بێگومان ئاولە نەخۆشييەکی درمی کوشندەيە.

(صُحْبَةْ منَ الوردْ) چەپكێ لەگوڵە[2313]

**964.** (يُودِّع) چيه؟ بەڕێدەكات[2314]

(نَفْخَة) واته فوو، كۆكەی (نَفَخات)[2315]

**965.** "پێسپارد" چيه؟ مانای (اِستَودَعْ)[2316]

جێهێشت، پشتگوێخست هەردوكيان (ودَعْ)[2317]

**966.** (قانون) ياسايە، كۆكەی (قَوانين)[2318]

(قَصِيرُ النَّظر) بەمانای كورتبين[2319]

**967.** (شفَی) چيه؟ چاككردەوە[2320]

---

2313 بەمانای چەكێك گوڵ دێت.

قدّمت صحبة من الورد الى حبيبتي.

چەپكێك گوڵم پێشكەش بە خۆشەويستەكەم كرد.

2314 ودَّعه جميعُ أسرته.

تەواوی خێزانەكەی بەڕێيانكرد.

2315 بێگومان بە (نَفْخات)يش كۆدەكرێتەوە.

أطفأها بنَفْخَةٍ واحدة.

بە يەك فوو كوژاندييەوە.

2316 استودع صديقه النقود.

پارەكەی سپارد بە هاوڕێكەی.

2317 ودَعَ يَدَع، دَعْ، وَدْعًا، فهو وادع، والمفعول مَوْدوع.

لا تَدَع سيَّارتك لأحد.

ئۆتۆمبێلەكەت بۆ  هيچ كەسێك جێمەهێڵە.

العاقل لا يدع استشارة عدو إذا كان ذا رأي في الأمر الذي يشركه في ضره أو نفعه.

ژير راوێژكردن بە دوژمن پشتگوێناخات لەو شتەی لەزيان ياخود سوديدا هاوبەش بون، ئەگەر دوژمنەكە دانا بوو .

2318 القانون فوق الجميع.

ياسا لەسەروو  هەموانداية.

2319 إنه سياسيّ قَصِير النَّظر.

ئەو سياسەتمەدارێكی كورتبينە. واتە زيرەك نيەو بير لەكۆتايی شتەكان ناكاتەوەو ئاستی بيكردنەوەی سنوردارە.

2320 شفَی اللهُ المريضَ.

(طوَى) هەم لولكرد، هەميش شاردەوە[2321]

**.968** (شُعاع) چيە؟ نيوەتيرە[2322]

(نظَّرَ) هاوتاكرد، هينى (تنظير)ە[2323]

**.969** (حُجْرة) واتە ژور، كۆكەى (حُجُرات)[2324]

(نَظَرْ) تێڕوانين، لەگەڵ دەسەڵات[2325]

**.970** (عَيْر) كەرى كێوى، دێش بەماناى كەر[2326]

---

خودا نەخۆشەكەى چاككردەوە.

[2321] من رأى في المانم الأَرْض طويت لَهُ فَإِن حَيَاته قد نفذت.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بينى زەوى بۆ لولكرا، ئەوەى ژيانى تەواوبووە.

طوَى سرَّ صديقه.

نهێنيى هاورێكەى شاردەوە.

[2322] جد طول شُعاع الدائرة؟

درێژيى نيوەتيرەى بازنەكە بدۆزەرەوە.

[2323] مەخسەوى شەريفم لە "هينى (تنظير)ە" بريتييە لە "چاوگەكەى (تنظير)ە"

نظّر شهادتَه العلميّة بأخرى.

بڕوانامە زانستييەكەى بە دانەيەكى تر هاوتاكرد.

[2324] بێگومان بە "حُجْرات"و "حُجَر"يش كۆدەكرێتەوە.

دخل الطفل حجرته الخاصة.

منداڵەكە چووە ژورە تايبەتەكەى خۆى.

[2325] هذا العمل جريمة في نظر القانون.

ئەم كارە لەتێڕوانينى ياسادا تاوانە. واتە بەبۆچونى ياسا.

أحيلت القضيّة إلى المحكمة ذات النَّظر.

كەيسەكە رەوانەى دادگايەكى خاوەن دەسەڵات كرا.

[2326] بەماناى كەرو كەرى كێويش دێت.

رأى عيْرًا في حديقة الحيوان.

كەرێكى لەباخچەى ئاژەڵاندا بينى.

افترس الأسدُ عَيْرًا.

شێرەكە كەرێكى كێو راوكرد.

"پێشبینیکرد"ە، مانای (تَنَظَّرْ)[2327]

**971.** (صاحبَ) چیە؟ یاوەریکرد

هەر هەمان وشە هاوڕێیەتیکرد[2328]

**972.** (حِجْر) ژێرسایە، کۆی (أحجار)، (حُجور)[2329]

(عَمَّة) و (خالة)یە دێن بەمانای پور[2330]

**973.** وشەی (خال) خاڵە[2331]، مام بەمانای (عَمّ)[2332]

"پەشیمانی"یە ماناکەی (مَنْدَم)[2333]

---

[2327] تنظَّر العالم كارثَةَ طبيعية.

زاناکە پێشبینی کارەساتێکی سروشتی کرد.

[2328] صاحبَ يُصاحِب، مُصاحَبةً وصِحابًا، فهو مُصاحِب، والمفعول مُصاحَب.

صاحب أباه في رحلة الحَجّ.

لەگەشتی حەجدا یاوەریی باوکی کرد.

صاحِبِ الأخيارَ تكن واحدًا منهم.

هاوڕێیەتیی چاکەکاران بکە دەبیتە یەکێك لەوان.

[2329] نشأ في حِجر أخيه.

لەژێرسایەی براکەیدا گەورەبوو.

[2330] هەردوکیان بەمانای پور دێن، بەڵام (عَمَّة) بەمانای خوشکی باوك و (خالة) بەمانای خوشکی دایك دێت.

{حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ}

دایکەکانتان و کچەکانتان و خوشکەکانتان و پورەکانتان لەسەرتان حەرامکراون (واتە دروست نیە هاوسەرگیریيان لەگەڵدا بکەن).

خالتي عائشة مدرّسة ذكيّة.

پورە ئایشێم مامۆستایەکی زیرەکە.

[2331] ج: أخوال، خِيلان. جج: خُئول

خالي ظلمني.

خاڵم ستەمی لێکردم.

[2332] جمع أعمام وعُمومة.

ربّاه عمُّه بعد وفاة والده.

پاش کۆچیدوایی باوکی، مامی بەخێویکرد.

[2333] چاوگی میمی-ی (ندِمَ)يە.

974. (غُلام) واته کوڕ، کۆکەی (غِلمان)ە[2334]

شوێنەکەی بڕی (طوَی المکانَ)[2335]

975. (نظَرَ) گوێپلێگرت، هینەکەی (ینظُرْ)[2336]

(جَزیرة) دورگە، جەمعەکەی (جُزُرْ)[2337]

976. (ضنِيَ) پەکیکەوت[2338]، (ضَنَي) پەککەوتوو[2339]

(توزَّعَ)ەیە دابەشکردو بوو[2340]

---

لا ینفعك الیوم مندَم.

پەشیمانی ئەمڕۆ سودی نیەز

[2334] بێگومان بە (أغْلِمَة)و (غِلْمة)ش کۆدەکرێتەوە.

من شم ریحة طیبَة في المنام وَله امْرَأة بشر بِغُلَام.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بۆنی بۆنێکی خۆشیکردو ژنی هەبوو، ئەوە مژدەی لەدایکبونی کوڕی پێدراوە.

[2335] طوَی مدناً کثیرة بحثًا عن عمل.

لەپێناو کاردا چەند شارێکی بڕی.

[2336] مەخسەوی شەریفم لە "هینەکەی (ینظُرْ)" لێرەدا بریتییە لە "رانەبردووەکەی (ینظُرْ)".

[2337] بێگومان بە "جزائِر"یش کۆدەکرێتەوە.

هل رأیت جُزُر المحیط الهندي؟

ئایا دورگەکانی زەریای هندیت بینیوە؟

[2338] پەکیکەوت بەهۆی نەخۆشییەوە نەك هۆکاری تر.واتە نەخۆشییەکەی توندبوو.

ضنِيَ الرجل في السنوات الأخیرة.

پیاوەکە لەم ساڵانەی دواییدا پەکیکەوت (بەهۆی نەخۆشییەوە) .

[2339] پەککەوتوو بەهۆی نەخۆشییەوە.

ساعد الرجل الضنيَ.

یارمەتی پیاوە پەککەوتووەکە بدە.

[2340] واتە بەمانای دابەشکردو دابەشبوو دێت.

توزَّعَ الإخوةُ التَّرکةَ.

براکان میراتەکەیان دابەشکرد.

توزَّعَت العطلةُ علی ثلاثة أشهر.

پشووەکە بەسەر سێ مانگدا دابەشبوو.

977. (عَقِب) كۆتایی، هەروەها پاژنە[2341]

(أدَبَ) بانگکرد، بەس بۆ خواردنە[2342]

978. (جَذَع) نەوجەوان، کۆی (جُذُع)، (جِذْعان)[2343]

(جذَبَ) راکێشا، (جَذْب) راکێشان[2344]

979. (جِذْع) واتە لەش، هەروەها (قەد)ە[2345]

(شِدّة) تەنگانە، کۆکەی (شِدَد)ە[2346]

---

[2341] جرى نقاشٌ عَقِبَ الجلسة.

لەکۆتایی دانیشتنەکەدا مشتومڕێك رویدا.

احرص على غسل عقبيك في الوضوء.

لەکاتی دەستنوێژدا شتنی هەردوو پاژنەت بیرنەچێت.

[2342] بەمانای "بانگکرد" دێت، بەڵام بۆ خواردن نەك شتی تر. واتە دەعوەتکردن بۆ خواردن.

أدَبَ القومَ.

خەڵکەکەی بانگکرد بۆ خواردنەکەی.

[2343] هەروەها بە (جِذاع)و (جُذعان)یش کۆدەکرێتەوە.

يَا لَيْتَنِي فِي الحرب جَذَعًا.

خۆزگە لەجەنگەکەدا نەوجەوانێك بومایە.

[2344] رابردوو و چاوگی هەمان کارن.

جذب الغريقَ إلى الشَّاطئ.

نقومبووەکەی راکێشا بۆ کەنارەکە.

[2345] بەمانای لەش (ی مرۆڤ بەبێ سەرو پەلەکانی)و قەد (ی درەخت) دێت.

كان جذع الميّت منتفخاً.

لاشەی مردووەکە ئاوسابوو.

استند الطفل على جِذْع الشجرة ليستريح.

منداڵەکە پاڵیدا بە قەدی درەختەکەوە بۆ حەوانەوە.

[2346] بێگومان بە "شِدَّات"یش کۆدەکرێتەوە.

مرّ الزوجان بأيّام شِدّة وأيّام رخاء.

ژن و مێردەکە بە رۆژگاری تەنگانەو خۆشیدا تێپەڕیون.

عند الشِدّة يُختبَر الأصدقاء.

980. (إبهام) چیە؟ پەنجەگەورە[2347]

(صَقْر) هەڵۆیە، کۆکەی (أَصْقُر)ە[2348]

981. (زادَ) زۆربوو، هینی (يَزِيد)ە[2349]

(ميعاد) مانای کات، کۆی (مواعيد)ە[2350]

---

هاوڕێ لەکاتی تەنگانەدا تاقیدەکرێتەوە.

2347 أُصيب إبهام العامل أثناء العمل.

لەکاتی کارەکەدا، پەنجەگەورەی کرێکارەکە بریندار‌بوو.

الْأَصَابِع فِي الْمَنَام تعبر بالصلوات الْخمس فالإبهام صَلَاة الْفجْر وَالْبَاقِي على التَّرْتِيب فَمَا حدث فِيهَا نقص فَفِي الصَّلَوَات وَقيل الْخِنْصر تعبر بِالْفَجْرِ وَالْبَاقِي على التَّرْتِيب وَقيل الْخِنْصر يدل على صَلَاة السّفر لقصرها.

راڤەی پەنجەکان لەخەودا بریتییە لە پێنج نوێژە فەرزەکە، پەنجەگەورە ئاماژەیە بۆ نوێژی بەیانی و ئەوانی تریش بە هەمان ریزبەندی. هەر کەموکورتییەك بەسەر پەنجەکاندا بێت لەخەودا، ئەوە ئاماژەیە بۆ کەموکورتی لەنوێژەکاندا. دەشوترێت، پەنجەتوتە بەهۆی کورتییەکەیەوە، ئاماژەیە بۆ نوێژ لەسەفەردا.

2348 بێگومان بە "صُقُور"یش کۆدەکرێتەوە.

أعين الصقور لا تنام.

چاوی هەڵۆ ناخەوێت.

يمتلك الصقر رؤية فائقة الدقة، حيث يمكنه رؤية الفريسة من مسافة تتجاوز 3 كيلومترات. يُعتقد أن حدة نظر الصقر أقوى من البشر بثماني مرات.

هەڵۆ توانایەکی لەڕادەبەدەر وردی هەیە لەڕوی بینینەوە، بەشێوەیەك کە دەتوانێت نێچیر لەدوریی زیاتر لە سێ کیلۆمەترەوە ببینێت. زانایان لەو بڕوایەدان کە تیژبینیی هەڵۆ هەشت جار لە هی مرۆڤ بەهێزترە.

2349 مەخسەوی شەریفم لەوشەی "هینی" لێرەدا بریتییە لە "رانەبردووەکەی".

زادَ يَزِيد، زِدْ، زِيادةً وزَيْدًا، فهو زائد.

زاد مالُه بعد الإنتفاضة.

من زاد علمه، زاد تواضعه.

هەرکەسێك زانستی زۆربوو، خۆبەکەمگریشی زۆردەبێت.

پاش راپەڕینەکە سامانەکەی زیادیکرد.

طول الْأَصَابِع فِي الْمَنَام زِيَادَة طمع.

درێژبونی پەنجە لەخەودا ئاماژەیە بۆ زیادبونی هەڵپەکاری.

2350 بە دیاریکراوی بەمانای کاتی دیاریکراو یان کاتی بەڵێنلەسەردراو دێت.

صدرت الجريدة في ميعادها.

**982.** (يَعُقُّ) چيه؟ بێگوێییدەکات[2351]

(قُرْبة) چاکەیە، کۆکەی (قُرُبات)[2352]

**983.** (فرَغَ) لێبووەوە، هەم (لێبڕا)یە[2353]

(تحوَّلَ)یە "لایدا"و "گۆڕا"یە[2354]

**984.** (خَيْط) دەزووە[2355]، (إبْرة) دەرزییە[2356]

---

رۆژنامەکە لەکاتی خۆیدا دەرچوو. واتە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا بەبێ دواکەوتن یان پێشخستن.

[2351] رانەبردوی (عَقّ)یە.

عَقَّ، عَقَقْتُ، يَعُقّ، اعْقُقْ/ عُقّ، عُقوقًا وعَقًّا، فهو عاقّ، والمفعول معقوق.

نهى الإسلامُ عن عُقوق الوالدين.

ئیسلام بێگوێییکردنی دایکوباکی قەدەغەکردووە.

من قَالَ أُفٍّ فِي مَنَامه، فَإِنَّهُ عَاقّ لوَالِديهِ، لقوله تعالى (وَلَا تقل لَهما أُفٍّ وَلَا تنهرهما).

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی دەڵێت، ئۆف، ئەوە بێگوێییکەری دایکوباوکیەتی چونکە خودا لەقورئاندا دەفەرمێت: "پێیان مەڵێن ئۆف و بەسەریاندا هەڵمەشاخێن".

[2352] هەروەها بە (قُرْبات}و (قُرَب)یش کۆدەکرێتەوە.

هل لديك قُرُبات كافية لدخول الجنة؟

هێندە چاکەت هەیە کە بەشی چونە بەهەشت بکات؟

[2353] فرَغَ العامل من عمله.

کرێکارەکە لەکارەکەی بووەوە.

فرَغ الطالب للمذاكرة.

خوێندکارەکە لێبڕا بۆ سەعیکردن.

[2354] تحوّل القطارُ عن مساره.

شەمەندۆفیرەکە لەڕێڕەوی خۆی لایدا.

تحوَّل الماءُ إلى بُخار بسبب الحرارة.

بەهۆی گەرمییە، ئاوەکە گۆڕا بۆ هەڵم.

من رأى في مَنَامه كَانَ اسْمه تحوّل إِلَى اسْم ذِي عاهة كالأعمى والأعرج فَإِنَّهُ يبتلى بذلك نَعُوذ بِاللَّه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی ناوەکەی گۆڕا بۆ ناوێك کە کەمئەندامی تێدا بوو وەك نابیناو شەل، ئەوە توشی ئەو شتە دەبێت، پەنادەگرین بە خودا.

[2355] هەروەها چاوگی (خاطَ)ەشە واتە بەمانای دورینیش دێت.

خَيْط الثوب عمل متعب.

(إمساك)و (قَبْض) هەردوو قەبزییە[2357]

**985.** (سقَى) "ئاودا"یە، هینی (یسقي)یە[2358]

(ساقية) جۆگە، کۆی (سواقي)یە[2359]

**986.** (أسقى) چیە؟ ئاوییێدا[2360]

(عَسكَرَ) مانای چادریهەڵدا[2361]

---

درووینی جلوبەرگ کارێکی ماندوکەرە.

في القميص خيط حريري جميل.

کراسەکە دەزویەکی جوانی ئاوریشمی تێدایە.

[2356] جمع إبْرات

خاط الثوبَ بالإبْرة.

جلوبەرگەکەی بە دەرزی دوری.

من أكل إبرة في المنام فشيء سره إِلَى من يضرّهُ.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی دەرزییەکی خوارد، ئەوە نهێنی لای کەسێك ئاشکرادەبێت کە زیانی پێدەگەیەنێت.

[2357] الإمساك حالة مزعجة.

قەبزی حاڵەتێکی بێزارکەرە.

بعد تناول الموزة، أصبت بقبضٍ حادّ.

پاش خواردنی مۆزەکە، توشی قەبزییەکی توند بوم.

[2358] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "هینی" لێرەدا بریتییە لە "رانەبردووەکەی".

سقَى النباتَ.

رووەکەکەی ئاودا.

من رأى في المنام بأن رجلاً سقى بستانه من غير ساقيته فَإِن ذَلِك الرجل يخونه فِي امْرَأَته.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی پیاوێك باخەکەی ئاودەدات بەڵام لەجۆگەی خۆی نا، ئەوە ئەو پیاوە ناپاکی لەگەڵ هاوسەری خەوبیندا دەکات.

[2359] جلست بالقرب من الساقية.

لەنزیك جۆگەکە دانیشتم.

[2360] أسقى الرَّجُلَ.

ئاوی دا بە پیاوەکە (بۆ خواردنەوە).

[2361] عسكرَ جيشُ الاحتلال بالقرب من المدينة.

سوپای داگیرکەر لەنزیك شارەکە چادری هەڵدا.

987. (ماليَّة) چیە؟ گەنجینەی دەوڵەت[2362]

(حِنْطَة) گەنمە، کۆدوجای (حِنَط)[2363]

988. (ودَّعَ) چیە؟ وازیلێهێنا[2364]

(ألَّفَ) هەڵبەست، دانا، پێکهێنا[2365]

989. پێشنوێژی چیە؟ واتە (إِمَامَة)[2366]

(وَشْم) تاتۆیە، کۆکەی (وِشام)ە[2367]

990. (مُروِّج) چیە؟ مانای برەودەر[2368]

---

[2362] لا تستطيع الماليَّة أن توفّر رواتب جميع الموظفين.

گەنجینەی دەوڵەت ناتوانێت موچەی گشت کارمەندان دابینبکات.

[2363] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە "کۆدوجا" بریتییە لە جەمعی جەمع.

هەروەها بە "حِنْطات"یش دەبێتە کۆدوجا.

الحنطة مصدر مهم للغذاء في العديد من البلدان.

گەنم لەچەندین وڵاتدا سەرچاوەیەکی گرنگی خۆراکە.

[2364] ودَّع العملَ الصَّحفيَّ.

وازی لەکاری رۆژنامەوانی هێنا.

[2365] ألَّفَ يؤلِّف، تأليفًا، فهو مؤلِّف، والمفعول مؤلَّف

ألَّف الكذّاب خبر موت أبيه.

درۆزنەکە هەوڵی مردنی باوکی هەڵبەست. واتە بە درۆ هەواڵی مردنی باوکی بڵاوکردەوە.

ألَّفَ الرجل كتاباً حول أهم حوادث حياته.

پیاوەکە کتێبێکی سەبارەت بە گرنگترین رووداوەکانی ژیانی، دانا.

ألَّفَ كتاباً جديداً حول الموضوع.

کتێبێکی نوێی سەبارەت بە بابەتەکە دانا.

ألَّف الحزب الفائز حكومة جديدة.

پارتی براوە حکومەتێکی نوێی پێکهێنا.

[2366] المنافق لا يصلح للإمامة.

دوڕوو بۆ پێشنوێژی ناشێت.

[2367] رأيتُ وشمًا في ذراعه.

تاتۆیەکم لەقۆڵیدا بینی.

(عِير) واتە کاروان، هی حوشتر یا کەر[2369]

**991.** (وقَفَ) هەستا، چاوگەکەی (وُقوف)[2370]

(کَفّ) لەپی دەستە، جەمعەکەی (کُفوف)[2371]

**992.** (ظَرْف) دۆخ و زەرف، لەگەڵ هاوەڵکار[2372]

(وَتَرْ) واتە ژێ، جەمعەکەی (أوتار)[2373]

---

2368 برەودەر= برەوپێدەر: کەسێك کە وا لەشتێك بکات خواستی زۆر لەسەر بێت.

إنه يعمل كمُروِّج للسيارات الحديثة.

ئەو وەك برەودەرێکی ئۆتۆمبێلی نوێ کاردەکات.

2369 هەروەها بەمانای کاروانی هێستریش دێت.

في العير أطعمة متنوعة.

کاروانەکە خۆراکی جۆراوجۆری تێدایە.

2370 وقَف التَّلاميذ احترامًا للأستاذ عند دخوله.

قوتابییەکان لەکاتی هاتنەژورەوەی مامۆستاکەدا، وەك دەربڕینی ڕێز، هەستان.

2371 هەروەها بە (أَكُفّ)یش کۆدەکرێتەوە.

وضعت المعلمة الطباشير في كَفّ الطالب.

مامۆستاکە تەباشیرەکەی لەناو لەپی دەستی خوێندکارەکە دانا.

2372 جمع أَظْرُف وأَظْرِفة وظروف.

هاوەڵکار= ئاوەڵکار= ئاوەڵفەرمان.

بعد موت أبي وقعت في ظرف سيء.

پاش مردنی باوکم کەوتمە دۆخێکی خراپەوە.

ضع الرسالة في ظرف متين.

نامەکە بخەرەناو زەرفێکی پتەوەوە.

الظرف لا ينقص من قيمة المحتوى.

زەرف لەبەهای ناوەرۆك کەمناکاتەوە.

هل تجيد استعمال الظروف في الجملة؟

ئایا دەزانیت هاوەڵکار بەباشی لەڕستەدا بەکاربهێنیت؟

2373 بە (وِتار)یش کۆدەکرێتەوە.

العُودُ ليس له صوتٌ بلا وَتَرٍ.

عود بەبێ ژێ، دەنگی نیە.

993. (يَدْ) دەست و دەسك[2374]، (ثَدْي)و (نَهْد) مەم[2375]

(أُذْن) واتە گوێ[2376]، (فَم) بەمانای دەم[2377]

994. (مَوْجَة) شەپۆلە، جەمعەكەی (أمواج)[2378]

(إِكْلِيل) لەگەڵ (تاج) هەردوو مانای تاج[2379]

---

[2374] جمع أيادٍ وأيدٍ.

لەمانای دووەمیاندا مورادیفی (مَقْبَض)ە.

غسل الطفل يديه بالصابون.

منداڵەكە دەستی بە سابون شۆرد.

لا تلمس يد القدر، إنها حارة.

دەستمەدە لەدەسكی مەنجەڵەكە، گەرمە.

[2375] هەردوكیان بەمانای مەم دێن. مەم= مەمك.

ثديك اليسرى أكبر.

مەمكی چەپت گەورەترە.

إزدياد حجم النهد علامة البلوغ.

زیادبونی قەبارەی مەمك نیشانەی باڵقبونە.

[2376] بە (أُذُن)یش دەنوسرێت.

جمع آذان

بعض الأحيان تصدر أصواتاً غريبة من أذني اليسرى.

هەندێ جار چەند دەنگێكی نامۆ لەگوێی چەپمەوە دەردەچێت.

[2377] جمع أفمام وأفواه، مثنى فَمان وفَموان.

فمك كبير.

دەمت گەورەیە.

[2378] بە (مَوْجات) و(مَوَجات)و (مَوْج)یش كۆدەكرێتەوە.

هل تستطيع ركب أمواج البحر؟

ئایا دەتوانیت سوار شەپۆلی دەریا ببیت؟

[2379] إكليلُ الملك لايقدّر بثمن.

تاجی پادشا بە پارە ناخەمڵێنرێت.

هل لبست التاج قطّ؟

هەرگیز تاجت لەسەركردووە؟

الصحة تاج على رؤوس الأصحاء لا يراه إلا المرضى.

**.995** (دُكَّان) و (حانوت) هەردوكیان دوكان[2380]

(هَجین) دوڕەگە، جەمعەكەی (هِجان)[2381]

**.996** (ثَوْب)و (زِيّ)، (رِداء)، وەك (لِباس) پۆشاك[2382]

(ضَفادِع) بۆقە، بەڵام كۆ نەك تاك[2383]

**.997** (فِجّ) مانای كاڵە، هەم چەقاوەسوو[2384]

---

تەندروستی تاجێكە لەسەر سەری كەسانی تەندروست، بەڵام تەنها نەخۆش دەیبینێت.

[2380] يعمل في دُكَّان خيَّاط.

لەدوكانێكی بەرگدرودا كاردەكات.

كان صاحب الحانوت رجلاً غضباناً.

خاوەنی دوكانەكە پیاوێكی تووڕە بوو.

[2381] بە (هَجائن)و (هُجُن)یش كۆدەكرێتەوە.

هل رأيت النبات الهجين في حياتك؟

ئایا رووەكی دووڕەگت لەژیانتدا بینیوە؟

[2382]هەرچواریان بەمانای پۆشاك دێن. پۆشاك= جلوبەرگ.

ظهر العريس في ثوب جذّاب.

زاوا لەپۆشاكێكی سەرنجڕاكێشدا دەركەوت.

هل تلبس زِيّك الجديد للحفلة؟

ئایا پۆشاكە تازەكەت لەبەردەكەیت بۆ ئاهەنگەكە؟

لا توجد أيّ علاقة بين رداء المرء وشخصيته.

هیچ پەیوەندییەك نیە لەنێوان جلوبەرگی مرۆڤ و كەسایەتییدا.

وشەی "رداء" بەتایبەت بەمانای جلوبەرگی سەرەوە دێت وەك عەباو جبە نەك هەموو جلوبەرگێك.

إرتداء لباس مناسب جزء من ثقافة الإنسان.

لەبەركردنی جلوبەرگی گونجاو بەشێكە لەڕۆشنبیریی مرۆڤ.

[2383]تاكەكەی (ضَفْدَع)و (ضُفْدَع)و (ضُفْدُع)و (ضِفْدَع)، واتە تەقریبەن هەرچۆنێك بینوسیت راست دەردەچێت!

الضفدع في الحلم يدلّ على الرجل النافع الذي يساند الرائي في مواجهة ظلمٍ أو افتراء.

بۆق لەخەودا ئاماژەیە بۆ پیاوێكی بەسود كە پشتی خەوبین (ئەو كەسەی خەوەكەی بینیوە) دەگرێت لەڕووبەڕووبونەوەی ستەم یان درۆ هەڵبەستندا.

[2384] كاڵ= نەگەیو

لا أحبّ الفواكه الفِجَّة.

حەزم لەمیوەی كاڵ نیە.

(مَنْفَعة) سوده[2385]، (فائِدة) سود، سوو[2386]

**998.** (اِبتلَعَ) قوتدا، (اِبْتِلاع) قوتدان[2387]

(إعدام) ماناكەی لەسێدارەدان[2388]

**999.** (بلَعَ) قوتدا، (بَلْع)یش قوتدان[2389]

(سُكَّرِيَّة)یە مانای شەكردان[2390]

**1000.** (مَجَلَّة) گۆڤار[2391]، (جَريدة) رۆژنامە[2392]

---

لا تصاحب الرجل الفِجّ.

هاوڕێیەتی پیاوی چەقاوەسوو مەكە.

[2385] جمع منافِع

ما هي منفعة المشروع الماديَّة؟

سودی ماددیی پرۆژەكە چیە؟

[2386] جمع فوائد

في القراءة فوائد عديدة.

خوێندنەوە چەندین سودی هەیە.

أقرضه مالاً بفائدة كبيرة.

بە سوویەكی زۆر قەرزی پێدا.

[2387] ابتلع الطعام بسرعة.

خواردنەكەی بەخێرایی قوتدا.

يأخذ الدواء عن طريق الابتلاع.

دەرمانەكە لەڕێگەی قوتدانەوە وەردەگیرێت.

[2388] إعدام البريء جريمة عظيمة.

لەسێدارەدانی بێتاوان، تاوانێكی گەورەیە.

[2389] رابردوو و چاوگی هەمان كارن.

بلَع الطَّعامَ بسرعة خطيرة.

خواردنەكەی بە خێراییەكی مەترسیدار قوتدا.

[2390] وضع السُّكَّريّة بجوار الفنجان.

شەكردانەكەی لەتەنیشت كوپەكەوە دانا.

[2391] العلوم مَجَلَّة علميّة.

ئەلعلوم گۆڤارێكی زانستییە.

(طَريق)، (سَمْت) ڕێگا[2393]، (شارِع) شەقامە[2394]

**1001.** (مُنْيَة)و (أُمنيَة) هەردوكيان ئاوات[2395]

(عَضَلَة) ماسولكە، كۆكەی (عَضَلات)[2396]

**1002.** (أَرْض) واتە زەوی[2397]، (سَمَاء) ئاسمانە[2398]

(داء) بەمانای دەرد[2399]، (دَواء) دەرمانە[2400]

---

2392جريدة الأهرام لم تنشر مقالتي.

ڕۆژنامەی ئەلئەهرام وتارەكەمی بڵاونەكردەوە.

2393 (طَريق) بەمانای ڕێگا دێت بەگشتی، بەڵام (سَمْت) بەمانای ڕێگایەك دێت كە ڕون بێت.

الطريق غير معبّد.

ڕێگاكە قیرتاوكراو نیە.

مضى في سَمْته نحو هدفه.

لەڕێگاكەی بەردەوامبوو بەئاڕاستەی ئامانجەكەی.

2394 إبق فى رأس الشارع الرئيسي حتى أصل اليك.

تا ئەگەمە لات، لەسەرەتای شەقامە سەرەكییەكەدا بمێنەرەوە.

2395 كانت مُنيتُه الحصول على الكأس.

ئاواتی ئەوە بوو جامەكە بەدەستبهێنێت.

ما هي أكبر أمنيتك في الحياة؟

گەورەترین ئاواتت لەژیاندا چیە؟

2396 تحتاج لستة وعشرين عضلة لتبتسم، واثنتين وستين عضلة لتعبس.

پێویستت بە 26 ماسولكە هەیە بۆ ئەوەی زەردەخەنە بكەیت، بەڵام بۆ ڕوگرژكردن پێویستت بە 62 هەیە.

2397 جمع أَرْضون وأَرَضون وأراضٍ.

نعيش على الأرض.

لەسەر زەوی دەژین.

2398 جمع سَموات

السماء صافية تماماً.

ئاسمان تەواو سامالە.

2399 جمع أَدواء

دەرد= نەخۆشی

في أواخر حياته، أصيب بداء عضال.

**1003.** (اِخْتِرَاع) چیە؟ مانای داهێنان[2401]

(طُنّ) مانای تۆنە، جەمعەکەی (أطنان)[2402]

**1004.** (مُذِیع) بێژەرە[2403]، (مِذْیاع)یش رادیۆ[2404]

(ظَهر) واتە پشت[2405]، (ظُهر) نیوەڕۆ[2406]

---

لەکۆتاییەکانی ژیانیدا، توشی دەردێکی کوشندە بوو.

[2400] جمع أَدوية

لا تنس دواءك في الصيدليّة.

دەرمانەکەت لەدەرمانخانەکە بیرنەچێت.

لا تعامل كل الناس بإسلوب واحد فليس كل المرضى يأخذون نفس الدواء.

بە یەك شێواز رەفتار لەگەڵ هەموو کەسێکدا مەکە. هەموو نەخۆشەکان یەك جۆر دەرمان بەکارنابەن.

[2401] چاوگی (اخترعَ)یە.

الحاجة أمّ الاختراع.

پێویستی دایکی داهێنانە.

[2402] بە (طِنَان)یش کۆدەکرێنەوە.

تۆن: هەزار کیلۆگرام. لەشێوەزاری نارەسمیدا (تەن)یشی پێدەووترێت.

هل تعلم أن الفرد الواحد يشرب في العام الواحد مقدار طُنّين من الماء؟!.

ئایا دەزانیت کە هەر تاکێك ساڵانە بڕی دوو تۆن ئاو دەخواتەوە؟!

احتاج الى طنّ إسمنت لبناء غرفتي الجديدة.

بۆ دروستکردنی ژورە نوێیەکەم پێویستم بە تۆنێك چیمەنتۆ هەیە.

[2403] أثناء قراءته للخبر المحزن، بكى المذيع.

لەکاتی خوێندنەوەی هەواڵە خەفەهێنەکەدا، بێژەرەکە گریا.

[2404] جمع مَذاييع

أعتقد بأن المذياع أكثر إستفادة من التلفاز.

لەو بڕوایەدام رادیۆ لە تەلەفزیۆن سودی زیاترە.

[2405] ج: أظْهُر، ظُهُور

انحنى ظَهْرُه من ثقل الحِمْل.

بەهۆی قورسیی بارەکەوە، پشتی چەمایەوە.

[2406] ظُهر اليوم حارّ.

نیوەڕۆی ئەمڕۆ گەرمە.

**1005.** (نَسْر) هەم (نِسْر) هەردوو مانای داڵ[2407]

(سَرَطان) شێرپەنجە، هەروەها قرژاڵ[2408]

**1006.** (عُقاب) هەڵۆیە، جەمعەکەی (عِقْبان)[2409]

(وقَفَ) وەستان، هەروەها هەستان[2410]

**1007.** (لَحْم) مانای گۆشت[2411]، (عَظْم) ئێسقانە[2412]

---

[2407] بەهەردوو سپێڵەکە دەنوسرێت.

جمع نُسُور

يقول ابن سيرين أن رؤية النسر في المنام تدل على ملك الملوك وزعيم الزعماء.

ئیبن سیرین دەڵێت، بینینی داڵ لەخەودا ئاماژەیە بۆ پادشای پادشایان و سەرکردەی سەرکردەکان.

[2408] جمع سرطانات وسراطين

اللهم لا تمتحننا بمرض السرطان.

خودایە بە نەخۆشیی شێرپەنجە تاقیمان نەکەیتەوە.

السرَطان حيوان مخيف.

قرژاڵ زیندەوەرێکی ترسناکە.

[2409] هەروەها بە (أَعْقُب)یش کۆدەکرێتەوە.

قدرة رؤية العقاب أقوى من رؤية الإنسان بحوالي 4-5 مرات.

توانای بینینی هەڵۆ چوار تا پێنج جار لە هی مرۆڤ بەهێزترە.

[2410] وەستان= وەستاند. هەستان= هەستاند.

وقَفَ الدَّابّةَ للإستراحة.

وڵاخەکەی وەستاند بۆ پشودان.

وَقَفَ المدرّس التلميذ.

مامۆستاکە قوتابییەکەی هەستاند.

2411 جمع لُحوم

لا أحبّ لحم البقر.

حەزم لەگۆشتی مانگا نیە.

[2412] جمع الجمع أعظُم وعِظام، مفرد عَظْمَة.

ئێسقان= ئێسك.

أكل اللَّحمَ وترك العظمَ.

گۆشتەکەی خواردو ئێسقانەکەی جێهێشت.

(وَجْنَة) رومەته[2413]، (صُدْغ) لاجانه[2414]

**1008.** (خَدّ) واته رومەت، کۆکەی (خِدَاد)ه[2415]

"تویشوی ئامادەکرد" مانای (زادَ)[2416]

**1009.** (کُلِّیَّة) کۆلێژ[2417]، (کُلْیَة) گورچیله[2418]

وشەی (سُلّ)و (سِلّ) هەردوکیان سیله[2419]

**1010.** (سُوق) واته بازاڕ، کۆکەی (أسواق)ه[2420]

---

2413 رومەت= گۆنا= کولم. موڕادیفی (خَدّ)ه.

احمرتْ وَجْنتا الفتاة خجلاً.

هەردوو رومەتی کچەکه لەشەرمدا سور هەڵگەڕان.

2414 جمع أَصْداغ وأَصْدُغ.

لاجان= لاجانگ: نێوان چاوو گوێ لەسەردا.

ضُرب على صُدْغه فأغمي عليه.

درا له لاجانی و بورایەوه.

2415 هەروەها به (أَخِدّة)و (خِدّان)و (خُدُود)یش کۆدەکرێتەوه. موڕادیفی (وَجْنَة)یه.

رومەت= گۆنا= کولم.

خَدّها الجذاب يجنن الرجال.

رومەته سەرنجڕاکێشەکەی پیاو شێتدەکات.

2416 زادَ يَزوُد، زُدْ، زَوْدًا، فهو زائد.

العاقل يزُودُ لآخرته كما يزود لدنياه.

مرۆڤی ژیر هەروەك چۆن تویشوو بۆ دونیای ئامادەدەکات، ئاوهاش بۆ رۆژی دوایی ئامادەیدەکات.

2417 جمع كُلِّيّات

هو خريج كُلِّيّة الآداب.

ئەو دەرچوی کۆلێژی ئادابه.

2418 جمع كُلْيات وكُلًى، مث كُلْيتان

زرعت للمريض كُلية أخيه.

نەخۆشەکه گورچیلەی براکەی تێدا چێنرا.

2419 به هەردوو شێوازەکه دەنوسرێت.

السلّ مرض قاتل.

سیل نەخۆشییەکی کوشندەیه.

(عتُقَ) كۆنبوو، مەسدەر (عَتَاقة)[2421]

**1011.** (زيز) زيكزيكەيە، جەمعەكەى (زيزان)[2422]

(نَعْجة) واتە مەڕ[2423]، (جُحْجُح)يش بەران[2424]

**1012.** (شَرِير) خراپەكار، جەمعەكەى (أشرار)[2425]

(ألَّفَ) واتە گەيشتە هەزار[2426]

**1013.** (غَضِبَ)، (اِحْتَدَّ) واتە توڕەبوو[2427]

---

[2420] {وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ}.

وتيان ئەمە چ پێغەمبەرێكە كە خواردن دەخوات و بە بازاڕدا دەگەڕێت.

[2421] هەروەها بە (عِتْق)يش دەبێتە چاوگ.

عتُقت ملابسُه.

جلوبەرگەكانى كۆنبون.

[2422] زيكزيكە= زيكزيككەرە= سيسركى دەنگدار: جۆرە مێرويەكى باڵدارەو لەسەر درەخت و گژوگيا دەنيشێتەوەو دەنگێك دەردەكات وەك ئەوەى بڵێت زيز، هەربۆيەش ئەو ناوەى لێنراوە.

الزيز حشرة مزعجة.

زيكزيكە مێرويەكى بێزاركەرە.

[2423] جمع نَعَجات ونَعْجات ونِعاج

نعجة واحدة خير من عشر دجاج.

يەك مەڕ لە 10 مريشك باشترە.

[2424] الجُحْجُح سمين.

بەرانەكە قەڵەوە.

[2425] صحبة الأخيار تورث الخير، وصحبة الأشرار تورث الندامة.

هاوڕێيەتيكردنى چاكەكاران چاكە بەدواى خۆيدا دەهێنێت، بەڵام هى خراپەكاران پەشيمانى بەدواى خۆيدا دەهێنێت.

[2426] ألَّف المصلُّون.

نوێژخوێنەكان گەيشتنە هەزار. واتە ژمارەيان گەيشتە هەزار.

[2427] غضِبَ، يَغضَب، غَضَبًا، فهو غضِب وغاضِب وغضبانُ، والمفعول مغضوب عليه.

غضِب الأبُ على ابنه.

باوكەكە لەكوڕەكەى توڕە بوو.

احتدَّ يحتدّ، احْتَدِدْ/احْتَدَّ، احْتِدادًا، فهو مُحتَدّ.

اِحْتَدَّ الشرطي في محاورته.

(كِساء) جلوبەرگ[2428]، (مِكْواة)ە ئوتوو[2429]

**1014.** (بَطالة) چیە؟ بێكاربونە[2430]

(إیاس) ماناكەی نائومێدبونە[2431]

**1015.** (مَنّ) گەزۆیە، جەمعەكەی (أمنان)[2432]

(سِرَر) بەمانای لۆچ"ی ناوچەوان"[2433]

**1016.** (قشَرَ) پاككرد، (یقشُر) پاكدەكات[2434]

(قَبْضَة) واتە مشت، كۆكەی (قَبَضات)[2435]

---

پۆلیسەكە لەگفتوگۆكردنەكەیدا توڕەبوو.

2428 جمع أكْسِیَة، مث كِساءان وكِساوان.

جلوبەرگ= پۆشاك

أعتقل الطبیب بكساءه الرسمي.

پزیشكەكە بە جلوبەرگی فەرمیی خۆیەوە دەستگیركرا.

2429 جمع مَكاوٍ.

اشتریت مِكْواة كهربائیّة جدیدة.

ئوتویەكی كارەبایی تازەم كڕی.

2430 چاوگی (بطَلَ)یە. بێكاربون= بێكاری.

بطَل العاملُ بعد إغلاق المعمل.

پاش داخستنی كارگەكە، كرێكارەكە بێكاربوو.

2431 چاوگی (أیِسَ)یە. نائومێدبون= نائومێدی.

أیِسَ من الشّفاء بعد إصابته بمرض عضال.

پاش توشبونی بە نەخۆشییەكی كوشندە، نائومێدبوو لەچاكبونەوە.

2432 هل تحبّ المنّ؟

حەزت لەگەزۆ هەیە؟

2433 ج: أَسارير

أَسارير وجهه تخبرنا القلیل من المعلومات الجسدیة.

لۆچگەلی ناوچەوانی كەمێك زانیاریمان پێدەڵێت سەبارەت بە جەستەی.

2434 پاككردن بە مانای توێكڵێكردنەوە.

من رأى في المنام كَأَنَّهُ یقشر بصلا فَإِنَّهُ یتملق رجلاً.

ئەگەر كەسێك لەخەودا بینی پیاز پاكدەكات، ئەوە ماستاو بۆ پیاوێك دەكات.

1017. (بزَرَ) واته چاند، چاوگەکەی (بَزْر)ه[2436]

(أجَمة) دارستان، بەڵام هی (چڕ)ه[2437]

1018. (فارَ) "هەڵچوو"ە، هینەکەی (یفور)[2438]

(جُحْر) واته کون، جەمعەکەی (جُحور)[2439]

1019. (ألِفَ) چیه؟ هۆگرییوو[2440]

(امْتَلَأ)یە بەمانای پڕبوو[2441]

1020. (شدیدُ البأس)ه واتای (ئازا)یە[2442]

---

2435 هەروەها بە (قَبْضات)یش کۆدەکرێتەوە.

أعطاه قَبْضَة من أرز.

مشتێك برنجی پێدا.

2436 موراديفی (بذر)یە.

بزر الفلاحُ القمحَ في الأرضِ.

جوتیارەکە گەنمەکەی لەزەوییەکەدا چاند.

2437 بەمانای دارستانی چڕ دێت.

جمع الجمع أَجَمات وآجام وأَجَم.

الموت لا تنجو منه الأُسْد في الآجام.

شێر لەدارستانی چڕیشدا لەمردن رزگاری نابێت.

2438 بێگومان مەخسەوی شەریفم لە هینەکەی بریتییە لەڕانەبردووەکەی.

فار اللبن.

شیرەکە هەڵچوو.

2439 هەروەها بە (جَحَرة)و(جِحَرَة)ش کۆدەکرێتەوە.

دخلت الحيّة جُحرها.

مارەکە چووە کونەکەیەوە.

2440 ألف الموظف زميلته.

کارمەندەکە هۆگری کچەهاوکارەکەی بوو.

2441 من رأى في المنام أنه امْتَلَأت بئره فَإِن امْرَأَته تشفق عَلَيْهِ وَلَا تكلفه كثير نَفَقَة وَقيل إِن الْبِئْر إِذا امْتَلَأت دلّت على حمل الْمَرْأَة.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی بیرەکەی پڕبوو، ئەوە ژنەکەی بەزەیی پێدا دێتەوەو بارگرانیی ماددی زۆری ناخاتە سەر، هەندێکیش دەڵێن پڕبونی بیر ئاماژەیە بۆ دوگیانبونی ژن.

"شۆڕکردەوە"یە مانای (أدلی)یە[2443]

1021. (يَدنُو) بەمانای نزیکدەبێتو[2444]

(أخضبة) بۆیاخ، بەڵام تاك نا کۆ[2445]

1022. (طَلَبَ) داواکرد، چاوگەکەی (طِلاب)[2446]

(صَعْب) واتە قورس، جەمعەکەی (صِعاب)[2447]

1023. "توش بەڵەکی بوو" مانای (بهِقَ)[2448]

(حقيقة) راستی، کۆی (حقائِق)[2449]

---

2442 هو محارب شديد البأس، لا يقهر في المعركة.

جەنگاوەرێکی ئازایە، لەجەنگدا نابەزێنرێت.

2443 أَدْلَى الرجل دَلْوَه في البئر ليَمْلأها.

پیاوەکە دۆلچەکەی شۆڕکردەوە بۆ ناو بیرەکە بۆ ئەوەی پڕییکات لەئاو.

2444 رانەبردوی (دنا)یە.

من رأى في المنام بِئْرا لَا مَاء فِيهِ فقد دنت وَفَاته.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بیرێکی بینی ئاوی تێدا نیە، ئەوە مردنی نزیکبووەتەوە.

2445 تاکەکەی (خِضاب)یە.

خِضاب النِّساء الحِنّاء.

بۆیاخی ژنان خەنەیە.

2446 هەروەها بە (طَلَب)و (طِلابة)ش دەبێتە چاوگ.

بئر السَّبِيل في المنام امْرَأَة زَانِيَة لِأَنَّهَا لَا تمنع قاصدها وَكَذَلِكَ الزَّانِيَة لاتمتنع من الَّذِي يطْلبهَا.

بیری سەر رێگا (بیری رێبوار) لەخەودا تەفسیرەکەی ژنی سۆزانییە، چونکە ئەم جۆرە بیرە رێ لەو کەسە ناگرێت کە دەچێتەسەری، هەروەك چۆن ژنی سۆزانی رێ لەو کەسە ناگرێت کە داوایدەکات.

2447 أمامي امتحان صَعْب.

تاقیکردنەوەیەکی قورسم لەبەردەمدایە.

2448 بێگومان دەبوو لەبری "توش بەڵەکی بوو" بمنوسیایە "توشی بەڵەکی بوو"، بەڵام لەبەر زەروراتی شیعر پیتی یائەکەم لابردووە.

بەڵەکی: نەخۆشییەکی پێستە.

بهِق الرجل في أواخر عمره.

لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا، پیاوەکە توشی بەڵەکی بوو.

1024. (رقَّاص) سەماکار، کۆکەی (رقاقیص)[2450]

(حمَّصَ) برژان، چاوگەکەی (تحمیص)[2451]

1025. (خَرْج) خەرجییە، هەمیش بەرهەمە[2452]

"پێشنوێژیکرد"ە ماناکەی (أَمَّ)ە[2453]

1026. (خُرْج) جەواڵە، کۆکەی (خِرَجَة)[2454]

(رونکردەوە)یە مانای (خرَّجَ)[2455]

1027. (خَرَّج) چیە؟ واتە راڤەکرد[2456]

---

[2449] لا تخجل من قول الحقيقة.

لە وتنی راستی شەرم مەکە.

[2450] زوجها رقَّاص شهير.

مێردەکەی سەماکارێکی بەناوبانگە.

[2451] برژان= برژاند.

حمَّص اللّحمَ على النار.

گۆشتەکەی لەسەر ئاگر برژاند.

[2452] وازن بين دَخْله وخَرْجه حتى لا يضطر للاقتراض.

هاوسەنگی دروستکرد لەنێوان داهات و خەرجییەکانیدا، بۆ ئەوەی ناچار نەبێت قەرزبکات.

كان خَرْج البُستان قليلاً.

باخەکە بەرهەمی کەم بوو.

[2453] أمَّ بالناس رغم صغر سنّه.

سەرباری کەمیی تەمەنی، پێشنوێژیکرد بۆ خەڵکەکە.

[2454] هەروەها بە (أَخْراج)و (خِراج)یش کۆدەکرێتەوە.

جەواڵ: تورەکە یان دەفرێکی دروستکراوە لەپێستەو هاوشێوەکانی و لەدوولای یەکسان پێکدێت و لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێت بۆ هەڵگرتنی کەلوپەل.

وضع أمتعتَه في الخُرْج.

کەلوپەلەکەی خستەناو جەواڵەکەوە.

[2455] خرَّجَ المسألةَ للحاضرين.

پرسەکەی بۆ ئامادەبوان رونکردەوە.

[2456] خَرَّج الرُّؤيا بعد مراجعته للكتب المتعلّقة بتفسير الأحلام.

(أخرجَ) دەرهێنا، هەروەها دەرکرد[2457]

**1028.** (حَمْوُ) گەرمییە، هەروەها خەزور[2458]

(قَبْر) واتە گۆڕ، جەمعەکەی (قُبور)[2459]

**1029.** (حقَنَ) چیە؟ دەرزیلێدا[2460]

---

پاش گەڕانەوە بۆ کتێبە پەیوەندیدارەکان بە لێکدانەوەی خەو، خەوەکەی راڤەکرد.

2457 أخرج بطاقتَه من جيبه.

ناسنامەکەی لەگیرفانی دەرهێنا.

أخرجَ المدرس الطالب من الصف.

مامۆستاکە خوێندکارەکەی لەپۆلەکە دەرکرد.

2458 جمع أَحْماء

المريض لا يتحمل حَمْوُ الشَّمْس.

نەخۆشەکە بەرگەی گەرمای خۆر ناگرێت.

زوجته غير جميلة ولكن حَمُوه مسؤول كبير في الحزب.

ژنەکەی جوان نیە، بەڵام خەزوری بەرپرسێکی گەورەیە لەحزبدا.

2459 زيارة القبر في الليل شيء مخيف.

سەردانی گۆڕ لەشەودا شتێکی ترسناکە.

مكان قبر الحسين مجهول.

شوێنی گۆڕی حوسەین نەزانراوە.

بطن الْمَرْأَة في المنام قبر لِأَنَّهَا تحوي أجنَّة وهم كالموتى وَمن دخل فِي بطن امْرَأَة خشِي عَلَيْهِ الْمَوْت.

سکی ژن لەخەودا راڤەکەی گۆڕە، چونکە سکی ژن کۆرپەی تێدایە کە وەك مردوو وایە. ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی چووەناو سکی ژنێکەوە، ئەوە مەترسیی مردنی لێدەکرێت.

زر القبور تذكرك الآخرة.

سەردانی گۆڕ بکەن، چونکە رۆژی دواییتان بیردەهێنێتەوە.

القبر لا يفرق بين غني وفقير.

گۆڕ جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەندو هەژاردا ناکات.

القبر ليس نهاية الحياة، بل هو بداية لحياة أبدية.

گۆڕ کۆتایی ژیان نیە، بەڵکو سەرەتای ژیانێکی هەتاهەتاییە.

2460 حقَن الطّبيبُ المريضَ.

پزیشکەکە دەرزی لەنەخۆشەکە دا.

(زادَهُ) واتە توێشوی پێدا[2461]

**1030.** (نظَرَ) چیه؟ پێشبینیکرد[2462]

هەم چاوەڕێکرد لەگەڵ سەیرکرد[2463]

**1031.** (طلَبَ یدَها) ئەی خوازبێنیکرد[2464]

وشەی (ودَّعَ) مانای بەڕێکرد[2465]

**1032.** (قَصْر) واتە کۆشك[2466]، (قَلْعَة) قەڵایە[2467]

---

[2461] أكرم الضيف وزاده لرحلته.

ریزی لەمیوانەکە گرت و توێشوی پێدا بۆ گەشتەکەی.

[2462] نظَر هطول أمطار غزيرة في الأسبوع التالي.

پشبینی بارانی بەخوڕی کرد لەهەفتەی داهاتودا.

[2463] واتە هەمان وشە بەمانای "چاوەڕێکرد"و "سەیرکرد"

نظَر حلولَ الشتاء ليشتري معطفًا.

چاوەڕێی هاتنی زستانی کرد بۆ ئەوەی قەمسەڵەیەك بکڕێت.

نظَر إلى الأولاد يلعبون.

سەیری منداڵەکانی کرد کە یارییان دەکرد.

[2464] بعد صداقة قصيرة المدى، طلب يدها.

پاش هاوڕێیەتیکردنێکی کورتخایەن، خوازبێنیکرد.

[2465] ودَّعه جميعُ أسرته.

تەواوی خێزانەکەی، بەڕێیانکرد.

[2466] ج: قُصُور

عندي قصر في ضواحي المدينة.

کۆشکێکم هەیە لەدەوروبەری شار.

[2467] ج: قَلَعات وقَلْعات وقِلاع وقُلُوع.

هەروەها (حصن)یش بە مانای قەڵا دێت.

إقترب الأعداء من حصننا.

دوژمنان لەقەڵاکەمان نزیکبونەوە.

في النهاية إستطاع العدو إحتلال القلعة.

لەکۆتاییدا دوژمن توانی قەڵاکە داگیربکات.

(نِسْبَة) ڕێژەیە[2468]، (مُطلَق) ڕەهایە[2469]

**1033.** (طَلْق) بەمانای ژانی منداڵبون[2470]

(حِصْن) قەڵایە، جەمعەکەی (حُصون)[2471]

**1034.** (ربَّعَ) واتە کرد بە چوارگۆشە[2472]

(طَلْقُ المُحَيّا) مانای ڕوخۆشە[2473]

**1035.** (طَلْقُ اليدين)ە واتە بەخشندە[2474]

(طوَى عُمْرَه) "لەناویبرد"ە[2475]

---

[2468] ج: نِسْبات، نِسَب

بلغت نسبةُ النجاح الثلثين.

ڕێژەی دەرچون گەیشتە دوو لەسەر سێ.

[2469] كان الرئيس السابق يتمتّع بسلطةٍ مطلقة.

سەرۆکی پێشوو دەسەڵاتێکی ڕەهای هەبوو.

[2470] جاءها الطّلْق بعد منتصف الليل.

دوای نیوەشەو ژانی منداڵبونی بۆ هات.

[2471] هەروەها (قَلْعَة)ش بەمانای قەڵا دێت.

إقترب الأعداء من حصننا.

دوژمنان لەقەڵاکەمان نزیکبونەوە.

في النهاية إستطاع العدو إحتلال القلعة.

لەکۆتاییدا دوژمن توانی قەڵاکە داگیربکات.

[2472] ربَّعَ الشكل الهندسي بحركة واحدة.

بە یەك جوڵە شێوە ئەندازەییەکەی کرد بە چوارگۆشە.

[2473] المدير الجديد رجل طَلْقُ المُحَيّا.

بەڕێوەبەرە نوێیەکە پیاوێکی ڕوخۆشە.

[2474] بەخشندە= دەستکراوە.

التاجر طَلْقُ اليدين في كلّ المجالات الخيريّة.

بازرگانەکە بەخشندەیە لەهەموو بوارە خێرخوازییەکاندا.

[2475] لەناویبرد= مراند.

طوَى الله عُمْرَ الظالم.

خودا ستەمکارەکەی لەناوبرد.

**1036.** (طلَّقَ) تەڵاقدا، دەستبەرداری بوو[2476]

(انطلقَ)یە ئەی بەرەڵابوو[2477]

**1037.** (هَصور)و (أَسَد) هەردوو مانای شێر[2478]

---

[2476] دەستبەرداری بوو= وازیلێهێنا.

طلَّق زوجتَه بعد اكتشاف خيانتها.

پاش ئاشكرابونی ناپاكيی ژنەكەی، تەڵاقيدا.

طلَّق عشيرته بعد ارتكابه جريمة قتل.

پاش ئەنجامدانی تاوانێكی كوشتن دەستبەرداری هۆزەكەی بوو.

[2477] انطلق العصفورُ بعد مرور أربعة أشهر في القفص.

پاش تێپەڕبونی چوار مانگ لەقەفەزدا، چۆلەكەكە بەرەڵابوو.

[2478] جمع هصور: هواصِرُ وهواصِيرُ.

إنه مقاتل شجاع كالهَصور.

بەڕاستی ئەو جەنگاوەرێكی ئازایە وەك شێر.

ج أسد: آساد وأُسْد وأُسُد وأُسُود، مؤ أَسَدة.

أسد الصحراء لقب عمر المختار.

شێری بيابان نازناوی عومەر موختارە.

الأسد لا يأكل العُشْب، حتى لو جاع.

شێر گژوگيا ناخوات، تەنانەت ئەگەر برسيشی بێت.

إذا غاب الأسد لعبت القرود.

كە شێر ديارنەما، مەيمون ياريدەكات.

الأسد يبقى أسداً حتى لو كان جريحاً.

شێر هەر شێرە ئەگەرچی برينداريش بێت.

إذا زأر الأسد صمتت جميع الحيوانات.

كە شێر نەڕاندی سەرجەم ئاژەڵەكان بێدەنگ دەبن.

الأسد لا ينشغل بآراء الغنم.

شێر بە بۆچونی مەڕو بزن سەرقاڵ نابێت.

ليس كل من زأر أسدًا.

هەر شتێك بنەڕنێنێت شێر نيە.

الأسد يبقى أسدًا ولو صار في قفص.

(مؤنَّث) مێیە، (مُذَكَّر)یش نێر[2479]

**[1038.](#)** (قَرار) بڕیارە[2480]، (مَحْكَمة) دادگا[2481]

---

شێر لەقەفەزیشدا هەر شێرە.

[2479] ئەم دوو وشەیە زیاتر لەڕێزماندا بەکاردەهێنرێن.

قل لي، (نار) كلمة مؤنثة أم مذكرة؟

پێم بڵێ وشەی (نار) مێیە یان نێرە؟

كلمة (كتاب) في اللغة العربية مذكرة.

وشەی (کتاب) لەزمانی عەرەبیدا نێرە.

[2480] جمع قرارات.

لا يمكنك تغييرَ المستقبل دون اتخاذ قرار في الحاضر.

بەبێ بڕیاردان لەئێستادا، ناتوانیت داهاتوو بگۆڕیت.

من لا يتخذ قراراً، اتخذ الزمن قراراً عنه.

هەر کەسێك بڕیارێك نەدات، زەمانە بڕیارێکی بۆ دەدات.

كل قرار خاطئ هو درس جديد.

هەموو بڕیارێکی هەڵە، وانەیەکی نوێیە.

أنا لا أعترف بقرار الأخير للمحكمة وأطالب بالتمييز.

دان بە بڕیاری کۆتایی دادگادا نانێم و داوای تێهەڵچونەوە دەکەم.

[2481]جمع مَحْكمات ومحاكِم.

لو كانت محكمة الأحلام موجودة، لرفعت دعوى على من يوقظني كل صباح.

ئەگەر دادگای خەو هەبوایە، سکاڵام لەسەر ئەو کەسە بەرزدەکردەوە کە هەموو بەیانییە خەبەرم دەکاتەوە.

في محكمة الزوجة، الرجل دائماً مذنب حتى يثبت عكس ذلك... وبعدها يظل مذنباً!

لەدادگای ژندا، پیاو هەمیشە تاوانبارە تا ئەو کاتەی پێچەوانەکەی دەسەلمێنێت، دوای ئەوەش هەر بە تاوانباری دەمێنێتەوە!

في محكمة الضمير، لا حاجة إلى شهود.

دادگای ویژدان پێویستی بە شایەتحاڵ نیە.

لو كانت محكمة الضمير تعمل دائماً، لما بقي أحدٌ خارج السجن!

ئەگەر دادگای ویژدان هەمیشە لەکاردا بوایە، هیچ کەسێك لەدەرەوەی زیندان نەدەمایەوە!

دخلت محكمة الحياة لأطلب العدالة، فاكتشفت أن القاضي مشغول بمتابعة شبكات التواصل الإجتماعی!

چومە ناو دادگای ژیان بۆ داواکردنی دادوەری، کەچی بۆمدەرکەوت دادوەر بە فۆڵەوکردنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە سەرقاڵە!

الأعمال هي المحامي في محكمة التاريخ.

لەدادگای مێژودا، کردەوە پارێزەرە.

(أَخ) لەگەڵ (شَقيق) هەردوكيان برا[2482]

**1039.** (قَذِرْ)و (نَجِسْ) پێچەوانەی پاك[2483]

(قلانِيس) كڵاو، بەڵام كۆ نەك تاك[2484]

**1040.** (عِرْبِد)و (أَفْعَى)، (ثُعْبان)، (حَيَّة)، مار[2485]

---

حكمت عليه المحكمة حكماً بالإعدام.

دادگای بڕیاری لەسێدارەدانی بەسەردا دا.

[2482] هەردوكيان بەمانای برا دێن، بەڵام دووەميان پێويستە لەدايك و باوكيشەوە برا بن نەك تەنها لەيەكێكيانەوە.

أخي هو من يحبني بلا شروط، لكن بشرط أن أقرضه المال عند الحاجة!

براكەم ئەو كەسەيە كە بەبێ مەرج خۆشيدەوێم، بەڵام بەو مەرجەی قەرزی پێبدەم لەكاتی پێويستيدا!

لي أخ أكبر مني و أذكى.

برايەكم هەيە كە لە من گەورەترو زيرەكترە.

شقيق مَلك السعودية، أُبعدَ عن السلطة.

برای پادشای سعوديە، لەدەسەڵات دورخرايەوە.

[2483] واتە بەمانای پيس دێت.

لا أستطيع العيش في هذا البيت القذر.

ناتوانم لەم ماڵە پيسەدا بژيم.

مكتبك نجس جدّاً.

نوسينگەكەت زۆر پيسە.

[2484] تاكەكەی (قَلَنْسُوَة)يە. هەروەها بە (قلاسٍ)و (قلاسيّ)و (قلانِس)يش كۆدەكرێتەوە.

الْمَرْأَة الأيّم إِذا رَأتْ في المنام على رَأسهَا قَلَنْسُوَة فَإِنَّهَا تتزَوَّج وَكَذَلِكَ الْبكر.

ئەگەر بێوەژنێك يان كچێك لەخەودا بينی كڵاوێك لەسەريدايە، ئەوە شودەكات.

ارتدى الرجل القَلَنْسُوَة لحماية رأسه من الشمس.

پياوەكە كڵاوەكەی كردەسەری بۆ ئەوەی سەری لەخۆر بپارێزێت.

[2485] هەرچواريان بەمانای مار دێن. (أَفْعَى) بەمانای مارێك دێت كە ژەهراوی بێت، (ثُعْبان)يش بەمانای ماری گەورەو زەبەلاح دێت، بەڵام دوانەكەی تر بەمانای مار دێن بەگشتی. بێگومان وشەی (حيّة) وەك موئەنەسی (حيّ)يش بەكاردەهێنرێت، واتە سەرباری مانای مار، مانای (زيندوی مێ)ش دەدات.

رأيت عربداً داخل الغرفة.

مارێكم لەناو ژورەكەدا بينی.

لدغته أفعى، لذا مات في الحال.

(سامّ) ژەهراوییە[2486]، (سُمّ) بەمانای ژار[2487]

**1041.** (خَطَرْ) مەترسی[2488]، (خَطِيرْ) ترسناك[2489]

(طاهِرْ)و (نَظيفْ) هەردوو مانای پاك[2490]

**1042.** (مَثَانة) چیە؟ مانای میزەڵدان[2491]

---

مارێك پێوەیدا، بۆیە یەكسە مرد.

من لاعب الثعبان في وكره، لا يأمن من لسعه.

ئەوەی یاری لەگەڵ ماردا بكات لەهێلانەكەی، لەپێوەدانی مارەكە پارێزراو نابێت.

الحيّة خطيرة، فلا تقترب منها.

مارەكە مەترسیدارە، بۆیە لێی نزیك مەبەرەوە.

2486 جمع سَوامّ

لا تلمس تلك الأفعى السامّة.

دەست لەو مارە ژەهراوییە مەدە.

2487جمع سُموم. ژار= ژەهر.

وضع له السُّمَّ في العصير.

ژەهری بۆ كردە ناو خۆشاوەكەوە.

2488 جمع أخطار.

خطر العدو على الإقتصاد كبير.

مەترسیی دوژمن لەسەر ئابوری، گەورەیە.

2489 جمع خُطُر.

الدبّ حيوان خَطير.

ورچ گیاندارێكی ترسناكە.

2490 وجود الماءِ الطاهر في المنطقة نادر.

بونی ئاوی پاك لەناوچەكەدا دەگمەنە.

غرفتك غير نظيفة.

ژورەكەت پاك نیە.

2491 جمع مَثَانات ومَثائِن

يعاني من التهاب بالمثانة.

بەدەست هەوكردنی میزەڵدانەوە دەناڵێنێت.

المثانة عند الإنسان البالغ تستطيع تخزين ما بين 400 إلى 600 مل من البول قبل أن تشعر بالحاجة للتبول، ولكن يمكنها التمدد لاستيعاب كمية أكبر إذا لزم الأمر.

(لِسان)و (لُغَة) هەردوکیان زمان[2492]

**1043.** (مُحامي) چیە؟ واتە پارێزەر[2493]

(قَین) لەگەڵ (حَدَّاد) هەردوو ئاسنگەر[2494]

---

میزەڵدانی مرۆڤی پێگەیشتوو لەتوانایدایە بڕی 400 بۆ 600 میللیلیتر میز بگرێت، دوای ئەوە هەستدەکەیت کە پێویستە میزبکەیت.

سەرباری ئەوەش دەکرێت میزەڵدان لەکاتی پێویستدا بکشێت و بڕێکی زیاتر میز بگرێت.

[2492] یەکەمیان بەمانای زمانی ناودەم و زمانی قسەکردنیش دێت، بەڵام دووەمیان تەنها بەمانای زمانی قسەکردن دێت.

جمع لسان: ألسُن وألْسِنة ولُسْن ولُسُن

إعقل لسانك و لا تتكلم كثيراً.

زمانت بگرەو زۆر قسە مەکە.

شكل لسانه غريب جداً.

شێوەی زمانی زۆر سەیرە.

جمع لغة: لُغات ولُغًى

يجب عليك تعلّم اللغة العربية لأنها لغة القرآن الكريم.

پێویستە فێری زمانی عەرەبی ببیت، لەبەرئەوەی زمانی قورئانی پیرۆزە.

اللغة الليكينية هي واحدة من أصغر اللغات في العالم، حيث تتكون من ما يقارب 100 كلمة.

زمانی لیکینی یەکێکە لەبچوکترین زمانەکان لەجیهاندا. ئەم زمانە لەنزیکەی 100 وشە پێکهاتووە.

تُعد اللغة العربية من أكثر اللغات انتشارًا في العالم، حيث يتحدثها أكثر من 467 مليون شخص.

زمانی عەرەبی یەکێکە لەبەربڵاوترین زمانەکان لەجیهاندا. زیاتر لە 467 ملیۆن کەس قسەی پێدەکەن.

[2493] إستطاع المحامي أن يكسب القضية.

پارێزەرەکە توانی کەیسەکە بباتەوە.

العدالة هي غاية المحامي، ولكنها ليست دائمًا غاية موكله.

دادوەری ئامانجی پارێزەرە بەڵام هەموو کات ئامانجی بریکارەکەی نیە.

المحامي الجيد يعرف القانون، أما المحامي العظيم فيعرف القاضي.

پارێزەری باش یاسا دەزانێت، بەڵام پارێزەری مەزن دادوەر دەناسێت.

[2494] القَيْن رجل مسنّ.

ئاسنگەرەکە پیاوێکی بەساڵاچوو بوو.

كان أبي حَدَّاداً ماهراً.

باوکم ئاسنگەرێکی کارامە بوو.

الحداد لا يخاف النار.

ئاسنگەر لەئاگر ناترسێت.

**1044.** (مَثّال) پەیکەرتاش[2495]، (نَجّار) دارتاشە[2496]

(وَبَشْ) خوێڕییە، کۆکەی (أَوباش)ە[2497]

**1045.** (لَوْز) چوالەیە، هەروەها بادەم[2498]

---

الحداد يصنع السيوف، لكن لا يخوض المعارك.

ئاسنگەر شمشێر دروستدەکات بەڵام ناچێتە شەڕەوە.

الحداد الجيد لا يلوم مطرقته.

ئاسنگەری باش سەرزەنشتی چەکوشەکەی ناکات.

لا يُصبح الحديد سيفًا إلا بيد حداد ماهر.

ئاسن بە دەستی ئاسنگەرێکی کارامەوە نەبێت، نابێتە شمشێر.

2495 صنع المثَّالُ تمثالاً لشاعرٍ كبير.

پەیکەرتاشەکە پەیکەرێکی بۆ شاعیرێکی گەورە دروستکرد.

كل حجر يحمل داخله تمثالًا، والمثَّال فقط هو من يستطيع كشفه.

هەموو بەردێك پەیکەرێکی لەناخدا هەڵگرتووە، بەڵام تەنها پەیکەرتاش دەتوانێت بیدۆزێتەوە.

كل مثَّال يترك في عمله قطعة من قلبه.

هەموو پەیکەرتاشێك پارچەیەك لەدڵی لەکارەکەیدا جێدەهێڵێت.

2496 النَجّار يصنع من الخشب أشياء جميلة.

دارتاش شتی جوان لەتەختە دروستدەکات.

النجار الماهر لا يترك مسمارًا بارزًا.

دارتاشی لێهاتوو نایەڵێت هیچ بزمارێك دیاربێت.

لا تذهب إلى النجار لصنع سيف.

بۆ دروستکردنی شمشێر مەڕۆ بۆ لای دارتاش.

2497 هو وبش كاذب، لا تثق به.

ئەو خوێڕییەکی درۆزنە، باوەڕی پێمەکە.

2498 مفرد لَوْزَة

من رأى في المنام أنه يتسلق شجرة اللوز، فقد يدل ذلك أن الرائي يعتمد على والديه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی بە درەختێکی چوالەدا هەڵدەگەڕێت، ئەوە ڕەنگە ئاماژەبێت بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە پشت بە دایکوباکی دەبەستێت.

اللوز يساعد في الحفاظ على مستويات مناسبة من الكوليسترول في الدم.

بادەم یارمەتیدەرە لەپاراستنی ئاستی گونجاو لەکۆلیسترۆڵ لەناو خوێندا.

(أُمَّة) نەتەوە، جەمعەکەی (أُمَم)[2499]

**1046.** (بَلّوعة) گونجە، کۆکەی (بلاليع)[2500]
(وَزَّعَ) دابەشکرد، چاوگەکەی (توزيع)[2501]

**1047.** (جَصّ)و (جِبْس) گەچ[2502]، (أَسمَنْت) چیمەنتۆ[2503]
(قَرَابَى) خزم، بەڵام تاك نا کۆ[2504]

---

[2499] لم تستطع الأمَّة الكرديّة تحرير كافّة مناطقها.

نەتەوەی کورد نەیتوانی سەرجەم ناوچەکانی ئازادبکات.

الأمم العظيمة لا تُبنى إلا بالتضحية والعمل.

نەتەوەی مەزن بە قوربانیدان و کارکردن نەبێت، بنیات نانرێت.

إذا أردت أن تدمر أمة، فابدأ بتدمير تعليمها.

ئەگەر ویستت نەتەوەیەك وێرانبکەیت، بە وێرانکردنی کەرتی فێرکردن دەستپێبکە.

الأمم تُقاس برقي أخلاقها لا بقوتها العسكرية.

نەتەوە بە بەرزیی رەوشت پێوانەدەکرێت نەك بە هێزی سەربازی.

ضعف الأمة يبدأ عندما تفقد ثقتها بنفسها.

لاوازی نەتەوە ئەو کاتە دەستپێدەکات کە متمانەبەخۆکردن لەدەستدەدات.

أمة بلا تاريخ، كإنسان بلا ذاكرة.

نەتەوەی بێمێژوو وەك مرۆڤی بێیادگا وایە.

[2500] هەروەها بە (بَلّوعات)یش کۆدەکرێتەوە.

گونج: گونجی ئاوەڕۆو زێراب.

لا تجلس على البَلّوعة.

لەسەر گونجەکە دامەنیشە.

[2501] وَزَّعَ يوزِّع، تَوْزيعًا، فهو مُوزِّع، والمفعول مُوزَّع.

وزَّعَ الصَّحيفةَ على القراء مجاناً.

رۆژنامەکە بەبێ بەرامبەر بەسەر خوێنەرەکاندا دابەشکرد.

[2502] يستخدم الجصّ في طلاء البيوت.

گەچ لەڕوپۆشکردنی ماڵدا بەکاردەهێنرێت.

صنع الفنان تمثالاً من الجبس.

هونەرمەندە پەیکەرێکی لەگەچ دروستکرد.

[2503] يستعمل الأسمنت في البناء.

چیمەنتۆ لەبیناسازیدا بەکاردەهێنرێت.

**1048.** (شَراب) خواردنەوە[2505]، (طَعام)ە خۆراك[2506]
(أُدُم) پێخۆرە، بەڵام كۆ نەك تاك[2507]

**1049.** (أشيَم) خاڵاوی[2508]، (شامَة) واتە خاڵ[2509]
(دارْ) لەگەڵ (مَنزِل) هەردوو مانای ماڵ[2510]

---

[2504] تاكەكەی (قريب)ە. هەروەها بە (قريبون)و (أقْرباء)يش كۆدەكرێتەوە.

ليس لديّ قريب في المنطقة.

هيچ خزمێكم نيە لەناوچەكەدا .

[2505] جمع أَشرِبة

بەمانای خواردنەوە دێت، بەمانای هەر شلەیەك كە بخورێتەوە بە ئاوو ساردی و بیرەو عارەقیشەوە!

الجوّ حارّ هل عندك أيّ شراب بارد؟

كەشو هەوا گەرمە، هيچ خواردنەوەيەكی ساردت لایە؟

[2506]جمع أطْعِمة

خۆراك= خواردن.

طعام يدها لذيذ.

خۆراكی دەستی بەچێژە.

[2507] تاكەكەی (إدام)ە.

هل عندك أيّ إدام، أم لابدّ أن نأكل الخبز مع الماء فقط؟

هيچ پێخۆرێكت لایە، يان دەبێت نانەكە تەنها بە ئاوەوە بخۆين؟

[2508] جمع شِيَم، مؤ شَيْماءُ، جمع مؤ شيماوات وشِيَم.

خاڵاوی= خاڵدار.

هو شابّ أشيم.

ئەو گەنجێكی خاڵاوییە. واتە خاڵی زۆر بەجەستەیەوە هەیە.

2509 جمع شامات وشام.

في وجهها شامة كبيرة.

دەموچاوی خاڵێكی گەورەی پێوەیە.

[2510] لەم مانایەدا موراديفن.

داري قريب من مكتبي.

ماڵەكەم لەنوسینگەكەمەوە نزيكە.

هل المسجد قريب من بيتك؟

ئایا مزگەوتەكە لەماڵەكەتەوە نزيكە.

خصصت غرفة كاملة من منزلي للكتب.

**1050.** (بَیت) ماڵ و بەیتە، مانەوەو مزگەوت[2511]
(اِضطَجَعَ)یە بەمانای پاڵکەوت[2512]
**1051.** (أَقْلَف) چیە؟ (خەتەنەنەکراو)ە[2513]
(رَدَحْ)و (فَتْرە) هەردوکیان (ماوە)[2514]
**1052.** (سِکّین) چەقۆیە2515، (سَیف) مانای شیرە[2516]

---

ژورێکی تەواوی ماڵەکەم تەرخانکردووە بۆ کتێب.

[2511] بەمانای ماڵ و بەیت (ی شیعر)و مانەوە (بۆ شەو لەماڵ یان شوێن)و مزگەوت دێت. لەمانای سێیەمیاندا چاوگی (بات)یە.

عندما تصبح المكتبة في البيت ضرورة كالطاولة و السرير و الكرسي و المطبخ ، عندئذ يمكن القول بأننا أصبحنا أمة متقدمة.

کاتێك کتێبخانە لەماڵدا دەبێتە شتێکی پێویستی وەك مێزو جێگەی خەوتن و کورسی و چێشتخانە، ئەوکاتە دەتوانرێت بوترێت بوینەتە نەتەوەیەکی پێشکەوتوو.

بيتي قريب من المسجد.

ماڵەکەم لەمزگەوتەوە نزیکە.

تتألف القصيدة من عشرين بيتاً.

قەسیدەکە لە بیست بەیت پێکدێت.

لام الوالد إبنه على بيته في بيت صديقه.

باوکەکە سەرزەنشتی کوڕەکەی کرد لەسەر مانەوەی لەماڵی هاوڕێکەی.

صليت في بيت قريب من السوق.

لەمزگەوتێکی نزیك بازاڕەکە نوێژمکرد.

[2512] اضطجع الوالد في فِراشِه.

باوکەکە لەجێگەی خەوتنەکەیدا پاڵکەوت.

[2513] هل صلاة الأقلف جائزة؟

ئایا نوێژی خەتەنەنەکراو دروستە؟

[2514] (فَتْرة) بەمانای ماوە دێن بەگشتی، بەڵام (رَدَحْ) بەمانای ماوەی زۆر دێت. هەروەها (مدّة)ش بەمانای ماوە دێت.

أَقامَ رَدَحًا من الدهر في المدينة.

ماوەیەکی زۆر لەشارەکە نیشتەجێبوو.

استمرّ الاجتماعُ فترة قصيرة.

کۆبونەوەکە ماوەیەکی کەم بەردەوامبوو.

سافر لمدّة شهر.

بۆ ماوەی مانگێك گەشتیکرد.

[2515] جمع سَكاكينُ

دەتوانرێت وەك نێرو مێش بەکاربهێنرێت.

(سَهمْ) واته پشك، هەروەها (تیر)ە[2517]

**1053.** (ضِلْع) پەراسوو[2518]، (إبْط) بنباڵە[2519]

(مالِح) واته سوێر[2520]، (مُرّ) ماناى تاڵە[2521]

**1054.** (دَولـيّ) چيه؟ نێودەوڵەتییە[2522]

(عِشرون) واته بیست[2523]، (ثَلاثون) سییە[2524]

---

ضربه بسِكِّين في بطنه.

به چەقۆيەك داى له سكى.

[2516] جمع أسياف وسُيوف.

شير= شمشێر.

لا يجتمع سيفان في غِمد.

دوو شمشێر لەيەك كێلاندا كۆنابنەوە.

[2517] جمع أسْهُم وسُهوم.

ئەگەر بەماناى تیر بەكاربهێنرێت، ئەوا به (سِهام)يش كۆدەكرێتەوە.

عندي سهم في الشركة.

لەكۆمپانياكەدا پشكێكم هەيە.

هل تستطيع إستخدام السَّهْم في الحرب.

ئايا دەتوانيت تير لەجەنگدا بەكاربهێنيت؟

[2518]هەروەها به سێپڵى (ضِلَع)يش دەنوسرێت. ئەم وشەيه دەتوانرێت وەك نێرو مێش بەكاربهێنرێت.

جمع أضلاع وأضلُع وضُلُوع.

كسر ضِلْعَه.

پەراسووى شكاند.

[2519]هەروەها به (إبِط)يش دەنوسرێت.

جمع آباط

ريحة إبطك تقتل الكلب.

بۆنى بنباڵت سەگ دەتۆپێنێت.

[2520]الماء المالح لايصلح للشرب.

ئاوى سوێر بۆ خواردنەوە ناشێت.

[2521]القهوة مرّة ولكن رغم ذلك الكثير من الناس يشربونها.

قاوە تاڵە، بەڵام سەربارى ئەوەش زۆرێك لەخەڵك دەيخۆنەوە.

[2522]المجتمع الدولـيّ ساكت عن مجازر فلسطين.

كۆمەڵگەى نێودەوڵەتى لەكۆمەڵكوژييەكانى فەلەستين بێدەنگە.

1055. (إثنان) واتە دوو[2525]، (واحِد) مانای یەك[2526]
(أربَعة) چوارە[2527]، (رُبْع)یش چواریەك[2528]
1056. (عامْ) لەگەڵ (سَنة) هەردوكیان ساڵە[2529]

---

[2523] عِنْدِي عِشْرُونَ الف دينار فقط.

تەنها بیست هەزار دینارم پێیە.

[2524] هاجمنى ثلاثون رجلاً.

سی پیاو پەلاماریاندام.

[2525]المؤنث اثْنَتَانِ و ثِنْتان

ضرب الطفل رجلان إثنان.

دوو پیاو لەمنداڵەكەیان دا.

[2526] رجل واحد كافٍ لإمرأة عفيفة.

یەك پیاو بەسە بۆ ژنێكی داوێنپاك.

[2527] في السنة أربعةُ فصولٍ.

ساڵ چوار وەرزی تێدایە.

نجم البحر له أربعة أنوف.

ئەستێرەی دەریا چوار لوتی هەیە.

[2528]هەروەها بە سپێڵی (رُبُع)یش دەنوسرێت. چواریەك= چارەك.

جمع أَرباع

انتظرتك رُبْع ساعة خارج القاعة.

چارەكە سەعاتێك چاوەڕێم كردی لەدەرەوەی هۆڵەكە.

[2529] أمضيت عاماً كاملاً في المدن الأوروبية.

ساڵێكی تەواوم لەشارە ئەوروپییەكان بەسەربرد.

في العام 1816، حدث ثوران بركاني هائل في إندونسيا أدى إلى حجب أشعة الشمس، مما أدى إلى انخفاض درجات الحرارة بشكل كبير في جميع أنحاء العالم. سمي هذا العام بـ "عام بدون صيف".

لەساڵی 1816 هەڵچونێكی گڕكانی گەورە لە ئیندۆنوسیا رویداو بووەهۆی داپۆشینی تیشكی خۆرو ئەمەش بووەهۆی ئەوەی پلەی گەرما بەشێوەیەكی زۆر لەسەرتاسەری جیهاندا دابەزێت. ئەو ساڵە ناونرا ساڵی بێهاوین.

في العام 2008، تم اكتشاف نوع جديد من الفئران في إندونيسيا يبلغ طوله 48 سم.

لەساڵی 2008، لەو ئیندۆنوسیایەی لای خۆمان، جۆرە مشكێك دۆزرایەوە كە درێژییەكەی 48 سانتیمەترە، واتە نزیكەی نیو مەتری ناسك.

لا تنتظر عامًا جديدًا، ابدأ عامًا جديدًا. جين كيربي

چاوەڕێی ساڵێكی نوێ مەكە. ساڵێكی نوێ دەستپێبكە.

# (أُمّ) ماناى دايك[2530]، (طِفل)يش منالّە[2531]

لا يمكننا تغيير الماضي، لكن يمكننا تغيير العام القادم. توني موريسون

ناتوانين رابردوو بگۆڕین، بەڵام دەتوانین ساڵی داهاتوو بگۆڕین.

لا تنتظر أن يتغير شيء بحلول العام 2025، لأن المشكلة ليست في رأس السنة بل في رأس فخامة حضرتك!

چاوەڕێ مەکە بە هاتنی ساڵی 2025 هیچ شتێك بگۆڕێت، چونکە کێشەکە لەسەری ساڵدا نیە، بەڵکو لەسەری فەخامەتی جەنابتایە!

ولدت في سنة 1992.

لەساڵی 1992 لەدایکبوم.

[2530] جمع أُمَّات وأمّهات

أمي إمرأة مسنّة.

دایکم ژنێکی بەساڵاچووە.

ميخائيل نعيمة: الأم هي المدرسة الأولى، والكتاب الأول، والدرس الأول، والأستاذ الأول.

دایك یەکەم خوێندنگەیە، یەکەم کتێبە، یەکەم وانەیەو یەکەم مامۆستاشە.

نزار قباني: الأم هي أجمل قصيدة، وأعذب لحن، وأروع لوحة فنية.

دایك جوانترین چامەیە، شیرینترین ئاوازە، نایابترین تابلۆی هونەرییە.

الإمام علي بن أبي طالب: الجنة تحت أقدام الأمهات.

بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە.

ما هي السورة التي تُسمى "أمّ القرآن"؟

کام سورەت پێیدەووترێت "دایکی قورئان"؟ فاتیحە

[2531] جمع أطفال

منالّ= منداڵ

بكاء الطفل يزعجني كثيراً.

گریانی منداڵ زۆر بێزارم دەکات.

الإمام علي بن أبي طالب: الطفل أمانة في عنقك، فاحرص على تربيته تربية صالحة.

منداڵ راسپاردەیەکە لەگەردنتدا، بۆیە سوربە لەسەر ئەوەی بە باشی پەروەردەی بکەیت.

أرسطو: الطفل هو صفحة بيضاء، فاكتب عليها ما شئت.

منداڵ لاپەڕەیەکی سپییە، چیت دەوێت لەسەری بنوسە.

يولد الطفل بدون ركبتين.

منداڵ بەبێ ئەژنۆ لەدایکدەبێت.

يولد الطفل بـ 300 عظمة، بينما يمتلك الشخص البالغ 206 عظمة فقط.

منداڵ بە 300 ئێسکەوە لەدایکدەبێت، لەکاتێکدا مرۆڤی پێگەیشتوو تەنها 206ی هەیە.

أظهرت الدراسات أن الطفل يبدأ بالضحك في الرحم، ابتداءً من الأسبوع الـ19 من الحمل.

1057. (عامِل) هۆکاره، لەگەڵ کرێکار[2532]
(مِسْکِین) داماوه، هەروەها هەژار[2533]
1058. (فطَسَ)و (ماتَ) هەردوو مانای مرد[2534]
(اصطناعيّ)یە بەمانای دەستکرد[2535]

---

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە منداڵ لەناو منداڵدانەوە پێکەنینی دەستپێدەکات، بەدیاریکراوی لەهەفتەی 19 هەمی دوگیانبونەوە.

سأل رجل حكيماً: علمني كيف اربي طفلي.

قال الحيكم: كم عمره؟

قال الرجل: سبعة أشهر

قال الحكيم: لقد تأخرت كثيراً، فتربية الأطفال تبدأ باختيار أمّه.

پیاوێك لەدانەیەك دەپرسێت، فێرمکە چۆن منداڵەکەم پەروەردەبکەم.

دانا: تەمەنی چەندە؟

پیاو: حەوت مانگ

دانا: زۆر درەنگە بۆ پەروەردە، پەروەردەکردنی منداڵ لەکاتی هەڵبژاردنی دایکییەوە دەستپێدەکات!

[2532] العامل الإجتماعي له تأثير على تخلّف النساء.

هۆکاری کۆمەڵایەتی کاریگەری هەیە لەسەر دواکەوتنی ژنان.

أحتاج عاملاً نشطاً لمدة أسبوع.

پێویستم بە کرێکارێکی چالاکە بۆ ماوەی هەفتەیەك.

[2533] ج: مَسَاكين

المؤسسة الخيرية وزّعت المواد الغذائية على مساكين المدينة.

دامەزراوە خێرخوازییەکە کەرەستەی خۆراکی بەسەر هەژارانی شارەکە، دابەشکرد.

الرجل مسكين جداً، لا يفرّق بين رئيس الحكومة و رئيس الجمهورية.

پیاوەکە زۆر داماوە، سەرۆکی حکومەت لەسەرۆك کۆمار جیاناکاتەوە.

[2534] فطَسَ يَفطِس، فَطْسًا وفُطوسًا، فهو فاطِس.

مات يَموت، مُتْ، مَوْتًا، فهو مائِت ومَيْت ومَيِّت.

فطَس الرجلُ فجأة.

پیاوەکە کتوپڕ مرد.

الرجل الجبان يموت كلّ يوم مرة واحدة.

پیاوی ترسنۆك هەموو ڕۆژێك جارێك دەمرێت.

مُعظم الناس يَموتون عند الخامسة والعشرين, ويدفنون عند الخامسة والسبعين.

زۆربەی خەڵك لەتەمەنی ٢٥ ساڵیدا دەمرن و لە ٧٥ ساڵیدا دەنێژرێن.

[2535] هو يعيش بقلب اصطناعيّ.

**1059.** (تَفصيل) چيه؟ وردەكارى[2536]
(وَرْدَة) ماناى گوڵ[2537]، (هَدِيَّة) ديارى[2538]
**1060.** (زَهْرة) واتە گوڵ، كۆدوجاى (أزهار)[2539]
خانوبەرەيە، ماناكەى (عَقار)[2540]
**1061.** (أحمَر) واتە سور[2541]، (أزرَق)يش شينە[2542]

---

ئەو بە دڵێكى دەستكرد دەژى.

[2536] ج: تفاصيل

تفصيل الحادثة في المحكمة.

وردەكاريى روداوەكە لەدادگادايە.

[2537] الفتي قدّم وردة حمراء لخطيبته.

گەنجەكگە گوڵێكى سورى پێشكەش بە دەزگيرانەكەى كرد.

[2538] جمع هَدِيّات وهَدايا

هَدِيَّتك أجمل من وجهك!

دياريیەكەت لەدەموچاوت جوانترە!

الهديّة على مقدار مُهديها.

ديارى بەگوێرەى بەهاى ئەو كەسەى دياريیەكە پێشكەشدەكات، نرخى بۆ دادەنرێت (نەك بەهاى خودى دياريیەكە).

لا تنظر إلى الهديّة بل إلى من أهداها.

سەيرى ديارى مەكە. سەيرى ئەو كەسە بكە كە پێشكەشيكردووە.

هدية العدو سمٌ في عسل.

دياريى دوژمن ژەهر ناو هەنگوينە.

[2539] مەخسەوى شەريفم لە"كۆدوجا" بريتيیە لە حەمعى جەمع. بێگومان بە (أزاهير)و (زهور)يش دەبێت بە جەمعى جەمع.

جمع زَهْر، جمع الجمع أزاهير وأزهار وزُهُور.

الجمال بلا أخلاق كزَهْرة بلا أريج.

جوانى بێ رەوشت، وەك گوڵى بێبۆن وايە.

[2540] جمع عقارات

خانوبەرە: هەموو سامانێكى نەگوازراوە.

صادرت الدّولةُ عَقاراتِه.

حكومەت دەستى بەسەر خانوبەرەكانيدا گرت.

[2541] جمع حُمْر، مؤ حمراءُ، جمع مؤ حَمْراوات وحُمْر.

لا أحبذ اللون الأحمر للجدار.

حەزم لەڕەنگى سور نيە بۆ ديوار.

## (بغَضِّ النَّظر) "به چاوپۆشین)ه[2543]

كوكب المريخ يُسمى الكوكب الأحمر. يُطلق هذا الاسم بسبب وجود كمية كبيرة من أكسيد الحديد (الصدأ) على سطحه، مما يمنحه اللون الأحمر.

هەسارەی مەریخ پێیدەووترێت هەسارەی سور. هۆكاری ئەم ناونانە بونی بڕێكی زۆرە لەئۆكسیدی ئاسن (ژەنگ) لەسەر رووەكەی كە بەهۆیەوە رەنگی سوری پێبەخشیوە.

يمتلك الأطفال حديثو الولادة قدرة محدودة على رؤية الألوان، لكن اللون الأحمر غالبًا ما يكون أول لون يمكنهم تمييزه بوضوح.

توانای منداڵانی تازەلەدایكبوو لەڕوی بینینی رەنگەكانەوە، سنوردارە، بەڵام زۆربەی كات یەكەم رەنگ كە ئەو جۆرە منداڵانە دەتوانن بەڕونی جیای بكەنەوە، سورە.

يُعتقد أن اسم البحر الأحمر مستوحى من نوع من الطحالب الحمراء التي تزدهر أحيانًا على سطحه، مما يجعل مياهه تظهر حمراء.

لەو بڕوایەدان هۆكاری ناوی دەریای سور، لەجۆرە قەوزەیەكی سورەوە وەرگیرابێت كە هەندێك جار لەسەر روی ئەم دەریایە گەشەدەكات.

في الثقافة الصينية يُعتبر اللون الأحمر رمزًا للحظ والسعادة والاحتفالات، وهو اللون الرئيسي في حفلات الزفاف والسنة الصينية الجديدة.

لەكلتوری چیندا رەنگی سور بە سیمبولی بەخت و بەختەوەری و ئاهەنگگێڕان دادەنرێت، لەئاهەنگی هاوسەرگیری و ساڵی نوێی چینیشدا، رەنگی سەرەكییە.

اللون الأحمر يُحفز الشهية، لذا غالبًا ما يُستخدم في تصميم شعارات مطاعم الوجبات السريعة مثل ماكدونالدز وبرغر كينغ.

رەنگی سور ئارەزوی خواردن دەكاتەوە، بۆیە زۆرجار لەدیزاینی دروشمی رێستۆرانتی خواردنە خێراكانی وەك ماكدۆناڵدو بێرگەر كینگدا بەكاردەهێنرێت.

[2542] جمع زُرْق، مؤ زَرْقاء، جمع مؤ زَرْقاوات وزُرْق.

أرتديت قميصاً أزرقاً للمقابلة.

كراسێكی شینم لەبەركرد بۆ چاوپێكەوتنەكە.

يوم رأيت سيارة زرقاء جديدة أمام منزل جاري، قلت يا حظهم، ولكنني تذكرت بعد ذلك إنه اشتراها بالقسط!

ئەو رۆژەی ئۆتۆمبێلێكی شینی نوێم لەبەردەم ماڵی دراوسێكەمدا بینی، وتم ئای چەندە بەبەختە، بەڵام دواتر بیرمكەوتەوە كە بە قیست كڕیویەتی!

[2543] بغض النظر عن حجم أحلامك، لا تسمح لأحد أن يقلل من قيمتها.

به چاوپۆشین لەقەبارەی خەونەكانت، رێمەدە هیچ كەسێك لەبەهایان كەمبكاتەوە.

بغض النظر عن عدد المرات التي تفشل فيها، النجاح الحقيقي هو الاستمرار.

به چاوپۆسین لەژمارەی ئەو جارانەی تێیدا شكستدەهێنیت، سەركەوتنی راستەقینە لەبەردەوامبوندایە.

بغض النظر عن مدى صعوبة الحياة، تذكر أن لكل مشكلة حلاً.

به چاوپۆشین لەئاستی قورسیی ژیان، لەبیرت بێت كە هەموو كێشەیەك چارەسەرێكی هەیە.

**.1062** (تغضُّن) چیە؟ واتە چرچبون[2544]

(أهْل) کەسوکار، کۆدوجای (أهلون)[2545]

**.1063** شورەیی چیە؟ واتە (غَضاضة)[2546]

(عَسْكَريّ) سەربازی، هەمیش سەربازە[2547]

**.1064** (دِيك) کەڵەشێرە، کۆکەی (دُيُوك)ە[2548]

---

بغض النظر عن اختلافاتنا، الإنسانية توحدنا.

بە چاوپۆشین لەجیاوازییەکانمان، مرۆڤایەتی یەکماندەخات.

بغض النظر عن المكان الذي تبدأ منه، يمكنك دائمًا خلق بداية جديدة.

بە چاوپۆشین لەو شوێنەی لێوەی دەستپێدەکەیت، هەمیشە دەتوانیت سەرەتایەکی نوێ دروستبکەیت.

بغض النظر عن الظلام الذي يحيط بك، سيأتي يوم يظهر فيه النور.

بە چاوپۆشین لەو تاریکییەی چواردەوری گرتویت، رۆژێك دێت روناکی تێدا دەردەکەوێت.

بغض النظر عن الماضي، المستقبل دائمًا فرصة جديدة.

بە چاوپۆشین لەڕابردوو، داهاتوو هەمیشە هەلێکی نوێیە.

[2544] چاوگی (تغضَّنَ)یە.

هل تخشى من تغضُّن وجهك؟

ئایا لەچرچبونی دەموچاوت دەترسیت؟

[2545] بێگومان مەخسەوی شەریفم لەکۆدوجا بریتییە لەجەمعی جەمع.

وصَل أهلَه الى مسرح الجريمة.

کەسوکارەکەی گەیشتنە شوێنی تاوانەکە.

[2546] جمع غضائضُ

ليس في هذا الفعل أي غَضَاضة.

ئەم کارە هیچ شورەییەکی تێدا نیە.

[2547] الحياة العسكريّة صعبة.

ژیانی سەربازی قورسە.

يعمل العسكريّ لحماية الوطن.

سەرباز لەپێناو پاراستنی نیشتماندا کاردەکات.

[2548] هەروەها بە (أدياك)و (دِيَكَة)ش کۆدەکرێتەوە.

من طبع الدّيك الخيلاءُ وإن كان على مزبلة.

یەکێك لەسروشتەکانی کەڵەشێر لوتبەرزییە ئەگەرچی لەناو زبڵدانیشدا بێت.

کەسێك (غَضيض) بێ کەواتە سوکە[2549]

**1065.** (ضَحِيَّة) چيە؟ واتە قوربانی[2550]

(استعظمَ)يە خۆی بەزلزانی[2551]

**1066.** (حُلْو) لەگەڵ (عَذْب) هەردوکيان شيرين[2552]

(مسجون) زيندانی، کۆکەی (مساجين)[2553]

---

[2549] سوك بەمانای رسوا.

لا تجادله، إنه رجل غَضيض.

مشتومڕی لەگەڵدا مەکە. پياوێکی سوکە.

[2550] جمع ضحايا

{إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ}

کاتێك ئەو دوانە قوربانييان پێشکەشکرد، لەيەکێکيان وەرگيراو لەوی تريان وەرنەگيرا.

وزّع لحومَ ذبيحته على الفقراء.

گۆشتی قوربانييەکەی بەسەر هەژاراندا دابەشکرد.

قدّم ماعزاً ضحيّة بعد أن شُفِيَ من مرضه.

پاش چاکبونەوەی لەنەخۆشييەکەی بزنێکی وەك قوربانی پێشکەشکرد.

[2551] استعظمَ يستعظم، استعظامًا، فهو مُستعظِم.

لن ينال باستعظامه محبَّة الناس.

بە خۆبەزلزانين، خۆشەويستيی خەڵك بەدەستناهێنێت.

[2552] العصير حلو جداً، لا أحبّه.

خۆشاو(شەربەت)ەکە زۆر شيرينە، حەزم لێی نيە.

يعاني العالم من شحة الماء العَذْب.

جيهان بەدەست کەميی ئاوی شيرينەوە دەناڵێنێت.

[2553] هەروەها بە (مسجونون)يش کۆدەکرێتەوە.

من رأى فى المنام كَأَنَّهُ يتخطى الْحَيَّات وَلَا تضره فَإِنَّهُ يَأْمَن اعدائَه وَإِن كَانَ مسجونا خرج من السجْن.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بينی بازدەدات بەسەر مارداو مارەکان زيانی پێناگەيەنن، ئەوە سەلامەت دەبێت لەدەست دوژمنەکانی، خۆ ئەگەر خەوبين زيندانی بوو، ئەوە ئازاددەبێت.

المسجون بريء حتى تثبتَ إدانته.

زيندانی بێتاوانە تا ئەو کاتەی تاوانباريی دەسەلمێنرێت.

المسجون يعيش داخل الجدران، لكن أحلامه تطير في السماء.

**1067.** (مَكْلوم)و (كَليم)، (جَريح) بريندار[2554]

(مَجْروح)يش هەروا[2555]، (لَهْجَة) شێوەزار[2556]

**1068.** (خَلِيج) کەنداوە[2557]، (نَهْر) واتە روبار[2558]

---

زیندانی لەناو چوارچێوەی دیواردا دەژی، بەڵام خەونەکانی بە ئاسماندا دەفڕن.

لیس كل مسجون مذنباً، ولیس كل حر طلیقاً بریئاً.

هەموو زیندانییەك تاوانبار نیەو هەموو ئازادێكیش بێتاوان نیە.

[2554]هەرسێکیان بەمانای بریندار دێن.

بكى الشابّ المكلوم.

جمع كلیم: كَلْمى

جمع جریح جریحون وجَرْحى، مؤ جَریحة وجَریح، جمع مؤ جریحات وجرائحُ وجَرْحى

أخذوا الكلیم إلى المستشفى.

بریندارەکەیان برد بۆ نەخۆشخانە.

بلغ عدد جرحى الانتفاضة أكثر من ثلاثة آلاف جریح.

ژمارەی بریندارانی راپەڕینەکە گەیشتە سێ هەزار.

جَرْحى الإنتفاضة یعانون من الإهمال.

بریندارانی راپەڕین بەدەست پێشتگوێخستنەوە دەناڵێنن.

[2555]واتە ئەم وشەیەش هەر بەمانای بریندار دێت.

مات المجروح بسبب جرحه.

بریندارەکە بەهۆی برینەکەیەوە گیانی لەدەستدا.

[2556] جمع لَهَجات ولَهْجَات

هل تجید اللَهْجَة المصریَّة؟

ئایا شێوەزاری میسری بە باشی دەزانیت؟

[2557] جمع خُلُج وخُلْجان

دول الخلیج العربيّ غنیّة في النفط.

وڵاتانی کەنداوی عەرەبی لەنەوتدا دەوڵەمەندن.

[2558] جمع أنهار وأنهُر ونُهُر.

نهر النیل یقع في مصر.

روباری نیل دەکەوێتە میسرەوە.

ما هو ثاني أطول نهر في العالم؟

دووەم درێژترین روبار لەجیهاندا ناوی چیە؟ (ئەمازۆن، 6400 كم)

(شِرِّير) خراپەکار، جەمعەکەی (أشرار)[2559]

**[1069.]** (جَنوبًا) چیە؟ (بەرەو باشور)ە[2560]

(نَمِر) پڵنگە، کۆکەی (نُمور)ە[2561]

**[1070.]** (أَنامَ) خەواند[2562]، (نامَ) واتە خەوت[2563]

---

[2559] هەروەها بە (أشِرّاء)یش کۆدەکرێتەوە.

حب الشرير أخطر من بغضه.

خۆشەویستیی خراپەکار لەڕقەکەی خراپترە.

الشرير هو بطل في قصته الخاصة فقط.

خراپەکار تەنها لەچیرۆکی تایبەتی خۆیدا پاڵەوانە.

الشرير يظهر عندما يغيب العدل.

خراپەکار ئەوکاتە دەردەکەوێت کە دادوەری ونەدەبێت.

ليس كل شرير يبدو شريراً.

هەموو خراپەکارێك خراپەکار دیار نیە.

الشرير لا يولد شريراً، بل تُصنعه الظروف.

خراپەکار بە خراپەکاری لەدایك نابێت، بەڵکو بارودۆخ دەیکاتە خراپەکار.

[2560] لا تذهب جَنوبًا.

بەرەو باشور مەڕۆ.

2561 هەروەها بە (أنْمُر)و (نمَار)و (نِمَارة)و (نُمْر)و (نُمورة)ش کۆدەکرێتەوە.

مؤ: نَمِرة. جمع مؤ: نَمِر

هل تستطيع مواجهة النمر؟

دەتوانیت روبەڕوی پڵنگ ببیتەوە؟

[2562]أنامَ يُنيم، أَنِمْ، إنامةً، فهو مُنيم، والمفعول مُنَام.

الأم أنامت طفلها.

دایکەکە مناڵەکەی خەواند.

[2563] نامَ ينام، نَمْ، نَوْمًا ومَنامًا، فهو نَائِم.

نام الطفل بسهولة.

منداڵەکە بە ئاسانی خەوت.

نامَ مبكرًا ليحلم بالنجاح، لكنه استيقظ ليجد أن النجاح يحتاج إلى عمل لا إلى نوم.

زوو خەوت بۆ ئەوەی خەون بە سەرکەوتنەوە ببینێت، بەڵام کاتێك خەبەریبووەوە، بۆیدەرکەوت سەرکەوتن پێویستی بە کارە نەك خەوتن.

(كَهْف) لەگەڵ (غار) هەردوكیان ئەشكەوت[2564]

**[1071.](#)** (جَبَل) واتە شاخ، جەمعەكەی (أَجْبُل)[2565]

(قَتَلَ) واتە كوشت، هینەكەی (يَقتُل)[2566]

**[1072.](#)** (عطسَ) پژمی، (عَطْس) پژمینە[2567]

---

من كثر ما نامَ عن مشاكله، أصبحت هي التي توقظه.

بەهۆی كێشەكانییەوە هێندە خەوت، وایلهێات كە كێشەكان خەبەری بكەنەوە.

من نامَ على الحرير، لا يشعر بجراح الفقراء.

كەسێك لەسەر ئاوریشم بخەوێت، هەست بە برینی هەژاران ناكات.

[2564] هل تستطيع العيش في الكهف؟

دەتوانیت لەئەشكەوتدا بژیت؟

لا تظن أن كل كَهْفٍ مظلم يخفي داخله الوحوش، فقد يكون ملاذًا آمنًا.

وامەزانە هەموو ئەشكەوتێكی تاریك زیندەوەری دڕندەی لەناو خۆیدا حەشاردابێت، بەڵكو ڕەنگە پەناگایەكی ئارام بێت.

الغار يذّكرنا النبي.

ئەشكەوت پێغەمبەرمان بیردەخاتەوە.

[2565] هەروەها بە (أجبال)و (جِبال)یش كۆدەكرێتەوە.

لا أستطيع الصعود الى الجبل.

ناتوانم هەڵگەڕێم بۆ سەر شاخ.

من بَعد الجَبَل ينكشف الوادي.

شیو دوای شاخ دەردەكەوێت.

إذا كنت لا تستطيع أن تصبح جَبَلًا، فكن صخرة تُسند الجبال.

ئەگەر ناتوانیت ببیت بە شاخ، ببە بە بەردێك و پاڵپشتی شاخ بكە.

الجَبَل يصبر طويلاً، لكن عندما ينهار، فإنه يصعب إعادة بنائه.

شاخ زۆر ئارامدەگرێت، بەڵام كاتێك دادەڕمێت، دووبارە بنیاتنانەوەی كارێكی سەختە.

[2566] بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی "هینەكەی" لێرەدا بریتییە لە "رانەبردووەكەی".

قتَلَ يَقتُل، قَتْلاً، فهو قاتِل، والمفعول مَقْتول وقَتيل.

المجرم قتل الرجل بلا ذنب.

تاوانبارەكە پیاوەكەی بەبێ تاوان كوشت.

[2567] رابردوو و چاوگی هەمان كارن.

عطَسَ يَعطِس، عَطْسًا وعُطاسً، فهو عاطِس.

هل تعلم أنه من الصعب أن يعطس الإنسان وهو فاتح عينيه!

(غلّ) لەگەڵ (حِقدْ) هەردوکیان قینە[2568]

**1073.** (أودعَ) چیە؟ واتە خستەناو[2569]

(سَبِیل) ڕێگایە، هەروەها پێناو[2570]

**1074.** (عَقْرَب) دوپشکە، هەروەها میلە[2571]

---

ئایا دەزانیت کە زەحمەتە مرۆڤ لەکاتێکدا چاوەکانی کراوە بن، بپژمێت!

العطاس في المنام يدل على موت المريض.

پژمین لەخەودا ئاماژەیە بۆ مردنی نەخۆش.

العطس أثناء النوم يوقظك.

پژمین لەکاتی خەوتندا خەبەرتدەکاتەوە.

[2568] قین: رقی شاراوە.

الغِلّ والحَسد يأكلان الحسنات.

قین و حەسودی چاکە لەناودەبەن.

الحِقْد يبيد طاقة الإنسان الداخلية.

قین وزەی ناواخنی مرۆڤ لەناودەبات.

[2569] أودع صديقه السِّجْنَ.

هاوڕێکەی خستەناو زیندان.

[2570] جمع أسبل وأسْبلة وسُبْل وسُبُل.

ئەم وشەیە دەتوانێت وەك نێرو مێش بەکاربهێنرێت.

السَبِيل إلى النجاح يبدأ من العمل الجاد.

ڕێگای بەرەو سەرکەوتن لەکاری شێلگیرانەوە دەستپێدەکات.

السَبِيل إلى الحكمة يبدأ بالسؤال. سقراط.

ڕێگای بەرەو دانایی بە پرسیار دەستپێدەکات.

جاهد عمر المختار في سبيل وطنه.

عومەر موختار لەپێناو نیشتمانەکەیدا خەباتیکرد.

[2571] بە مانای دوپشك و میل(ی کاتژمێر)یش دێت.

جمع عقارِبُ، مؤ عَقْربة وعَقْرَباءُ وعَقْرَب، جمع مؤ عقارِبُ.

رؤية احتراق العقارب في المنزل في المنام، يدل على موت أعداء صاحب المنزل.

بینینی سوتانی دوپشك لەماڵدا، ئاماژەیە بۆ مردنی دوژمنەکانی خاوەنماڵەکە.

من رأى في المنام أنه قتل عقربا فَإِنَّهُ يظفر بعدوه.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی دوپشکێکی کوشت، ئەوە بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵدەبێت.

رێبوار ماناکەی (ابنُ السَّبیل)ە[2572]

**1075.** (فارِق) جیاوازی، کۆی (فارقون)ە[2573]

(على سبيلِ المثال) واتە هەر بۆ نمونە[2574]

**1076.** (شَوكة) واتە خار، هەروەها چنگاڵ[2575]

(عاطِل) بێکارە[2576]، (مَشْغول)یش سەرقاڵ[2577]

**1077.** شێر (هَرثَمة)، هەمیش (حَيدر)ە[2578]

---

عقارب السَّاعة ثلاثة.

میلەکانی کاتژمێر سیانن.

[2572] قدمت العائلة المساعدة لابن السَبِيل الذي ضل طريقه.

خێزانەکە یارمەتی پێشکەش بەو رێبوارە کرد کە رێگاکەی ونکردبوو.

[2573] هەروەها بە (فوارق)یش کۆدەکرێتەوە.

جمع فارقون وفوارقُ، مؤ فارِقة، جمع مؤ فارقات وفوارقُ

هناك فارق كبير بين اللونين.

جیاوازییەکی گەورە لەنێوان دوو رەنگەکەدا هەیە.

[2574] هەر بۆ نمونە: بۆ نمونە.

أحب الفواكه كثيرًا، على سبيل المثال: التفاح والرمان.

زۆر حەزم لەمیوەیە، هەر بۆنمونە: سێوو هەنار.

أنا رياضي موهوب، على سبيل المثال: يمكنني الجري... نحو الثلاجة أسرع من أي شخص آخر!

من وەرزشکارێکی بەهرەدارم، هەر بۆ نمونە دەتوانم لەهەموو کەسێکی تر، خێراتر رابکەم بەرەو بەفرگرە!

[2575]جمع شَوْكات وشَوَكات

خار (وشەیەکی فارسییە)= درِك.

شوكة حادة قطعت قدمي اليسرى.

درکێکی تیژ قاچی چەپمی بڕی.

استخدام الشوكة لأكل البِطِّيخ شيء شائع.

بەکارهێنانی چنگاڵ بۆ خواردنی شوتی، شتێکی باوە.

[2576]ولدي الكبير عاطِل، حاول أن تجد له شغلاً محترماً.

کوڕە گەورەکەم بێکارە، هەوڵبدە ئیشێکی بەڕێزی بۆ بدۆزیتەوە.

[2577]أنا الان مشغولٌ بإعداد تقرير عن مساويء القنوات التلفزيونية الترفيهية الكردية.

من ئێستا سەرقاڵم بە ئامادەکردنی راپۆرتێك لەسەر خراپەکانی کەناڵە تەلەفزیۆنییە سەرگەرمییە کوردییەکان.

(هيكلٌ عَظْميّ) ئێسکەپەیکەره[2579]

**1078.** (حَيْد)و (حَيَدان) چاوگی (حادَ)[2580]

(وَغْد) خوێڕییه، کۆکەی (أوغاد)ه[2581]

**1079.** (لِفت) شێلمه[2582]، (فُجْل) مانای تور[2583]

---

[2578] لەزمانی عەرەبیدا زۆر وشه هەیه که مانای شێر دەدات، بەڵام من لەم نیوەبەیتدا تەنها دوانیانم باسکردووه. (لیث)یش به مانای شێر دێت.

هل تخاف من الهَرْثَمَة؟

ئایا لەشێر دەترسیت؟

هاجمه كالحيدر.

وەك شێر پەلاماریدا.

إذا رأيت نُيوب اللَّيث بارزةً

فلا تظنّن أنّ اللَّيث يبتسمُ.

ئەگەر بینیت ددانەکانی شێر دیاربون، پێتوانەبێت که زەردەخەنه دەکات.

[2579] في المتحف، رأينا هيكلًا عظميًا لديناصور ضخم.

لەمۆزەخانەکە ئێسکەپەیکەرێکی گەورەی دەیناسورێکی زەبەلاحمان بینی.

أكبر هيكل عظمي لديناصور تم العثور عليه في الأرجنتين، هو هيكل ديناصور "أرجنتينوسوروس"، ويصل طوله إلى 40 مترًا، مما يجعله أكبر هيكل عظمي تم اكتشافه.

گەورەترین ئێسکەپەیکەری دەیناسور لە ئەرجەنتینه، دۆزراوەتەوە، ئەویش ئێسکەپەیکەری دەیناسوری ئەرجەنتینۆسۆرۆسە که درێژییەکەی دەگاتە 40 مەتر، بەمەش بووەتە گەورەترین ئێسکەپەیکەر کە تائێستا دۆزراوەتەوە.

الهيكل عظمي للحوت الأزرق أطول من ملعب كرة سلة وقد يصل طوله إلى 30 مترًا.

ئێسکەپەیکەری نەهەنگی شین لەیاریگای تۆپی باسکە درێژترەو دەکرێ درێژییەکەی بگاتە 30 مەتر.

[2580] هەردوکیان چاوگی (حادَ)ن.

(حادَ): لایدا

حادَ عن/ حادَ من يَحِيد، حِدْ، حَيْدًا وحَيدانًا، فهو حائِد، والمفعول محيد عنه

له سياسة واضحة لا يحيد عنها.

سیاسەتێکی رونی هەیه که لێی لانادات.

[2581] إنه وَغْد يستغلّ هەژاریی الآخرين.

بەڕاستی خوێڕییه. هەژاریی خەڵك دەقۆزێتەوە.

[2582] يساعد اللفت على إنتاج كرات الدم البيضاء، ما يساهم في تقوية الجهاز المناعي، والوقاية من الإصابة بنزلات البرد والإنفلونزا.

(أمعاء غليظة) ريخۆڵە ئەستور[2584]

**[1080.](#)** (ضَغطُ الدّم) چیە؟ فشاری خوێنە[2585]

(قَسَم) و (حَلْف) هەردوکیان سوێنە[2586]

---

شێلم یارمەتی بەرهەمهێنانی خڕۆکە سپییەکانی خوێن دەدات، بەهۆی ئەمەشەوە بەشداریدەکات لەبەهێزکردنی کۆئەندامی بەرگری و خۆپاراستن لەهەڵامەت و ئینفلۆنزا.

[2583] هەروەها بە (فُجُل)یش دەنوسرێت. تاکەکەی (فُجْلَة)یە.

تُساعد أوراق الفجل في خفض نسبة الكولسترول الضار ورفع نسبة الجيد في الجسم.

گەڵای تور یارمەتیی دابەزاندنی رێژەی کۆلیسترۆڵی زیانبەخش و بەرزکردنەوەی رێژەی کۆلیسترۆڵی سودبەخش دەدات لەجەستەدا.

[2584] بێگومان مەخسەوی شەریفم لە (ریخۆڵە ئەستور)، (ریخۆڵە ئەستورە)یە، بەڵام بەهۆی زەروراتی شیعرەوە بزوێنەکە بەر جادە کەوتووە!

الأمعاء الغليظة أقصر من الأمعاء الدقيقة.

ریخۆڵە ئەستورە لەڕیخۆڵە باریکە کورتترە.

الأمعاء الغليظة تحتوي على أكثر من 100 تريليون بكتيريا، هذه البكتيريا تلعب دورًا حيويًا في هضم الطعام وتعزيز المناعة.

ریخۆڵە ئەستورە زیاتر لە 100 ترلیۆن بەکتریای تێدایە، ئەم بەکتریایانە رۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لەهەرسکردنی خۆراك و بەهێزکردنی بەرگریی لەشدا. ئەگەر بڕواش بە ژمارەکە ناکەیت، ئەو ئەرزو ئەوە گەز، بیژمێرە!!!

طول الأمعاء الغليظة قصير مقارنة بالأمعاء الدقيقة. على الرغم من دورها المهم، إلا أن طول الأمعاء الغليظة يبلغ حوالي 1.5 متر فقط، مقارنة بالأمعاء الدقيقة التي يبلغ طولها حوالي 6 أمتار.

درێژیی ریخۆڵە ئەستورە بەراورد بە ریخۆڵە باریکە، کەمە. هەرچەندە رۆڵێکی گرنگی هەیە، بەڵام درێژیی ریخۆڵە ئەستورە تەنها دەگاتە نزیکەی مەترو نیوێك، لەبەرامبەردا درێژیی ریخۆڵە باریکە دەگاتە نزیکەی شەش مەتر.

أمراض الأمعاء الغليظة قد تؤدي إلى تغييرات في المزاج. هناك ارتباط بين صحة الأمعاء الغليظة والدماغ عبر ما يُعرف بمحور الأمعاء والدماغ، مما يعني أن مشكلات الأمعاء قد تؤثر على الصحة النفسية.

نەخۆشییەکانی ریخۆڵە ئەستورە دەکرێ گۆڕانکاری لەمەزاجدا دروستبکەن. پەیوەندی لەنێوان تەندروستیی ریخۆڵە ئەستورەو دەماخدا هەیە، ئەویش لەڕێگەی ئەوەی بە "تەوەری ریخۆڵەو دەماخ" ناسراوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە کێشەکانی ریخۆڵە رەنگە کاریگەری لەسەر تەندروستیی دەرون دروستبکەن.

الأمعاء الغليظة تعمل ببطء مقارنة بالدقيقة، الطعام قد يبقى في الأمعاء الغليظة لمدة تصل إلى 24 ساعة، بينما ينتقل عبر الأمعاء الدقيقة في أقل من 6 ساعات.

ریخۆڵە ئەستورە بەراورد بە ریخۆڵە باریکە بە خاوی ئیشدەکات. خۆراك دەکرێ بۆ ماوەی نزیکەی 24 سەعات لەڕیخۆڵە ئەستورەدا بمێنێتەوە، بەڵام لەماوەی کەمتر لە شەش سەعاتدا خۆراك لەڕیخۆڵە باریکەوە دەگوازرێتەوە.

[2585] إرتفاع ضغط الدم قد يؤدي الى الجلطة القلبية.

بەرزیی فشاری خوێن دەکرێ ببێتەهۆی جەڵتەی دڵ.

**.1081** (عُرْوة) پەیوەندی، کۆکەی (عُری)یە[2587]

(صاهَرَ) مانای "بوو بە زاوای"ە[2588]

**.1082** (أوجدَ) دروستکرد، هینی (إیجاد)ە[2589]

(حَفید) کوڕەزا، کۆکەی (أحفاد)ە[2590]

**.1083** (كتَبَ) نوسی[2591]، (كِتابة) نوسین[2592]

---

[2586] هەروەها (یمین)یش بەمانای سوێن دێت. بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی سوێن، سوێندە، بەڵام لەبەر قافیەی بەیتەکە، دالەکە بەر جادە کەوتووە!

هو أتهم بأداء اليمين الكاذبة.

ئەو بە خواردنی سوێندی درۆ، تۆمەتبارکرا.

في الحقيقة لا أصدق قسمك.

لەڕاستیدا بڕوام بە سوێندەکەت نیە.

حلفك مريب.

سوێندەکەت گوماناوییە.

[2587] هەروەها بە (عُرُوات وعُرْوات)یش کۆدەکرێتەوە.

[2588] صاهرَ القبيلة بعد الحرب.

پاش جەنگەکە بوو بە زاوای هۆزەکە.

[2589] هینی (إیجاد)ە واتە چاوگەکەی (إیجاد)ە.

مەخسەوی شەریفم لەوشەی "دروستکرد" لێرەدا دروستکردنێکە کە بێوێنە بێت: هێنایەبون.

أوجدَ يُوجد، إيجادًا، فهو مُوجِد، والمفعول مُوجَد.

أوجد اللهُ الكونَ.

خودا گەردونی دروستکرد (هێنایەبون).

[2590] هو حفيدي الأصغر.

ئەو بچوکترین کوڕەزامە.

[2591] كتَبَ يَكتُب، كِتابةً وكِتَابًا وكَتْبًا، فهو كاتب، والمفعول مَكْتوب.

المجد لا يكون فقط في قراءة كتاب سطّره أجدادك. المجد الحقيقي أن تكتب سطراً في كتاب سيقرأه أحفادك.

سەربەرزی تەنها لەخوێندەوەی کتێبێکدا نیە کە باوباپیرت نوسیویانە. سەربەرزیی ڕاستەقینە بریتییە لەوەی دێڕێك لەکتێبێکدا بنوسیت کە نەوەکانت لەداهاتودا بیخوێننەوە.

[2592] قلة من الكتاب على استعداد للاعتراف بأن الكتابة هي سيرة ذاتية.

کەمێك لەنوسەران ئامادەیی ئەوەیان تێدایە کە دان بەوەدا بنێن نوسین ژیاننامەی خودە.

(صَلْم) بەمانای لەبنابڕین[2593]

**1084.** (دَلِيل) بەڵگەیە، هەروەها رێبەر[2594]

وشەی (ظِلّ)و (فَيْء) هەردوکیان سێبەر[2595]

**1085.** (شاهِد) شایەتحاڵ، هەمیش بەڵگەیە[2596]

(شبهُ جزيرة) نیمچەدورگەیە[2597]

**1086.** (وجَدَ) دۆزییەوە، هینی (وجِدَة)[2598]

---

الكتابة فن وعلم.

نوسین هونەرو زانستە.

[2593] چاوگی (صلَمَ)یە.

صلَم تنظيم داعش أذنَه.

رێکخراوی داعش گوێی لەبنابڕی.

[2594] جمع أدِلاَّءُ (للعاقل) وأدِلّة ودلائلُ

دليلك غير واضح.

بەڵگەکەت روون نیە.

هل لديك دليل الفنادق؟

ئایا رێبەری میوانخانەکانت لایە؟

[2595] ظلُّ الشجرة كثير.

سێبەری درەختەکە زۆرە.

جلس في فَيْء الشجرة.

لەسێبەری درەختەکەدا دانیشت.

[2596] روى الشاهد تفاصيل الجريمة للحاكم.

شایەتحاڵەکە وردەکاریی تاوانەکەی بۆ دادوەر گێڕایەوە.

ما شاهدك على ما تقول؟

بەڵگەت چیە لەسەر ئەوەی دەیڵێیت؟

[2597] قطر شبه جزيرة صغيرة.

قەتەر نیمچەدورگەیەکی بچوکە.

[2598] مەبەستم لەوشەی (هینی) بریتییە لە (چاوگەکەی بریتییە لە). هەروەها بە (وَجْد)و (وِجدان)یش دەبێتە چاوگ.

وجَدَ يجِد، جِدْ، وَجْدًا ووِجدانًا وجِدَةً، فهو واجِد، والمفعول مَوْجود.

وجد حلًّاً لمشكلته.

(زاد) توێشووە، کۆکەی (أزودة)[2599]

**1087.** (كنَّ) شاردەوە، (مَكْنون) شاراوە[2600]

(طَلْقُ اللِّسان)ە زمانپاراوە[2601]

**1088.** بنچینە (أُسّ)ە، هەمیش (أساس)ە[2602]

(قَوْس) "کەوانە"، کۆکەی (أقواس)ە[2603]

**1089.** (حِبْر) مەرەکەب، کۆکەی (أحبار)ە[2604]

(عابرُ السَّبيل) مانای ڕێبوارە[2605]

---

چارەسەرێکی بۆ کێشەکەی دۆزییەوە.

[2599] هەروەها بە (أزواد)یش کۆدەکرێتەوە.

زادُه دقيق وتمر.

توێشووەکەی ئاردو خورمایە.

[2600] داڕشتەی ڕابردوو و کراو (مفعول)ی هەمان کارن.

كنَّ كَنَنْتُ، يَكُنّ، اكْنُنْ/ كُنّ، كَنًّا، فهو كانّ، والمفعول مَكْنون.

كنَّ نقوده في مكان منيع.

پارەکانی لەشوێنێکی پتەودا شاردەوە.

[2601] كان الخطيب طلق اللسان.

وتارخوێنەکە زمانپاراو بوو.

[2602] أُسّ المشكلة والدة الفتاة.

بنچینەی کێشەکە دایکی کچەکەیە.

الخبر لا أساس له من الصِّحَّة.

هەواڵەکە هیچ بنچینەیەکی ڕاستی نیە.

[2603] وضع الكلمة بين قوسين.

وشەکەی لەنێوان دوو کەوانە دانا.

[2604] هەروەها بە (حُبُور)یش کۆدەکرێتەوە.

نفد الحِبْر من القلم، فلم أستطع إكمال الكتابة.

مەرەکەبی قەڵەمەکە تەواوبوو، بۆیە نەمتوانی نوسینەکە تەواوبکەم.

[2605] قدّم الرجل الماء والطعام إلى عابر السبيل بكل كرم.

پیاوەکە بەوپەڕی بەخشندەییەوە ئاوو خواردنی پێشکەش بە ڕێبوارەکە کرد.

**.1090** (حَشِيش) حەشیشە[2606]، (حَشَّاش) مودمینی[2607]

(بُعْدُ النَّظَر)ە مانای دوربینی[2608]

**.1091** (خَشَب) واتە دار، کۆدوجای (خُشْبَان)[2609]

(غمَدَ) واتە خستەناو کێلان[2610]

**.1092** (خَيْط) دورینە، چاوگی (خاطَ)[2611]

(عَظَمَة) گەورەیی، کۆی (عَظَمات)ە[2612]

---

[2606] جمع الجمع حَشَائِش، مفرد حَشيشة.

حەشیش: جۆرە ماددەیەکی هۆشبەرە.

الحشيش يؤثر على الدماغ وقد يؤدي إلى الإدمان عليه.

حەشیش کاردەکاتە سەر دەماخ و رەنگە ببێتەهۆی ئاڵودەبون لەسەری.

[2607] واتە بە مانای مودمینی حەشیش دێت. مودمینی حەشیش= ئاڵودەبوی حەشیش.

رأيته يترنَّح كالحشَّاش.

بينيم وەك ئاڵودەبوی حەشیش بەملاولادا دەکەوت.

[2608] دوربینی: تێکچونێکی بینینە.

يُعاني أحمد من بُعْد النظر.

ئەحمەد بە دەست دوربینییەوە دەناڵێنێت.

[2609] مەخسەوی شەریفم لەوشەی کۆدوجا بریتییە لەجەمعی جەمع. بێگومان بە (أخشاب)و (خُشُب)و (خُشْب)یش دەکرێتە جەمعی جەمع.

[2610] غمَد السَّيفَ بعد انتهاء المعركة.

پاش کۆتاییهاتنی جەنگەکە، شمشێرەکەی خستەناو کێلان.

[2611] چاوگ و رابردوی هەمان کارن. بێگومان(خاط) بە (خِياطة)ش دەبێتە چاوگ.

خاطَ يَخيط، خِطْ، خَيْطًا وخِياطةً، فهو خائط، والمفعول مَخيط.

بێگومان وشەی (خَيْط) بەمانای دەزووش دێت.

خَيْط الثوب عمل متعب.

دروینی جلوبەرگ کارێکی ماندوکەرە.

في القميص خيط حريري جميل.

کراسەکە دەزویەکی ئاوریشمیی جوانی تێدایە.

خاط القميص خلال ساعة واحدة فقط.

کراسەکەی لەماوەی تەنها سەعاتێکدا دوری.

**1093.** (ابتلَّ)، (ندِيَ) هەردوكيان تەڕبوو[2613]

(عِرْبِد)واتە مار[2614]، (عِربيد) بێئابڕوو[2615]

**1094.** (خشِبَ عيشُه) ژینی سەختبوو[2616]

(تخشَّبَ)یە "وەکو دار رەقبوو"[2617]

**1095.** (زلزلَ) چیە؟ لەراندەوە[2618]

(حبَرَ) دڵخۆشکرد، هەم رازاندەوە[2619]

**1096.** (عقَرَ) چیە؟ گازیلێگرت[2620]

---

2612 العظمة لله فقط.

گەورەیی تەنها بۆ خودایە.

2613 ابتلّت الأرضُ بماءِ المطر.

زەوی بە ئاوی باران تەڕبوو.

ندِي الثّوبُ بالمطر.

جلوبەرگەکە بە باران تەڕبوو.

2614 لا تخف من العِرْبِد.

لە مار مەترسە.

وَجَدْتُ عِرْبِيداً فِي الشَّارِع.

بێئابڕویەکم لەشەقامەکەدا بینی.

2615 جمع عَرابِدة.

2616 ژینی سەختبوو= ژیانی سەختبوو. خۆی لەخۆیدا رستەیەکی تەواوە، بۆیە پێویست بە رستەی تر ناکات.

2617 وەکو دار رەقبوو= رەقبوو وەك دار.

تخشَّبَ الرجل من البرد.

پیاوەکە لەسەرمادا وەك دار رەقبوو.

2618 زلزلَ الزلزال البيت.

زەمینلەرزەکە ماڵەکەی لەراندەوە.

2619 حبَرَ الوالد طفله.

باوکەکە منداڵەکەی دڵخۆشکرد.

حبَرَ المؤلف كتابه بغلاف ذهبي.

نوسەرەکە کتێبەکەی بە بەرگێکی ئاڵتونی رازاندەوە.

2620 عقَرَ يَعقِر ، عَقْرًا ، فهو عاقِر ، والمفعول معقور.

(انْكَفَّ) ماناى دەستى لێهەڵگرت[2621]

**.1097** (حبَّرَ) نوسى، هينى (تحبير)ە[2622]

(غِمْد) بەماناى كێلان (ى شير)ە[2623]

**.1098** (حبَّر) پڕكرد، بەس لەمەرەكەب[2624]

بە دار داپۆشى، ماناكەى (خشَّبْ)[2625]

---

عقره الكلبُ.

سەگەكە گازيلێگرت.

[2621] انكفَّ عن التدخين.

دەستى لەجگەرەكێشان هەڵگرت.

[2622] مەخسەوى شەريفم لە وشەى (هينى) لێرەدا بريتييە لە (چاوگەكەى).

أخذ الكُتَّابُ يحبِّرون المقالات دفاعًا عن قضيّة فلسطين.

نوسەران دەستيانكرد بە نوسينى وتار بۆ بەرگريكردن لەدۆزى فەلەستين.

[2623] كێلانى شير= كێلانى شمشێر.

لا يسعُ السيفين غِمدٌ.

دوو شير لەيەك كێلاندا جێى نابێتەوە.

السيف يظلّ حادًا حتى وإن كان في غمده.

شمشێر هەر تيژە، تەنانەت لەناو كێلانەكەشيدا.

ليس كل من حمل غمدًا يملك سيفًا.

هەركەسێك كێلانى هەڵگرت، ماناى ئەوە نيە شمشێرى هەيە.

السيف في غِمْده لا يهاب أحدًا، ولكن إذا سُلَّ اهتزّت له الرقاب.

شمشێر لەكێلاندا كەس ناترسێنێت، بەڵام ئەگەر هەڵكێشرا، گەردن لەبەردەميدا دەلەرزێت.

اجعل نفسك كسيفٍ في غِمده، جاهزًا وقت الحاجة.

وەك شمێرى ناو كێلان بە، لەكاتى پێويستدا ئامادەبە.

من يظن أن غِمْد السيف يقتل، فهو واهم.

ئەگەر كەسێك پێيوابێت كێلانى شمشێر دەكوژێت، ئەوە لەخەياڵدا دەژى.

[2624] بە ماناى (پڕكرد لەمەرەكەب) دێت. پڕكرد لەمەرەكەب= لەمەرەكەب پڕكرد.

حبَّر القلم.

پێنوسەكەى پڕكرد لەمەرەكەب.

[2625] بە دار داپۆشى= داپۆشى بە دار= دارپۆشيكرد= ڕووپۆشيكرد بە دار= ڕووپۆشيكرد بە تەختە.

1099. (عاشَرَ) چیە؟ هاوڕێیەتیکرد[2626]

(جعجعَ) مانای ژاوەژاویکرد[2627]

1100. (تَلقیح) کوتانە، (لقَّحَ) کوتا[2628]

(احترقَ) یە بەمانای سوتا[2629]

---

خَشَّب النَّجَّارُ القاعةَ.

دارتاشەکە هۆڵەکەی روپۆشکرد بە تەختە.

2626 قلْ لي مَن تعاشر أقُلْ لك مَن أنتَ.

پێم بڵێ هاوڕێیەتی کێ دەکەیت، پێت دەڵێم تۆ کێیت.

سأل عمر بن الخطاب رضي الله عنه: من منكم يعرف فلان؟ فاجابه أحدهم وقال: انا، قال له عمر بن الخطاب: هل عاشرته في سفر؟ قال له:لا. قال له: هل عاشرته في تجارة؟ قال له: لا. قال له: اذن انت جار له. قال له: لا. قال له: اذن رايته في المسجد يقوم ويرفع رأسه. قال له: نعم قال له: اذن انت لاتعرفه.

عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ رازیبێت) پرسیاریکرد: کێ لەئێوە فلانەکەس دەناسێت؟ یەکێك وەڵامیدایەوەو وتی: من.

عومەر پێیوت: ئایا هاوڕێیەتیت کردووە لەگەشتدا؟ پیاوەکە وتی: نەخێر.

عومەر: لەبازرگانیدا هاوڕێیەتیت کردووە؟

پیاوەکە: نەخێر.

عومەر: کەواتە تۆ دراوسێی ئەویت.

پیاو: نەخێر.

عومەر: کەواتە لەمزگەوتدا بینیوتە هەڵدەسێت و سەری بەرزدەکاتەوە.

پیاوەکە: بەڵێ

عومەر: کەواتە نایناسیت!

2627 جعجعَ يجعجع، جعجعةً، فهو مجعجِع.

يجعجع ولايفعل شيئًا.

ژاوەژاودەکات، بەڵام هیچ کارێك ناکات. واتە تەنها قسەیە.

2628 چاوگ و دارشتەی رابردوی هەمان کارن.

لقَّحَ يلقِّح، تلقيحًا، فهو مُلقِّح، والمفعول مُلقَّح.

هل لقَّحت نفسك ضد وباء كورونا؟

ئایا خۆت کوتا لەدژی پەتای کۆرۆنا؟

التلقيح ضد الأمراض الخطيرة واجب وطني.

کوتان لەدژی نەخۆشییە مەترسیدارەدان ئەرکێکی نیشتمانییە.

2629 احترق مخزن للأخشاب.

**1101.** (قطَّبَ) چیە؟ رویگرژکرد[2630]

(أوزعَ) حەتمەن، مانای دابەشکرد[2631]

**1102.** (حِنْث) واتە گوناهـ، جەمعەکەی (أحناث)[2632]

مس بەمانای (نَحَاس)و (نُحَاس)[2633]

**1103.** (عُرْس) ئاهەنگە، جەمعەکەی (أعراس)[2634]

(نَحّاس) سانیعە، هی دەفری (نَحَاس)[2635]

**1104.** (قُطْب) جەمسەرە، هەروەها تەوەر[2636]

---

کۆگایەکی تەختە سوتا.

2630 رویگرژکرد: دەموچاوی دا بەیەکدا.

لا تقطّب تجاه أبيك.

بەرامبەر باوکت رووگرژ مەکە.

2631 أوزع الثَّرِيُّ مالَه قبل وفاته.

دەوڵەمەندەکە پێش مردنی، سامانەکەی دابەشکرد.

2632 {وكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنْثِ الْعَظِيمِ}.

هەروەها سوربون لەسەر گوناهە گەورەکە.

2633 هەروەها بە سپێڵی (نِحَاس)یش دەنوسرێت.

جمع نُحُس.

يُستعمل النحاس في العديد من الصناعات الكهربيّة.

مس لەچەندین پیشەسازیی کارەباییدا بەکاردەهێنرێت.

2634 بە دیاریکراوی بەمانای ئاهەنگی هاوسەرگیری دێت.

قتل ليلة عُرسِه.

شەوی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەی، کوژرا.

2635 بە مانای سانیع (دروستکەر)ی دەفری دروستکراو لە نەحاس (مس) دێت: دروستکەری دەفری مسین.

كان النّحّاس ماهراً جداً.

دروستکەری دەفری مسینەکە زۆر کارامە بوو.

2636 جمع أقْطاب وقُطُوب.

القطب الشمالي مغطى بالجليد طوال العام.

جەمسەری باکور بە درێژایی ساڵ بە سەهۆڵ داپۆشراوە.

(كُورة) ناوچەیە، جەمعەکەی (كُوَر)[2637]

**1105.** (طائِرة) چیە؟ واتە فڕۆکە[2638]

(ربَضَ) مانای "هاتەسەرچۆك"ە[2639]

**1106.** (مُدَّة) ماوەیە، کۆکەی (مِدَد)ە[2640]

"دۆستایەتی"یە مانای (مَوَدَّة)[2641]

**1107.** (حبَلَ) مانای بە گوریس بەستۆ[2642]

---

تشرق الشمس في القطب الشمالي لمدة 6 أشهر متتالية، من 20 مارس/آذار إلى 23 سيبتمبر/أيلول.

لەجەمسەری باکوری گۆی زەوی شەش مانگ لەسەر یەك خۆر هەڵدێت، لە 20ی ئازار بۆ 23ی ئەیلول.

تدور الأرض حول قُطْبها.

زەوی بە دەوری تەوەری خۆیدا دەسوڕێتەوە.

[2637] بە (كُورات)یش کۆدەکرێتەوە. بەدیاریکراوی بەمانای ناوچەی دێهاتی و گوندنشین دێت.

ولد الشاعر في كورة نائية.

شاعیر لەناوچەیەکی گوندنشینی دوردەست لەدایکبووە.

[2638] جمع طائرات

سافر بالطائرة.

بە فڕۆکە گەشتیکرد.

[2639] ربَضَ يَربِض، رَبْضًا ورُبوضًا، فهو رابض.

ربض الكلبُ أمام صاحبه.

سەگەکە لەبەردەم خاوەنەکەیدا هاتەسەرچۆك.

[2640] هەروەها (فَتْرة)ش بەمانای ماوە دێت.

استمرّ الاجتماعُ فترة قصيرة.

کۆبونەوەکە ماوەیەکی کەم بەردەوامبوو.

سافر لمدّة شهر.

بۆ ماوەی مانگێك گەشتیکرد.

[2641] يجب أن تسود المَوَدَّة بين الأصدقاء.

پێویستە لەناو هاوڕێیاندا دۆستایەتی سەروەر بێت.

[2642] حبَلَ يَحبُل، حَبْلاً، فهو حابِل، والمفعول مَحْبول.

بە گوریس بەستۆ= بە گوریس بەستەوە.

حبَل الدّابَّةَ ثمّ صلّى.

(أكواز) گۆزەیە، بەڵام تاك نا كۆ[2643]

**1108.** (ثَغْر)و (ثَغْرة) هەردوكیان كەلێن[2644]

(مَحَلّ)و (مَحِلّ) دێن بەمانای شوێن[2645]

**1109.** (ظَفَّرَ) سەرخست، چاوگەكەی (تظفير)[2646]

(مِزْمار) شمشاڵە، كۆكەی (مزامير)[2647]

**1110.** (لَجَاج) چیە؟ وڕكگرتنە[2648]

(وَقْعة) مانای جەنگ، هەمیش كەوتنە[2649]

---

وڵاخەكەی بەستەوە، پاشان نوێژیكرد.

[2643] تاكەكەی (كُوز)ە. هەروەها بە (كیزان)یش كۆدەكرێتەوە.

انكسر الكُوزُ الزجاجيّ.

گۆزە شوشەییەكە شكا.

[2644] يحرس الجنود كل ثَغْرٍ من حدود الوطن.

سەربازەكان هەموو كەلێنێكی سنوری نیشتمان دەپارێزن.

سدّ الثَّغرة بحجرٍ صغير.

كەلێنەكەی بە بەردێكی بچوك گرت.

[2645] قتل في مَحَلّ عَمله.

لەشوێنی كارەكەیدا كوژرا.

أين مَحِلّ إقامتك؟

شوێنی نیشتەجێبونت لەكوێیە؟

[2646] ظفَّره الله على عدوه.

خودا بەسەر دوژمنەكەیدا سەریخست.

[2647] سمعت صوت المِزْمار في الحفل.

لەئاهەنگەكەدا گوێم لەدەنگی شمشاڵ بوو.

[2648] چاوگی (لَجَّ)یە.

لجَّ الطفل في اللعبة.

منداڵەكە وڕكیگرت بۆ یارییەكە. واتە سوربوو لەسەری و وازی لێنەهێنا.

2649 جمع وَقَعات.

تسبَّبت وَقْعته في كسر في جسمه.

**[1111.](#)** (حلَقَ) تاشی، هینی (حِلاقة)[2650]

(طَلِق) ئازادە، کۆکەی (طِلاق)ە[2651]

**[1112.](#)** (اِبتَلَّ) تەڕبوو[2652]، (مُبتَلّ) مانای تەڕ[2653]

(عاقِر) نەزۆکە، جەمعەکەی (عُقَّر)[2654]

**[1113.](#)** (کسَبَ) پەیداکرد، هینی (یکسبُ)[2655]

(تقطَّبَ)یە مانای گرژبوو[2656]

---

کەوتنەکەی شکانێکی لێکەوتەوە لەجەستەیدا.

من سمع صَوت البوق في المنام فإنَّهُ يدعو إلَى وقْعَة.

ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی گوێی لەدەنگی زوڕنایە، ئەوە بانگەشەدەکات بۆ شەڕ.

2650 بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی "هینی" لێرەدا بریتییە لە "چاوگەکەی". هەروەها بە (حلق)یش دەبێتەچاوگ.

حلَقَ يَحلِق، حَلْقًا وحِلاقةً، فهو حالق، والمفعول مَحْلوق وحليق.

حلَق شاربَه قبل الخروج.

پێش دەرچونەکە، سمێڵی تاشی.

2651 بالأمس كان أسيراً ولكنّه اليوم طَلِق بين أهله.

دوێنێ دیل بوو، بەڵام ئەمڕۆ ئازادە لەناو کەسوکاریدا.

2652 ابتلَّ يبتلّ، ابتَلِلْ/ ابتَلَّ، ابْتِلالاً، فهو مُبتَلّ

ابتلَّ الثَّوبُ.

جلوبەرگەکە تەڕبوو.

2653 لا تلبس الثوب المُبتَلّ.

جلوبەرگی تەڕ لەبەرمەکە.

2654 هەروەها بە (عواقِر)یش کۆدەکرێتەوە.

لم تُنجب المرأة لأنها كانت عاقِرًا.

ژنەکە منداڵی نەبوو، لەبەرئەوەی نەزۆك بوو.

2655 بێگومان مەخسەوی شەریفم لەوشەی "هینی" لێرەدا بریتییە لە (رانەبردووەکەی).

كسَبَ يَكسِب، كَسْبًا، فهو كاسِب، والمفعول مَكْسوب.

كسَب رزقَه من خلال شركة عالمية.

ڕۆزییەکەی لەڕێگای کۆمپانیایەکی جیهانییەوە پەیداکرد.

2656 تقطَّبَ وجهه بعد رؤية عدوه القديم.

پاش بینینی دوژمنە کۆنەکەی، دەموچاوی گرژبوو.

**1114.** (كسَبَ) ئەنجامدا، هەم بەدەستهێنا[2657]

(استخرجَ)یە مانای دەرهێنا[2658]

**1115.** (كَسْب) داهات و چاوگی (كسَبْ)[2659]

داواكارییە ماناكەی (طَلَبْ)[2660]

---

[2657] كسَبَ يَكسِب، كَسْبًا، فهو كاسِب، والمفعول مَكْسوب.

كسَب إثمًا عظيماً.

گوناهێكی گەورەی ئەنجامدا.

كسب حبّ الفتاة بعد معاناة طويلة.

پاش كۆژانێكی درێژخایەن، خۆشەویستیی كچەكەی بەدەستهێنا،

[2658] استخرجوا الماءَ من البئر.

ئاوی لەبیرەكە دەرهێنا.

[2659] واتە ئەم وشەیە بەمانای داهات دێت، هەروەها چاوگی كاری (كسَبَ)شە واتە بەمانای (بەدەستهێنان)یش دێت.

كان كسبُه وفيرًا هذا العام.

داهاتی ئەمساڵی زۆر بوو.

كسب عطف الفقراء سهل.

بەدەستهێنانی سۆزی هەژاران ئاسانە.

[2660] جمع طلبات

قدَّم طلبًا للحصول على وظيفة.

داواكارییەكی پێشكەشكرد بۆ بەدەستهێنانی كارێك.

## گرنگترین سەرچاوەکان


1. لسان العرب
2. مختار الصحاح
3. القاموس المحيط
4. المعجم الوسيط
5. www.almaany.com

## بۆ سودمەندبونی زیاتر لەبابەتە زمانەوانی و مەعریفەوانییەکانم

**ئینستاگرام**

www.instagram.com/wali20242024
https://www.instagram.com/learn_english2424

ئێکس

https://x.com/learnenglish223

تیکتۆک

https://www.tiktok.com/@wali20242024
https://www.tiktok.com/@learn_enandar

تێلیگرام:

https://t.me/englishandkurdish

سناپچات

https://www.snapchat.com/add/waliali111
https://www.snapchat.com/add/learn_english88

فەیسبوك/ ئەکاونت

https://facebook.com/wali444
https://www.facebook.com/wali567

فەیسبوك/ پەیج

https://www.facebook.com/wali899/
https://www.facebook.com/waliali22

فەیسبوك/ گروپ

https://facebook.com/groups/117864533531160

یوتیوب

https://www.youtube.com/@wali999

ڤایبەرو وەتسئەپ:
07701393984
07511225717

## والی عەلی



- کتێبنوس و وەرگێڕی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردی و رۆژنامەنوس و رەخنەگری زمانەوانی و ریکلامسازو بلۆگەر.
- ساڵی چاپ (لەدایکبون): 1978
- شوێنی لەدایکبون و دانیشتن و خەوتنیش: سلێمانی
- نوسەری کتێبی "هیلاری کلینتۆن.. چیرۆکی گەیشتن بە لوتکەی شاژنێکی سەرکردە".
- وەرگێڕی کتێبی "کۆندی.. چیرۆکی سەرکەوتنی کۆندۆلیزا رایس".
- وەرگێڕی کتێبی "رەوشت"ی د.عەلی وەردی.
- نوسەری کتێبی ئینگلیزینامەی والی کە تایبەتە بە فێربونی ئینگلیزی بە شێوەیەکی جیاوازو ناباوو لەڕێگەی شیعرو رستەی دوزمانەوە.
- نوسەری کتێبی عەرەبینامەی والی کە تایبەتە بە فێربونی عەرەبی بە شێوەیەکی جیاوازو ناباوو لەڕێگەی شیعرو رستەی دوزمانەوە.
- وەرگێڕانی هەزاران ماددەی رۆژنامەوانی لەئینگلیزی و عەرەبییەوە بۆ کوردی.
- ئیمەیڵ: walikurdistan@gmail.com

ڤایبەرو وەتسئەپ:

**07701393984**

**07511225717**

**ئەم چاپی 115هەمە فرییەو لەبەر خودای گەورەو لەپێناو سودمەندبونی تۆی بەڕێز بڵاوکراوەتەوە، بۆیە**

# تکایە لەدوعای خێر بێبەشم مەکەن

## والی عەلی